پرۆژەی تیشك (٥٩)

# کۆزارا

## توێژینەوەیەکی زانستی یە دەربارەی
## گەردون و ڕۆح و لەشی فیزیایی و مردنی هەریەکەیان

نووسینی

حمە ڕەشید نادر هەورامی

چاپی دووەم

٢٠٠٩

پرۆژەی تیشک


ناوی کتێب: کۆزارا

نووسینی: حمه ڕشید نادر هەورامی

ژمارەی سپاردن: ژمارە (٦٩٣) ساڵی (٢٠٠٤)

نۆرەی چاپ: دووەم

ساڵی چاپ: ٢٠٠٩

نەخشەسازیی بەرگ و ناوەوە: سیف و سرمد

لە بڵاوکراوەکانی: پرۆژەی (تیشک)، ژمارە (٥٩)

ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت:

www.tishkbooks.com

ئیمەیلی پرۆژە:

**info@tishkbooks.com**

tishkbooks@yahoo.com

# دەروازەیەك بۆ كتێبی كۆزارا

ماوەیەك بوو كتێبی كۆزارا نۆبەتی ئەوەی بوو كە لیژنەی لێكۆڵینەوەی تیشك ڕاو سەرنجەكانی خۆی بداتە برای نوسەرو دەستەی بەڕێوەبەری پرۆژەی تیشك تا لەژێر ئەو ڕاو سەرنجانەدا بڕیاری چاپ و پەخشی ئەو كتێبە بدرێت.

لیژنەكە بیروڕاو سەرنجەكانی خۆی دایە هەردوولا و بڕیار لەسەر بلاْوكردنەوەی كۆزارا دراو ئەم پێشەكی یەش پێویست بوو بۆ ئەوەی خوێنەرانی بەڕێز زیاتر سود لەم كتێبە ببینن.

ئەم كتێبە بریتیە لە دوو بەشی سەرەكی، بەشی یەكەمیان باسی گەردون و ژیانی دونیایە بەهەموو بوارە فیزیكیەكانەوە كە پڕە لە ئالۆزی و نهێنی... بەشی دووهەمیان باسی دونیای ڕۆح و جیهانی ئەثیری دەكات دیسان ئەمیش تابلێی دونیایەكی ئالۆزو ناسك و پڕنهێنییە.

مامۆستا حمە ڕەشید هەورامی توانیویەتی لەژێر تیشكی زانستی تازەدا زۆر شتی گرنگ و بەكەڵك بگەیەنێتە ئەم نەوە نوێیە كە تینووی ئەم جۆرە باسانەن.

**بەلاْم بۆ مێژوو بڵێین:**

١–ئەم كتێبە تەعبیر لەڕای نوسەرەكەی دەكات و مەرج نیە ئێمە هەمان بیروڕامان هەبێت لەسەر پرسەكانی ناو ئەم كتێبە.

٢–بەشی یەكەمی ئەم كتێبە تابڵێی دەوڵەمەندو زانستیە و پڕە لەنهێنی جوان جوان كە ئەم بەشە نزیكەی دوو سەدو پەنجا پەڕەیەكی كتێبەكەی داگیر كردووە. لە چاپە پێشوەكەیدا.

٣–بەشی دووهەمی كتێبەكە هەڵدەگرێ چەند سەرنجێكی مەنهەجی لەسەر بدەین كەمامۆستای نوسەریش دەیانسەلمێنێت و لاریشی نەبوو لەوەی وەك پێشەكی بۆ كتێبەكەشی زیاد بكرێت، كە كورتەی ئەو ڕاو سەرنجانەمان لەم خالاْنەدا كورت دەكەینەوە.

یەكەم/ قسەكردن لەسەر دونیای (غەیب)و (ڕۆح) پێویستە تەنیاو بەتەنیا (شەرع) قسەی تێدا بكات، واتە خواو پێغەمبەری خوا و جگە لە خواو پێغەمبەری خوا

هەرکەس قسەی تێدا کردبێت زاناو فەیلەسوفان بووبێت یان شێخ و مشایەخان بووبێت کەوتونەتە هەڵەی گەورە گەورەو ئەویرو ڕایانەش کە بۆیان دروست بووە لەجیاتی دڵنیایی و یەقین، دڵەڕاوکێ و سەرگەردانی بۆ دروست کردوون و مێژووش پڕە لە نموونەی لەم بابەتە.

دووەم/ مەسەلەی ئامادەکردن و هێنانەوەی ڕۆحەکان (تحضير الارواح) باسێکی زۆر هەستیارو ترسناکەو پێویستە ئەوە بڵێین کە ئەوە بابەتێکی سەلمێنراو نیە لەڕووی دین و زانستیشەوە، بەڵکو ئێستاش هەرگومانەو نەبۆتە ڕاستیەکی زانستی.

٢–ڕۆحەکان لەدونیای ڕۆح و ئەثیردان و تەنیاو تەنیا خوای گەورە دەسەڵاتی بەسەریاندا هەیەو کەس ناتوانێ دەسەڵاتی هێنانەوەو بەکارهێنانیان هەبێت ئەو کەسە هەرچی بێت و لەهەر پلەیەکی زانستی یان ڕۆحیدا بێت.

پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژێکیان جابری کوڕی عەبدوڵای بینی زۆر غەمبارو لێو بەبار بوو، فەرمووی: جابر ئەوە چیتە؟ عەرزی کرد: قوربان باوکم لەشەڕی (ئوحود)دا شەهید بوو، قەرزێکی زۆریشی دوای خۆی جێهێشت! پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: حەز ئەکەی ئەوەت پێ بڵێم کەپێش باوکت خوای گەورە لەگەڵ هەرکەسێکدا قسەی کردبێت لەپشتی پەردەوە قسەی لەگەڵدا کردووە، لەگەڵ باوکی تۆدا نەبێت کە ڕووبەڕوو گفتوگۆی لەگەڵدا کردووەو پێی فەرموو: چ داوایەکت هەیە با بۆتی جێ بەجێ بکەم؟ عەبدوڵای باوکت وتوویەتی: حەز دەکەم بمگێڕیتەوە بۆ دونیا بۆ ئەوەی جارێکی تریش لەپێناوی تۆدا شەهید بکرێم، خوای گەورە پێی فەرمووە: بۆ ئەوەیان .. ئەوە من پێشتر بڕیارمداوە کە ئەوەی مرد ناگەڕێتەوە بۆ دونیا، عەبدوڵا دەڵێت: ئێ باشە پەروەردگار ئەوانەی من دوای خۆم جێم هێڵاون لەمە ئاگاداریان بکە، ئەوە بوو خوای گەورە ئایەتەکانی "ولا تحسبن الذين قتلوا في سبيل الله أمواتا، بل أحياء عند ربهم يرزقون، فرحين بما أتاهم الله من فضله....."

واتە: وامەزانی ئەوانەی لەڕێگەی خوادا کوژراون مردون و فەوتاون، بەڵکو زیندون و لەخزمەت خوای خۆیاندان و ڕۆزیان بۆ دەبرێت، زۆر دڵخۆشن بەوەی خوای

گەورە پێی داون لە فەزڵ و رزقی خۆیی و مژدە بەوانەی دوای خۆیان ئەدەن کە (بێخەم بن) خوای گەورە پاداشتی خەڵکی چاکەکار وناکات!!

ئایەتەکەی سورەتی (المؤمنين) یش کە دەفەرموێ "قال رب ارجعوني لعلى أعمل صالحاً فيما تركت كلا أنها كلمة هو مائلها.." ئەوەی دەمرێت دەڵێت: پەروەردگار بمگێڕەوە بۆ دونیا بەڵکو دەست بدەمە کاری چاکەکردن لەو تەمەنەی پێچی ئەدەیتەوە، خوای گەورەش دەفەرموێ: (نەخێر شتی وا نابێت) [1].

بۆ ئەوەش کە دیدی ڕوونی ئیسلام دەربارەی (تحضير الارواح) لای خوێندەوارو خوێنەرانی ئەم کتێبەش ڕۆشن بێت، حەز دەکەین دەقی ئەو فەتوایەی بەڕێز شێخ ئیبن باز بنوسینەوەو دوای ئەوە ئیتر خوێندنەوەی ئەو جۆرە بابەتانە زیانی لاوەکی دروست ناکەن.

خوێنەریش مافی خۆیەتی بپرسێ: باشە بۆچی ئەم بەشی دووهەمەتان بلاوکردووەتەوە، کەلەگەڵ دیدی ئیسلام دا زۆر یەك ناگرێتەوە، لەوەڵامدا بەکورتی دەڵێین:

١-ئەوە مافێکی سروشتی مامۆستای نوسەرەو کەس نابێ لێی زەوت بکات.

٢-ئێمەش لەپرۆژەی تیشکدا بڕوامان بەڕاو ڕای بەرامبەر هەیەو بەنیازنین ئازادی ڕادەربڕین لەکەس زەوت بکەین مەگەر موهاتەرات بکات.

٣-ئەو باسانە ئەوەندە سەلماندنی تێدایە کە جگەلەم دونیا مادییەی کەهەموو کەس دەیبینێ دونیایەکی تریش هەیە کە غەیبەو هەرخۆی پڕە لەشتی نادیار، هەرچەندە لەعەقڵی بچوکی فەریکە خوێندەوارەکاندا جێگەی نابێتەوە، بەلام کەلە عەقڵی گەورەی زانایاندا جێگەی بووەتەوەو لەخولیای دۆزینەوەی کەرەسەو دەزگا گەلێکدا کەپەی بەو دونیا فراوانە بەرن.

٤-ئەو بەشی دوو هەمەش هەندێ ڕاستی زانستی و ئاینیشی تێدایە بەخەسارمان زانی خوێنەری کورد نەیزانن و زانیاریان دەربارەی نەبێت.

---

[1] زانایان دەفەرمون: جیاوازی (کلا) و (لا) ئەوەیە کە (لا) بۆ نەفیکردنە بەتەنیا بەلام (کلا) بۆ نەفی و ئینکارە، واتە ئەو شتە وانیە و ناشبێ ئەو شتە وابێت.

سەرنجی خوێنەرانی بەڕێزیش ڕادەکێشین بۆلای کتێبی (الفرقـان بـين اوليـاء الله واولياء الشيطان )ی ئیبن تەیمیە کەزۆر بەوردی باس لە ڕۆح و شەیتانەکان کردووە.

کەفێری شتانێکمان دەکات کەپێشتر نەمان زانیووە.

پرۆژەی تیشك

٢٠٠٩-٥-٧

# ـ کۆزارا ـ .Quasara

## پێشکەشە:

بەو لاوانەی کە تەماشای دەوروبەری خۆیان ئەکەن لە ئەنجاما لە گێژاوی بیروباوەڕی ماددی بێ ئەنجامدا خۆیان دەبیننەوە بە ڕاست و بە چەپدا ئەگەڕێن بۆ دۆزینەوەی ڕاستییەك بە تەواوی باوەڕیان پێ ی هەبێ و لەدڵ و دەروونیاندا جێگیر بێت .

پێشکەشە بەوانەی هەر لە سەرەتای تەمەنیانەوە بیروباوەڕی ڕاستەقینە جێگیر بووە لەبیروهۆشیانداو تاکو ئێستاش ڕۆژ بە ڕۆژ ئەم بیرو هۆشە پتەوتر ئەبێت وتێگەیشتنیان زیاتر ئەبێت .

هەروەها پێشکەشە بەو سەرلێشێواوانەی کە بەهیچ شێوەیەك بیر ناکەنەوەو بێ ئاگان لە ڕاستیەکان و مادەو ڕابواردنی جیهان لە خشتەی بردوون و بیر لە بوون و بونەوەر ناکەنەوە، تەنها ئەوە چۆتە دڵ و دەروونیانەوە هەموو شتێك سروشتییەو کە دروست بووە کۆتایشی دێت و هیچ ئەنجامێکی نی یە ..

# ـ كۆزارا ـ ـ ـ كوازارا ـ .Quasara

مژدەیەكە بۆ خواناسان

بانگەوازێكە بۆ خواناسین

((كوازارا:Quasara گەورەترین ودوورترین و ڕۆشنترین ئەستێرەیە لە گەردوون دا ، لەم سالأنەی دوایی دا زاناكان دۆزیانەوە و تەنها ئەستێرەیەك نی یە بەڵكو هەزاران ئەستێرەی لەم بابەتە هەیە)) .

## لەبەرئەوە ئەم كتێبەمان ناونا ((كۆزارا))

﴿ قُلِ انْظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا تُغْنِي الْآيَاتُ وَالنُّذُرُ عَنْ قَوْمٍ لا يُؤْمِنُونَ﴾ (یونس:١٠١)

واتە: بڵێ بڕوانن چی لە ئاسمانەكان و زەوی دا هەیە ، بەلأم ئەم نیشانانەو ئەم ووریا كردنەوانەیان ئەم ترسێنەرانە بۆ هۆزێ كە بڕوا ناهێنن بێ سوودە.

* ((مەحزونی ئەڵێ:

پدر ومادَر وفرزَند وعَزیزان رفتند

وە ! چەماغافل هەستیم ؟! چ كوتە نَظریم ))

واتە: باوك و دایك و كوڕو خۆشەویستان ڕۆیشتن ئای چەندە بێ ئاگاو بێ هەست و چەند كورت بینم !! ..

* ڕووناكی دڵ : زانستە ئاینیەكان و ، نووری ئەقڵیش " زانستی یە گەردوونی یە نوێ یەكانە . بە تێكەڵ كردنی ئەم دووانە : ڕاستی (الحقیقە) دەردەكەوێت ، بەلەیەك جیابوونەوەشیان ، لەمیاندا فڕوفێڵ و گومان ، لەویشیاندا دەمارگیری بێ كەڵك ونەفرەت لێ كراو ، سەرهەڵدەدات ) بدیع الزمان / سعید النورسی .

* (دەبێ بە بەڵگە بۆ هەموو جیهانی بسەلمێنم كە قورئانی پیرۆز خۆرێكی مەعنەوی یە ، تیشكی ئەو خۆرە هەرگیز كز نابێت، ڕووناكی یەكەشی بە هیچ كەسێك ناكوژێتەوە) بدیع الزمان /سعید النورسی

* غەزالیش دەڵێ: (أعلم أن العقل لن يهتدي الا بالشرع، والشرع لم يتبين الا بالعقل، فالعقل كالآس والشرع كالنباء ولن يغني أس مالم يكن بناء، ولن يثبت بناء مالم يكن ئس).
واتە: ئەوە باش بزانە کە عەقڵ ڕێگە نادۆزێتەوە بەشەریعەت نەبێت و شەرعیش ڕۆشن نابێتەوە بەعەقڵ نەبێت، عەقڵ وەك بناغە وایەو شەریعەتیش وەك خانووەکەیە، بناغە کەڵکی چی دەگرێ کەخانووی بەسەرەوە نەبێت، کام خانووەش خۆی ڕادەگرێ کەبناغەی نەبێت !!

## ڕوون کرنەوەیەك ـ

**لەبەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا باسی گەردون دەکەین و باسی مردنی دونیای فیزیکی دەکەین.**

لەم کاتەدا کە زانست و تەکنەلۆجیا هەنگاوی گەورەو خێرا ئەنێن بەرەو پێشەوە بۆ بەرزبوونەوەو تێگەیشتن لە ڕاستی یەکان . زانستی بۆشایی ئاسمانەکان و گەردوون لەهەموو زانستەکان زیاتر هەنگاوی ناوەوەو بەرەو پێشەوە ڕۆیشتەوە ، جاران ئەم جۆرە زانستە بەهۆی ئامێرو تەلەسکۆبە زەمینیەکانەوە بوو . کەلە زەوی‌یەوە ڕوویان کردبووە ئاسمان .

بەڵام بەهۆی پێشکەوتنی ئەم زانستەوە ئامێری نوێ ی ئاسمانی دروست کراو تێ گەیشتن لە ئاسمان بوو بە پەیژەی ئەم زانستە بۆ زانینی هەواڵی تەنەکان لە ئاسمانەکان و بۆشایی ئاسمانەکان دا دوای بەرگەبای زەوی ئەمەش بەهۆی دۆزینەوەی شەپۆلی تیشکی (کهرۆموگناتیسی) بوو .کەبەم هۆیەوە توانرا زانیاری زۆر بزانرێت دەربارەی گەردوون و بوون وبونەوەر . ئەم زانستە ئەتوانین پێ ی بڵێین (سەرداری زانست) چونکە بەڕاستی چارەسەری کێشەو پرسیاری زۆر دەکات.

لەو پرسیارانەش :

- چۆن گەردوون دروست بوو ؟ کەی دروست بوو؟ کێ دروستی کرد ؟
- کەی کۆتایی ئەم گەردوونە دێت ؟
- کەی ژیان دەستی پێ کرد ؟ ئایا ژیان تەنها لەسەر زەوی هەیە ؟
- پەروەردگار کێ یە ؟ ئایا ئەبینرێ ؟

- کەی و چۆن ڕۆژی دوایی ئەبێت ؟ ئایا لێپرسینەوە هەیە ؟
- ئایا گەردوون بە ڕێکەوت دروست بوو لە خۆیەوە ؟ سروشتی و بیٚ یاسایە ؟
- ئایا مردن هەیە یان ژیان دوای مردنیش بەردەوامە ؟
- ئایا ڕۆح و جیهانی ڕۆحی هەیە ؟ دوای مردن یەکتر ئەبینینەوە ؟
- ئایا ئەتوانین لەگەڵ مردووەکانماندا قسە بکەین و هەواڵیان بزانین ؟

ئەم پرسیارانەو گەلێك پرسیاری تریش لەم بابەتانە لەم کتێبەدا بخوێنەرەوە لەگەڵ وەڵامەکانیان بەشێوەیەکی ئایینی و زانستی نویٚ ی هەرە پێش کەوتوو ...

ئەم کتێبە باوەڕ لە دڵی موسڵمانان دا بەهێز ترو چەسپاو تر دەکات ، بەتایبەتی لاوانی تێگەیشتووی موسڵمان ، دەستیان ئەگرێت بۆ ڕێگەی خواپەرستی و دووریان ئەخاتەوە لەڕێگەی نەزانین وخراپەکاری بەهۆی ئەو گەشتانەوە بۆ ئاسمانەکان کە باسیان ئەکەین .

**ئاسمانەکان : ئەستێرەکان ، گەلە ئەستێرەکان ، کۆمەڵەی گەلە ئەستێرەکان ، سەدیمەکان ، واتە هەورە نەوەوییەکان ، کلك دارە ڕووناکەکان ، کۆزاراکان ، ئەشکەوتە ڕەشەکان ، ئەشکەوتە سپی یەکان ..لەبەشی یەکەمدا .**

## <u>لەبەشی دووەمی ئەم کتێبەدا :</u>

## باسی دونیای ڕۆح و مردن و ژیانەوەی دوای مردن دەکەین.

چیرۆکی دروست بوونی ژیان و ژیانی دوای مردن لە جیهانی ڕۆحی دا لەئاسمانە ئەثیریەکان و زیندووبونەوە بەلەشێکی ئەثیری لە جیهانی ئەثیری دا بەڵگەی ڕاستی وزانستی وئاینی ئەیسەلمێنن کە ڕۆحەکان ئێستا ماون لە جیهانی ڕۆحیدان واتە (جیهانی بەرزەخ) .

هەتا زانست پێش کەوێت زاناکان زیاتر باوەڕیان پتەو ئەبێت بەبوونی پەروەردگارو ڕاستییەکانی قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەرمان محمد (د.خ).

لەبەرئەوە تاکو ئێستا ژمارەیەکی زۆریان باوەڕیان بە پەروەردگار هێناوە.

## پێشەکی :

دوای بیرکردنەوەیەکی قووڵ و درێژ خایەن ، لەسەرەتای تەمەنمەوە تاکو ئێستا ، دوای خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزو چەند تەفسیرێك و خوێندنەوەی سەدان فەرموودەی پێشەوای ئیسلام محمد (د.خ) هەروەها خوێندنەوەی دەیان سەرچاوەو سەدان گۆڤارو ڕۆژنامەو پەیوەندی کردن و گفت وگۆکردن لەگەڵ ژمارەیەك لە زانایانی ئاینی و زانستی جۆراو جۆر ئینجا توانیم بەم جۆرەی ئێستا ئەم کتێبە بخەمە بەر دەستی خوێنەرانی بەڕێز لەهەر نەتەوەو ئاین و ـ وولاتێك بن .

ئێستا ئەم زەوی‌یەی لەسەری ئەژین پڕە لە پەژارەو ترس و لەرز کە سەرچاوەکەی برسیەتی ڕۆحی یە دەوری خەڵکی داوە – بەتێرکردنی ڕۆحەکان لە بیروباوەڕی ڕاست وپاك و خواپەرستی خەڵکی لە سێبەری ئاسایش و ئاشتی دا دەژین .

ئەمڕۆ لە تاریکی ماددەو تاوان و گوناهی هەمە جۆرەدا دەژین ، تووڕەیی ودووبەرەکی وناڕێکی ودڵتەنگی‌و هەناسە ساردی‌و بێ ویژدانی و ململانێ ی ناڕەوا– لەناوماندا بڵاوبۆتەوە .لەبەر هیچ هۆیەك نی یە ، تەنها لەبەر ئەوەیە ڕێگەی ڕاستمان گوم کردووەو شوێنی ڕێگەی چەوت کەوتووین .

تاریکایی لەسەر تاریکایی کۆبۆتەوە لە دەوروپشتمان وتیشکی ماددە ئەدرەوشێتەوە لەناوی داو شوێنی کەوتووین .

ئەم تیشکە درۆزنە هەروەکوو (تراویلکە– سەراب)ە هەتا بڕۆین بە شوێنیا نایگەینێ ونایدۆزینەوە .

خوێنەری موسڵمان و ئەو خوێنەرانەی هیچ باوەڕێکتان بە ئیسلام نی یە وەرن لەم دارستانە تاریکەدا پەنجەرەی ڕۆشنایی ئاین و زانست و ڕۆح بکەینەوە تاکوو ڕووناکیمان لێ دەرکەوێت و ڕێگای ڕاستی خواناسی‌و ئاشتی وبرایەتی بدۆزینەوە.

لەم کتێبەدا باسی گەورە زانایانی جیهان بخوێنەرەوە لە زانایانی زانستی : بیرکاری – فیزیا – کیمیا – زیندەوەرزانی – گەردوون ناسی – کە زانستی نوێ..گەیاندنی بە باوەڕهێنان بە پەروەردگارو ئەوەیان بۆ ڕوون بوویەوە :

﴿ إِنَّ السَّاعَةَ لَآتِيَةٌ لا رَيْبَ فِيهَا وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يُؤْمِنُونَ ﴾ (غافر:٥٩)

واته: (لەناوچوونی گەردوون وبوون وبوونەوەر کاتی دێت و گومانی تێدا نی یە بەڵام زۆربەی خەڵك باوەڕناکەن).

ئەمە دوای ئەو هەموو گەشتە زانیاریانەی زاناکانی گەردوون ناسی کردیان بۆ ئاسمان و مەلە کردنیان لە نێوان مانگ و ئەستێرەکانی کۆمەڵەی خۆردا بەهۆی کەشتی ئاسمانی ومانگی دەستکردەوە .

هەروەها تێگەیشتنیان لەتەنە هەرە دوورەکان لە ئاسمانەکان بەهۆی تەلەسکۆبی هەرە گەورەی ڕادیۆی یەوە وە گەردبینی ئەلەکترۆنی زۆر پێشکەوتووەوە و ڕاستی یەکانیان بۆ دەرکەوت لە دروستکراوە سەرسوڕهێنەرەکانی پەروەردگار کە هەرگیز لە یاساو ڕێك و پێکی کارکردنیان تێك نەچوون و تێك ناچن ولانادەن لەو شوێنانەی بۆیان دیاری کراوە هەر لەسەرەتای دروست کردنیانەوە تاکوو ئێستاو ئەو کاتەی فەرمانی پەروەردگاری دەرئەچێت بۆ کۆتایی هێنان بە کارکردنیان .

هەروەها بۆیان دەرکەوت کە تەنها دەستێك هەیە لە دروست کردنی گەردوون دا هەرلەیەکەم خانەی مادەوە کە هەمووشتێکی لێ دروست کراوە هەمووی یەك سروشت ویەك یاسایان هەیە .

لە ئادەمیزادو کانزاو ڕووەك و تەنە بێ گیانەکانیش !!!

خانەکانیان لەسەر یەك شێوەو یەك بناغە دروست کراون .

هەر لەدروست کردنی گەردیلەوە تاکو گەورەترین ئەستێرە کە چوارسەد ملێون جار لە خۆر گەورەترە ، خۆریش سەد ملێون جار لە زەوی گەورەترە بەڵکو زیاتریش .

ئەو دەستەی لە سنگماندا ئەو دڵەی لە گۆشت و خوێن دروست کردووە بە ڕێك وپێکی بەردەوام لێ ئەدات هەر ئەو دەستەیە ئەستێرە گەورەکانی ئاسمانی دروست کردووە لەئەنجامدا ئەو ئەستێرە گەورەیە پیر ئەبێت و ووردە ووردە بچووك ئەبێتەوەو ئەبێت بە ئەستێرەیەکی نیوترۆنی وەکو دڵ لێ ئەدات لەسەر خۆو زۆر بە بچووکی .

کەوا بوو لە خوێندنەوەی ئەم کتێبەدا ئەگەیتە ڕاستی بەڕەزامەندی خۆت نەك بە خۆبەدەستەوە دان .

## لەم جیهانەدا پەژارەی ئادەمیزاد دوو جۆرە:

**یەکەمیان پەژارەی خۆراکە :-**

کە پێویستی ژیانە ئەم پێویستی یە ئامانجێکی نزیکەو هەموو کەس بۆی تێ ئەکۆشێ و دەستی ئەکەوێ تاکو ئەوانەش کە ناتوانن کار بکەن ئەگەر دەستیش پان بکەنەوە هەر پەیدای ئەکەن وئەژین .

**پەژارەی دووهەمیان:**

دروست کردنی خێزانە – ئامانجێکی دوورە دوای ماوەیەکی تەمەن دێتە دی بەلاّم هەردوو ئامانجەکە لە پێناوی مانەوەی ژیانە – هەروەها ڕووەك وگیان لەبەرانی تریش هەوڵی مانەوەی ژیانیان ئەدەن .

کەوابوو مەبەست چی یە لە ژیان و ئێمە بۆچی ئەژین ؟ پاشان بۆچی ئەمرین و دوای مردنمان چی ئەبێت ؟

خوێنەری بەڕێز وەلاّمی هەموو پرسیارەکان بخوێنەرەوە کە بەبەڵگەی زانستی زانایانی ئەمڕۆ دەریان خستووە ..

چونکە زانستی نوێ سەرچاوەیەکە لەسەرچاوەکانی باوەڕ .

لەبەر ئەوە بە زانستی وتاقی کردنەوەو بۆچوونی زاناکان ڕاستی یەکان لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام دا ڕوون بۆتەوە .

**فەرموون لە بابەتەکانی بەشی یەکەمدا تەماشابکەن و تێ بگەن ..**

## ـ بەشی یەکەم ـ

# ژیان و گەردوون

## أ- ژیان:

هەر لە منالّی یەوە و لەنەرمی نینۆکەکانمەوە تاکو ئێستا بیر ئەکەمەوە ئەڵێم : ژیان چی یە؟ من بۆچی ئەژیم ..تەماشا ئەکەم ژیانم ئەڕوا هەروەها ژیانی خەڵکی تریش لەگەڵما ئەڕوا لەهەموو ڕەنگ و ڕەگەزێك و ژیانی هەموو گیان لەبەران و ڕووەك و زیندەوەرەکانی تریش ئەڕوا ...لەهەموو چرکەیەکدا داهاتوو ئەچێتە سەر ڕابردوو تاکو کۆتایی داهاتوو دێت و هەموو شتێك ئەبێت بە ڕابردوو بە کۆتایی هاتنی گەردوون ولەناوچوونی ..ئەمە ڕێگەی دەسەڵاتێکی گەورەیە وە بەرزترین دەسەڵاتە ، دەسەڵات و هێزی پەروەردگارە ، ڕێگای داوە بەهەموو زیندەوەران بەو ڕێگەیەدا بڕۆن وهیچ هێزێك نیە ئەم ڕێگەیە بگرێ یان کورتی کات یان درێژی کات ئەمە ڕێگای ژیانە گەورەترین ڕێگایە هەموو بوونەوەرانی تێدایەو ئەڕۆن ، وەکوو ڕووبارێکە لەسەرچاوەکەیەوە هەڵدەقوڵێ بەلەدایك بوون و ئەڕژێتە ڕێژگە بێبنەکەیەوە کە کۆتایی ژیانی یەکەمی سەر ئەرزەو ژیانی دووهەمی هەتا هەتایی دەست پێدەکاتەوە کەی پەروەردگار بڕیاری لەسەر دەرکرد .

ئەگەر ئەپرسی ئەم ڕووبارو سەرچاوەو ڕێژگە بێ بنە ناوی ئەنێ ی چی؟ ئەڵێم بەندێکە لەو بەندانەی کە پەروەردگار بڕیاری لەسەر داوە لەو کاتەوە کە گەردوون و بوون و بوونەوەری دروست کرد .

ئەم بوونەوەرانە هەموویان هەوڵ ئەدەن بۆ ژیان هەر لە منالّی ساواوە کە بێ ئەوەی فێر کرابێ دەست ئەبات بۆ مەمکی دایکی و داوای شیر ئەکات تاکوو ڕوەك بە کۆرپەلەیی دوای تەواوبوونی خۆراکی تۆوەکەی ڕەگ و ڕیشە ئەکوتێتە ناخی ئەرزەوە بۆ خواردن ، هەروەها جوجەڵە ، لە هێلکە هاتە دەرەوە دەنووك ئەهاوێژێ بۆ خواردنی دانەوێڵە بۆ ئەوەی بژی ، هەموو ئەمانە ئەژین و بەرەو پیری ئەڕۆن ئینجا بەرەو نەمان لەسەر ڕووی زەوی بەلاّم پاش ئەمان نەوەکانیان دێن ، ئەمانیش بەهەمان شێوەو بەهەمان ڕێگادا دەڕۆن .

ژیان وخۆراك ئامانجێكی نزیكە ، نەوە خستنەوە ئامانجێكی دوورە ، بەلاَم هەردووكیان تەواوكەری یەكترن بۆ بەردەوام بوون ومانەوە تاكو مەزنترین بڕیار دەرئەچێت لەلایەن پەروەردگارەوە بۆ كۆتایی هێنان .

خەڵك لە پیری دا دوو جۆرن : هەندێكیان خۆیان ئەدەنە دەست ئەمری واقع یان لەبەر نەزانی یان لەبەر بێ توانایی .

واتە : بیر ناكەنەوە – تەنها باوەڕیان هەیە بە پەروەردگار .

بەلاَم جۆری دووەم : باوەڕیان لەسەر تێگەیشتن دائەمەزرێنن بە گوێرەی توانا مێشكیان هەموو كاتێك لەبیركردنەوەدایەو هەوڵ ئەدەن بە چاو ببینن بە گوێ ببیستن، بەزمان قسە بكەن دەربارەی كارەكانی پەروەردگار ، شارەزا ببن وباوەڕیان زیاتر بەهێزبێت .

بۆیە منیش لەگەڵ ئەم جۆرەیان ئامادەم گفتوگۆ بكەم .

زۆر لە مێژەوە خەڵكی تەنها ئەو شتانەیان ئەدی كە بەچاو ئەبینرا بەلاَم كە زانست پێش كەوت ماوەیەكە ئەو شتانەش ئەبینن كە لەمەو پێش نەئەبینران .

لەبەر ئەوە پێویستە لەم باسەدا لەسەر ڕووناكی ئەو زانیاریانەی زاناكانی جیهان باسی ((گەردوون)) بكەم .

## تێگەیشتنم لە گەردوون دوو تێگەیشتنە :

یەکەمیان ئەوەیە هەموو ئەستێرەکان و گەلە ئەستێرەو کۆمەڵەی گەلە ئەستێرەو کلك دارەکان و هەورە نەوەوی یەکان و ئەشکەوتە ڕەشەکان و کۆزاراکان و ئەشکەوتە سپی یەکان زۆر بە ڕێك و پێکی دروست کراون، پەیوەندیان بەیەکەوە هەیە ئەمەش دەسەڵاتی گەورەترین دەسەڵاتدارە .

تێگەیشتنی دووەمم ئەوەیە : هەرچی دروست کراوەکانی گەردوون هەیە بەیەك یاسا ئەڕۆن بە ڕێوە هەر لەخانەیەکەوە کە بە چاو نابینرێ تاکوو گەورەترین ئەستێرە لەم گەردوونەدا ، هیچیان ئیش و کاری ئەوی تریان ناشێوێنیٚ و کەم وزۆری ناکەن، بەردەوام بەیەك شێوە کاری خۆیان ئەنجام ئەدەن ، ئەمەش بە گەورەترین دەسەڵات ڕێك خراوە .

من ئەڵێم پەروەردگارە تۆ بڵێ خوایە یەکێکی تر بڵێ ((الله))یە .یەکێکی تریش بڵێ هێزێکی گەورەو دەسەڵاتێکی زۆر بە توانایە .

هەر ناوێکی لێ بنێین ، ئەم گەردوونە دروست کراوی دەسەڵاتێکی گەورەیەو تەنها یەك دەسەڵاتە .چونکە ئەگەر لەیەکێك زیاتر بوایە لە ماوەیەکی کەمدا دەسەڵاتەکان لەناو یەکدا نەئەگونجان و یاساو پەیوەندی هەموو بوون و بوونەوەرەکان و تەنە گەردوونیەکان تێك ئەچوو نەئەما ، لێرەدا دیارە یەك دەسەڵاتە دروست کەرو ڕێك خەری هەموو شتێکە پێویستە بەچاو ببینین ، زاناکان باسی گەردیلە ئەکەن و لەناوەڕاستی ناوك هەیەو بەدەوریدا ئەلەکترۆن کەبەچاو نەیان دیوە بەلاٚم بەشێوەیەکی تر ئەیبینن و ئەیزانن ..ئەی بۆچی ئێمە لەدروست کراوەکانی پەروەردگارەوە زانستانە پەروەردگار نەبینین ؟ تەنها مەبەستمان ئەوەیە خواپەرستی زانیاریانە بێت و کوێرانە نەبێت .

## خوا پەرستی دوو جۆرە :

خواپەرستی نەزانەکان کە تەنها بەدەم ئەڵێن : پەروەردگار هەیەو دەسەڵاتی بەسەرهەموو شتێکدا هەیە .باوەڕی تەواویان بە زیندبوونەوەو لێ پرسینەوە هەیە.

**خواپەرستی زاناکان** : ئەڵێن پەروەردگار چۆنە ؟ ئەبیستێ ، ئەبینێ ، هەست ئەکات بۆچی ژیان ومردن پاشان زیندووبونەوە ؟ ئەستێرەکانی بۆچی بەم شێوەیە دروست کرد ئەو هەموو دووری یەی نێوانیان لەبەرچی ؟

واتە : زانست خواپەرستی یە ..چونکە بەڕاستی گەورەیی و دەسەڵاتی پەروەردگار ئاشکرا ئەکات بە جۆرێك بەچاو بە دڵ بە هەست ئەیبینی و هەست بەبوونی ئەکەی دڵنیا ئەبیت لە باوەڕت کە ڕێگەکەت ڕاستەو بێ غەمی .

کەوابوو زانست : تاکە ڕێگەیە بۆ دۆزینەوەی پەروەردگار ، چونکە زانست ڕووناکی‌یە ، مێشك ودەروون ڕووناك ئەکاتەوە ..بەڵام نەزانین تاریکی‌یەو ڕێگات پێ هەڵە دەکات .

ئەوانەی ئەمڕۆ باسی ژیان ئەکەن ، ژیانیان پڕ لە مەترسی‌یە !!

ترسی هەژاری ونەخۆشی و نەبوونی ئاسایش تەنها بیر لە مردن ناکەنەوە.

بەڵام ترسی مردن لای خواناسانە .هەرکەس لە مردن نەترسێ نەزانە .تەنها ئاژەڵەکان لە مردن ناترسن چونکە ئەقڵیان نی یە و بیرناکەنەوە .ترسیش لە مردن ئەبێ بە زانست بیدۆزیتەوە تاکو بزانیت مردنی هەتاهەتایی نی یە و ڕزگارت بووبێت لەو تاوانانەی کە کردووتە . یان ئەو چاکانەی کردووتە بەفیڕۆبڕۆن .

ترسی مردنیش لە تاوانەکانەو لێ پرسینەوە چونکە مردن ڕزگار بوونە لە ژیانی فیزیاوی سەخت و شادبوونە بە ژیانی خۆشی هەتاهەتایی ئەگەر تاوانبار نەبین و کردەوەکانمان لەم جیهانەدا چاك بووبێت .

١- دامێك مرۆڤو ژیان و بونەوەر بێخاوەن و بێ خولقێنەر نین، کەواتە پێویستە مرۆڤی ژێر بەدوای خولقێنەرو خاوەنی ڕاستەقینەی خۆیدا بگەڕێ و "بیناسێت" و "بیەوێت" و "نەیڕەنجێنێ" و "ڕازی بکات".

٢-خاوەنێك کە زاتێکی ئەوەندە بەدەسەڵات بێت و بونەوەری تەسلیم بەم مرۆڤە کردبێت، ئەستەمە کەتەلۆکی بۆ ئەم مرۆڤ و ژیان و بوونە دانەنابێت، کەواتە ئەو کەتەلۆکە ڕاستەقینە کامەیە کەمرۆڤو بون و یانی پێ دەخوێنرێتەوە کە پێویستە مرۆڤی ژێر (بیناسێت)و (بیەوێت)و (پەیڕەوی لێ بکات).

٣-ناوێك مرۆڤ دەمرێ كەواتە دەبێ بزانێ ئەو دەسەڵاتە كێ یە فەرمان بەمردنی دەكات، ئەی كەمرد بۆ كوێی دەبات لەوشوێنەدا چی بەسەردێ، ئایا تۆ بڵێی لەو كەتەلۆكەدا كەبۆتە تەفسیركردنی ژیان و مرۆڤو بوون دانراوە، درێژەیان، سەرباسەكانی ئەم پرسە گەورانەی ڕوون نەكردبێتەوە، لەگەڵماندابن بۆتان دەردەكەێ كە زانستی نوێ ئەم ڕێگایەمان پیشان ئەدات كە ڕێگەی خواپەرستی یە .

كەوابوو با هەمووومان بەو ڕێگەیەدا بڕۆین كە ئەویش بە گەردوون ناسی ئەگەینە ڕاستی و دروستی ئەو ڕێگایە.

## ب-گەردوون

(ئایا ئەم گەردوونە خاوەنی هەیە )؟؟؟

پرسیارێكە هەموو خاوەن بیرو هۆشێك ئەیكات ،منداڵ ئەم پرسیارە لەباوكی ئەكات، لاوەكان ئەم پرسیارە لەخۆیان ئەكەن و سەریان سوڕئەمێنێ و بیری لێ ئەكەنەوەو وەلامێكی ڕاستەقینەیان دەست ناكەوێ ، نەفامەكان بیرناكەنەوە ئەڵێن پەروەردگار دروست كەری ئەم گەردوونەیەو خاوەنیەتی !!! زاناكانیش بەهۆی پێشكەوتنی زانستەوە ئەڵێن بەڵێ گەردوون دەسەڵاتێك دروستی كردووە و خاوەنیەتی ...

زۆر لە مێژەوە ئەم پرسیارە كراوە ، هەریەكەو بە جۆرێك وەلامی داوەتەوە بەگوێرەی بیركردنەوەی خۆیان ، هەندێكیان ڕۆژیان پەرستووە وبەخاوەنی گەردوونیان زانیوە ، هەندێ بت پەرست بوون ، هەندێ ملحد (بێ باوەڕ) بوون ، واتە باوەڕیان بەهیچ دروست كەرێكی گەردوون نەبووە ، ئەڵێن گەردوون لەخۆیەوە دروست بووە .

هەندێكیش باوەڕی تەواویان بە پەروەردگار هەیەو بەخاوەن ودروست كەری گەردوونی ئەزانن و باوەڕی ڕاستەقینەو زانستیانە لە دڵ و دەروونیان دا چەسپاوە .

بەڵام بیرو هۆش لە ئەنجاما بۆی ڕوون ئەبێتەوە كە وەلامی ئەم پرسیارە بداتەوە بە جۆرێك هەموو كەس باوەڕ بكات چونكە گەردوون ئەڕواو ئەجوڵێ، یاساو ڕێك

خستن و سوڕانەوەی ڕێك وپێكی هەیە ، مێشك بیر ئەكاتەوەو مرۆڤیش تەماشا ئەكات و زانیاری پێش ئەكەوێ .

دیارە ئەوانەی بت پەرست و ڕۆژو مانگ و ئەستێرەپەرست بوون نەزان بوون و باوەڕێكی زانستیانەیان نەبووە ، بێ باوەڕەكانیش هەروەها گەوج و نەزان بوون چونكە بە ڕێكەوت ئەم گەردوونە دروست نەبووە .

بۆ نموونە: ئەگەر هەزاران پیت بێنین تێكەڵیان بكەین لە ناو تورەكەیەكی گەورەدا، پاشان هەڵیان ڕێژین لەوانەیە چەند پیتێك بە ڕێكەوت لەتەنیشت یەكەوە ووشەیەك یان ڕستەیەكی مانادار دروست بكەن ، بەلآم هەموو پیتەكان ڕێك ناكەون كتێبێكی مێژوویی یان جوگرافی یان زانستی یان بیركاری ..هتد. بە ڕێك وپێكی دروست بكەن.

بەلآم ئەبینین هەزاران ملیۆن ملیۆن ئەستێرەو تەنی جیاواز لەم گەردوونەدا هەیە، ،بەیاسایەكی ڕێك وپێك دانراون، بە فەرمانێكی ووردەكاری بەڕێوە دەچن و دەسەلآتێكی گەورە بالآ دەستە بەسەر هەمووی دا و ئەگەر تەنها ئەلكترۆنێك لە گەردیلەیەك دا كە بەچاو نابینرێ لەبەر بچووكی لە خولگەی خۆی دەرچێت هەموو گەردوون لەناو ئەچێت یان ئەستێرەیەك زۆر زۆر بەكەمی خێرایی یەكەی كەم بكات یان زۆر بێت دیسانەوە گەردوون تێك ئەچێت كەوابوو گەردوون دروست كراوەو بەڕێوەبەری هەیە .ئەویش پەروەردگارە .

زۆر كەس باوەڕی بە پەروەردگار نیە ، بۆیە هەمیشە ژیانی بە دڵە ڕاوكێ و خراپەكاری ئەباتە سەر لەهەموو تەنگانەیەكدا ئەڕووخێ وهیچی بۆ ناكرێ و ویژدانی ئاسوودە نی یە و ..مانای ژیانی ڕاستەقینە نازانێت ، بەلآم بە پێچەوانەوە ، خاوەن باوەڕەكان دڵپاك و دەروون پاكن ، هەولٚی چاكە ئەدەن و خۆیان لە خراپەكاری ئەپارێزن ، كاتی دڵخۆشیان سوپاسی پەروەردگار ئەكەن وكاتی ناخۆشیان پەنای بۆ ئەبەن و ویژدانیان ئاسوودەیە.

گومانی تێدانیە مرۆڤی بێ باوەڕ گیان لەبەرێكە ئارەزووەكانی زاڵن بەسەریا و بێ ویژدانە .

## پەروەردگار سیٚ جۆر بوونەوەری دروست کردووە :

**أ-مەلائیکـە:** ئـەقلّی پـیٚ بەخـشیوون بـەبیٚ ئـارەزوو لەبـەر ئـەوە هـەموو کاتیـان بەخواپەرستی ئەبەنە سەرو ئەقلٚ زالّە بەسەریان دا .

**ب-گیـان لەبـەران:** تـەنها ئـارەزووی پیٚ بەخـشیوون ئـەقلّیان نیـە ، لەبـەر ئـەوە ئـارەزوو زالّـە بەسـەریاندا بـەبیٚ لیٚکدانـەوە تـەنها هـەولّی بـەجیٚهیٚنـانی ئارەزوەکانیان ئەدەن بەهەر نرخیٚك بیٚت .

**ج-ئـادەمیزاد:** ئەقلٚ و ئارەزووی پیٚ بەخشیووە .

هەرکـەس ئـەقلّی زالٚ بـوو بەسـەر ئـارەزووی دا ئـەوە پیـاو چاکە وهەلّـە ناکـات و باوەڕی تـەواوی بـە پـەروەردگار هەیـە ویـژدانی ئاسـوودەیە .هـەموو کاتیٚـك حـەزی لـە چاکە کاری یە.

بـەلاّم خـوا پـەنامان بـدات ئەگـەر ئـارەزوو زالٚ بـوو بەسـەر ئـەقلّمان دا ئـەوە لـە مرۆڤایـەتی دەرئەچین و دڕندەیـەکی خراپمـان لیٚ پەیـدا ئـەبیٚت لـە دڕنـدەکانی دەشـت وکیٚـو خـراپترو چاك و خـراپ نـازانین و تـەنها لەبەر ئارەزوو هـەموو خراپەکاری‌یـەك ئەکەین

تـاکو ئیٚـستا چـوار ڕای جیـاواز هەیـە لـە نـاو خـەلّك دا لـە بـارەی دروسـت بـوونی گەردوونەوە :

**<u>ڕای یەکـەم</u> :**ئـەلّیٚن گـەردوون وجـودی نیـە شـتیٚکی خەیالّی‌یـەو سـیٚبەرە وەلاّمـی ئەمانە ئاسانە ، ئایا ئەم هەموو ئەستیٚرەو خۆرو مانگ و تەنە گەردوونیانە سیٚبەرن ؟ ئەی بۆچی بەهەست کردن ئەزانین سیٚبەر نین و مادەن ؟

**<u>ڕای دووەم</u>:** ئەلّیٚن ئەم گەردوونە لە نەبوونەوە دروست بووە ..ئەمەش واتایـەکی بیٚ مانایەو ئەم گەردوونە لە هیچەوە دروست نەبووە .

**<u>ڕای سیٚ یەم</u>:** ئەلّیٚن گەردوون ئەزەلی‌یەو سەرەتای دروست بوونی نیە .وەلاّمی ئەم ڕایە ئەوەیە :

ئەگەر گەردوون ئەزەلی بێت و سەرەتای دروست بوونی نەبێت هەروا بە ڕێکەوت بوبێت ئەبوایە یاساو ڕێك و پێکی و سووڕانەوەی هەموو مانگ وئەستێرەو خۆرەکان نەبوایەو گەردوون وەستاو بوایەو هیچ زیندەوەرێکیش نەبوایە .

**ڕای چوارەم :** لە مانای ئەزەلی دا ڕاستە ئەگەر بەکاری بێنین کە پەروەردگار دروست کەری ئەم گەردوونە ئەزەلی یەو بەدەستی ئەو ئەم هەموو شتە سەرسوڕهێنەرانە دروست کراون و گەردوون سەرەتای دروست بوونی هەیەو کۆتایشی دێت بەڵام ئەزەلی سەرەتای دروست بوونی نیە و کۆتایشی نی یە .

بۆ نموونە : هەندێ کاری پەروەردگار باس ئەکەین کە هەموو کەس بزانێت بە ڕێکەوت ئەمانە دروست نەبوون و زاناکانیش ئەم ڕاستیەیان بۆ ڕوون بوەتەوە .

زەوی تۆپێکی هەڵواسراوە بە هیچەوە نەبەستراوە لەناو بۆشایی ئاسماندایە – بەدەوری خۆیدا ئەسوڕێتەوەو شەوو ڕۆژ پێك دێت ساڵی جارێك بەدەوری خۆردا ئەسووڕێتەوە چوار وەرز پێك دێت بەدەوری زەویدا بەرگە با هەیەو ئەستووری ئەم بەرگە ٥٠٠ پێنج سەد میلە قەبارەی وا دروست کراوە زەوی ئەپارێزێت لەهەزاران پارچە ئەستێرەی ترکە بەرەو زەوی دێن و لەهەزاران تیشکی کوشندە کە بەرەو زەوی دێن ئەیپارێزن ..

هەروەها ئەم بەرگە بایە پلەی گەرما ئەپارێزێت بە جۆرێك بگونجێ بۆ ژیان و ئەم بایە هەڵمی ئاوی دەریا و ئۆقیانوسەکان ئەگوێزێتەوە بۆسەر هەموو کیشوەرەکان و ئەبێت بە باران و زەوی زیندوو ئەکاتەوە دوای مردنی ﴿يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَيُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَكَذَلِكَ تُخْرَجُونَ﴾ (الروم:١٩)

ئاو چوار خاصیەتی هەیە بۆ ژیان لە دەریا و ئۆقیانوسەکان داو لە ڕووبارەکان دا .

لە کاتی زستانی زۆر ساردا ، ئاو بڕێکی زۆر ئۆکسجین هەڵئەمژێ چڕی ئاو لە چوار پلەی سەدی دا ئەوەستێت ، لەبەر ئەوەیە سەهۆڵ بخەینە ناو ئاو سەر ئاو ئەکەوێ چونکە چڕی سەهۆڵ لە ئاو کەمترە واتە بەشی سەرەوەی ڕووبارو دەریاو ئۆقیانووسەکان ئەیبەستێت سەهۆڵەو سەر ئاو کەوتووە ، ئاو لە ژێرەوەی سەهۆڵەکەیەو گیانلەبەرەکان ئەڕۆنە ناو ئاوەکەو ژیانیان ئەبەنە سەر ، ئەم خاسیەتە

تەنها لە ئاودا هەیە ، ئەگەر چڕی سەهۆڵ زۆرتر بوایە لە ئاو ..بێ گومان بەستنی لە ژێرەوە دەستی پێ ئەکردو هەموو ئاوەکان ئەیانبەست وژیانی زیندەوەرەکان کۆتایی ئەهات .

بەلاّم ووشکانی ئەم زەوی یە شوێنێکی لەبارە بۆ ژیان ، بۆ هەموو گیانلەبەرەکان و ڕووەکەکان ، خۆڵەکەی هەزاران مادەی تێدایە ڕووەك ئەیکات بە خۆراك بۆ خۆی ..لە ڕووەکیشەوە خۆراکی هەموو ئاژەڵ و ئادەمیزادیش دابین ئەبێت .

هەر ئەم خۆڵە هەزاران کانزای تێدایە کە مرۆۋ بەرهەمی ئەهێنێ بۆ پێویستیەکانی ژیان و پێشکەوتنی شارستانیەت .

ئایا ئەمە بە ڕێکەوت دروست بووە ؟ لە خۆیەوە دروست بووە ؟

ئەگەر زەوی کەمێك لە خۆر نزیك تر بوایە ..گەرما وای ئەکرد ژیان نەئەما ئەگەر کەمێ دوور تر بوایە سەرما وای ئەکرد ژیان نەمێنێ .

ئایا ئەمەش هەر بە ڕێکەوت بوو ؟ ...

پرۆتین مادەیەکی سەرەکی‌یە لە هەموو خانەیەکی زیندوودا لە پێنج گاز پێك هاتووە (کاربۆن ، هایدرۆجین ، نایترۆجین ، ئۆکسجین ، کبریت ) ژمارەی گەردیلەکان لە بچووکترین بەشی پرۆتین دا (٤٠,٠٠٠) چل هەزار گەردیلەیە ، بە مەرجێك گازە سروشتی‌یەکان لە سروشت دا ٩٢ نەوەدو دوو گازە ، ئەی بۆچی تەنها ئەم پێنجەیان بوون بە هۆی دروست بوونی خانەکان ، خۆئەگەر گازێکیان ناتەواو بوایە خانەکان نەئەژیان ، یان گازێکی تریان لەگەڵ بوایە خانەکان ژەهراوی ئەبوون و ئەمردن ، ئایا ئەمەش بە ڕێکەوت بوو ؟

یان بەدەستی پەروەردگار نەخشەی هەموویان کێشراوە !!

زانای بەناوبانگی سویسری لە زانستی بیرکاری‌دا (تشارلز یوجین جای) ئەڵێ:
ئەگەر بمانەوێ بچووکترین بەشە پرۆتین (جُزَیء) دروست بکەین بە ڕێکەوت .

پێویستە ئەو مادانە ١٠ $^{١٦٠}$ واتە : دە توان سەدو شەست ، ئەوەندە جار تێکەڵ بکرێنەوە ئەگەر دروستیش بێت .

هــەروەها زانــای ئینگلیــزی /ب: لیثــر / B.Leathes ئــەڵێ : ئــەو ڕێگایانــەی گەردیلەکان ڕاهاتوون لەسـەری بـۆ پێك هێنانی بـچووکترین بەشە پـڕۆتین ١٠ [٤٨] واتـە: دە توان چل و هەشت ڕێگایە ئایا ئەمەش بە ڕێکەوتە؟

ئەگەر ئەم بەشە پڕۆتینەش دروست کرا ، بیێ گیانـە بـەڵام کـێ ئـەیکات بـە گیـان دار؟ بەڵێ ئەو نهێنییەیە کە گیانی تێ ئەکا ئێمە هیچی لێ نازانین ئەو ئەقڵەیە کە کۆتایی نیە ئـەویش پـەروەردگارە ، ئـەو بەشـە بـچووکە پڕۆتینـە پێویـستی بـە پێـنج گـاز هەیـەو پێویـستی بـەو هـەموو ڕێگایـە هەیـە تـاکو یـەك ئـەگرن ١٠ [١٦٠] یـان ١٠ [٤٨] ئینجـا کـە دروستیش بوو بێ گیانە و بە ڕەزامەندی و توانای پەروەردگار خۆی گیانی تـێ ئـەکاو نهێنی ژیانی پێ ئەبەخشێ ئایا ئەمانەش بە ڕێکەوت بوو، لە خۆیەوە بوو ؟؟ ..

بەڵێ موسڵمانانی ئەمڕۆ (زانایانی ئەمڕۆ) ئـەبێ لـە هـەموو کاتێك زیـاتر باوەڕیـان هـەبێت بـە پـەروەردگارو دڵنیـا بـن لـە فـەرموودەکانی لـە قورئـانی پـیرۆزدا هـەروەکو فەرموویـەتی : ﴿**ومن الناسِ والدواب والأنعامِ مختلف ألْوانه كَذَلك إنما يخشى الله من عباده العلماءُ إن الله عزيز غَفُور**﴾ **(فاطر:٢٨) .**

ڕاستە قورئانی پیرۆز –زانستێکی لەبن نەهاتووەو دوورە لەو بیروباوەڕانەوە لە کۆندا تێکەڵیان کردبوو بە ئاینی ئیسلام .هەروەکو ئەیان ووت :

**زەوی لەسەر پشتی گایە ،گا لەسەر پشتی ماسی یە ، ماسی لە دەریادایە .**

گومانی تێدا نی یە ئەمەو هەزاران بیروباوەڕو داستانی پڕو پووچ تێکەڵ بەم ئایینە پیرۆزە کراوە لەلایەن دوژمنەکانی یەوە بۆ ئەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بە دواکەوتوو لە قەڵەم بدرێت .

ئیتر ئەوەیان لەبیر چووە کە ١٤٢٠ ساڵ زیاترە زانستی قورئان هێشتا سەدەی بیست ویەکەمی نەگەیشتووەتێ .

**کەوابوو:** قورئـانی پـیرۆز بـۆ ئـەوە نـەهاتووە موسـڵمانان لـە قـوژبنێکی ماڵـەوە یـان مزگـەوت دا بـە ئـاوازەوە بیخوێننـەوە بـەبێ ئـەوەی لـە ماناکـەی تـێ بگـەن ، بـەڵکو

زانستێکە لەسەرووی هەموو زانستەکانەوە ، پێویستە چەکێك بێت بۆ ڕاپەڕینی ئیسلامی دژی داگیرکەرو ستەم کاران .

ئەگەر تەنها نوێژو ڕۆژوو حەج و زەکات و خوێندنی قورئان و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان ئیسلامیەت بێت ئەوا لە ئاستێکدا ئاینەکە ڕادەوەستێت و گەشە ناکات و بیرلە دروست کراوەکانی پەروەردگار ناکەنەوە و کوێرانە خواپەرست ئەبن خواپەرستیش زانیاریانە بێت جێگای متمانە و باوەڕەو دوژمنانی ئیسلام و پەروەردگار ناتوانن بەرامبەر ئەم ئاینە پیرۆزە مل ملانێ بکەن .

هەر لەبەر ئەوەیە پێغەمبەرمان محمد (د.خ) فەرموویەتی: ﴿من سلك طريقاً إلتمس فيه علماً سهلَ ا له به طريقاً ا ا نة ﴾ مسلم گێڕاویەتەوە .

هەروەها فەرموویەتی : ﴿فَضلُ العا على العابد كفضلى على أدناكم رجـلاً ﴾ الترمذی گێڕاویەتی یەوە .

کەوابوو زانست گرنگە خواپەرستی بەبێ زانست کوێرانەیە ، هەر لەبەر ئەوەیە هەموو زانیاریەك دەربارەی ئەم گەردوونە لە قورئانی پیرۆزدا باس کراوە .

زۆر بە داخەوە ماوەیەکی زۆر موسڵمانان زانستی قورئانیان فەرامۆش کرد بەڵام دوژمنانی ئیسلام بایەخی تەواویان بە زانست دا .

بۆیە ئەوان بوون بە خاوەنی هەموو جۆرە پیشەسازی و چەکێکی پێش کەوتوو توانیان دەست بگرن بەسەر ئاوو خاك و خەیرو بەرەکەت وسامانی موسڵمانان دا ، موسڵمانانیش لە جێگەی خۆیانەوە مانەوەو تەنها خواپەرستیان کرد و لایەنی دووەم کە زانستی قورئانە فەرامۆشیان کرد .

ئایا هۆی ئەم کارە کەم وکوڕی موسڵمانانی پێشوو بوو یان موسڵمانانی ئەم سەردەمەی ئێستا ؟

لێرەدا ئەتوانین بڵێین هەردوولا کەم تەرخەمیان کردووە.. چونکە بە ڕاستی بەبێ کەم وکوڕی پەیڕەوی قورئانی پیرۆز نەکراوەو زانستی قورئانی فەرامۆش کراوە و دوژمنانی ئیسلام سوودیان لە زانستی قورئان وەرگرتووە ، چونکە هەرچی دۆزینەوەکانیان هەیە لە گەردوون دا ، لە قورئانی پیرۆزدا باس کراوە !!

ئەمەش لەم كتێبەدا ڕوون ئەكەینەوە .

قُل انظُروا ماذَا في السماوات والأرض وما تغنِي الْآيات والنذُر عن قَـومٍ لا يؤمنـونَ  (يونس:١٠١)

واتە : بڵێ تەماشاكەن بزانن ئاسمانەكان وزەوی چیان تێدایە .

هەروەها پەروەردگار فەرموویەتی :

يا معشر الْجِن والْأنس إِن استطَعتم أَنْ تنفُذُوا من أَقْطَارِ السماوات والْـأَرض فَانفُـذُوا لا تنفُذُونَ إِلا بِسلْطَانٍ﴾ (الرحمن:٣٣)

واتە : ئەی دەستەی جن و ئادەمیزاد ئەگەر ئەتوانن لە زەوی و ئاسمانەكان بڕۆنە دەرەوە بڕۆن ناتوانن بەهۆی دەسەڵات وهێزێكەوە نەبێت . تاكو ماوەیەك لەمەوبەر موسڵمانان بیریان لەم ئایەتە پیرۆزە نەكردبووە وە بەڵكو هەركەس باسی ڕۆیشتنی بۆ مانگ و ئەستێرەكان بكردایە هەندێ بەناو زانایانی ئاینی بە كفرو ئیلحادیان دائەنا .

ئایا ئەم ئایەتە پیرۆزە باسی فڕین ناكات بۆ ئاسمانەكان ؟

ئایا شەوڕەوی پێغەمبەرمان محمد (د.خ) ناهێنێتەوە یاد كە بەدەسەڵاتی پەروەردگار فڕی بۆ ئاسمانەكان ؟

پێغەمبەرمان (د.خ) فەرموویەتی :

وجیءَ بمفاتیح كنوز الارض فَوضعت بين يدی﴾ واتە: (كلیلی گەنجینەكانی زەویان بۆ هێنام و خرایە بەر هەردوو دەستم) . پێشینان خوایان لێ ڕازی بێت وایان زانیوە مەبەست لە گەنجینەكانی كیسراو قەیسەرو قارون وئەوانی ترە .

بەڵكو مەبەست لە گەنجینەكانی ناخی زەوی یە كە پەروەردگار ئامادەی كردوون بۆ سوودی ئادەمیزاد وەكو : كانزاكانی، نەوت ، ئاڵتون ، زیو ، ئەڵماس ، لۆلۆ ، مەرجان و گەوهەر ، هتد ...

پەروەردگار ڕۆحی كردە ماددەوەو نەخشەی كێشا بە نەخشەی گەورەیی خۆی تاكو دیاردەیەك بێت واتە نیشانەیەك بێت لەسەر گەورەیی و بە توانایی پەروەردگار...

لەبەر ئەوە مادده پیرۆزەو شارستانیەت و پێشكەوتنی مرۆڤایەتی دروست دەكات .

ئەگەر مادده بە تەنها بوایە ژیان نەئەبوو ، ئەگەر ڕۆح بەتەنها بوایە چی بۆ ئەکرا ؟
بەلاّم ڕۆح ومادده بەیەکەوە ئەوەیان دروست کرد کە پەروەردگار پیّ ی خۆشەو ژیان پێویستی یەتی .

کەوابوو زانست خواپەرستی‌یەو پلەیەکی بەرزی خواپەرستی یە .ئەگەر موسڵمانان زانست خوازنەبن چۆن ئازاد ئەبن؟ چۆن سەرئەکەون بەسەر ئەو دوژمنانەیاندا کە بەهۆی زانستەوە بەهێز بوون و دەسەلاّتیان پەیدا کرد .

کەوابوو خواپەرستی وزانست بەیەکەوە زامنن بۆ سەرکەوتنی موسڵمانان لەهەموو بوارێکدا .

## ئاسمان

ئەگەر تەماشای ئاسمان بکەین لەهەر شوێنێکی ئەرزەوە نزیکەی دوو تا سێ هەزار ئەستێرە دیارە ، نزیکەی چواردە سەدە لەمەو پێش زاناکانی گەردوون وایان ئەزانی کە زەوی پاشای گەردوونەو ڕۆژو ئەستێرەکان ومانگ وان بەدەوری دا و بازنەیەکە سەرەوەی ڕۆژەو ژێرەوەی شەو.

بەڵام ئەمە زانیاریەکی کەم بوو دەربارەی گەردوون تاکو هاتنە خوارەوەی قورئانی پیرۆز :

إن الله يمسِك السماوات والأرض أنْ تزولا ولئن زالَتا إنْ أمسكَهما من أحد من بعده إنـه كانَ حليماً غَفُوراً ﴾(فاطر:٤١).

لەم ئایەتە پیرۆزەدا ، دەرئەکەوێ کە پەروەردگار ئاسمانەکان و زەوی ڕاگرتووە ناهێڵێ تێك بچن، هیچ کەسێك یان دەسەلأتێك نیە توانای ئەو ڕاگرتنەی هەبێت، ئەگەر ڕای نەگرتن و تێك چوون کەس نیە نەهێڵێ و تەنها خۆی توانای هەیەو دروست کەری هەموو شتێکە و تەنها ئەو حلمی هەیە و لێ بووردەیە .

ئەم ئایەتە پیرۆزە بەم شێوەیە ماناکەی مایەوە تاکو ئەم سەدەیەی ئێستا بەهۆی تەلەسکۆبە پێش کەووتوەکانەوە بۆ زانایان دەرکەوت کە زەوی یەکێکە لەو نۆ ئەستێرەیەی کە بە خێرایی یەکی جیاواز بە دەوری خۆیان دا ئەسوڕێنەوەو هەروەها بەدەوری خۆردا ئەسوڕێنەوە .

ئەستێرەکانیشی ئەمانەن : ( مانگ ، زەوی ، زوهرە ، مشتری ، زوحەل ، عگارد ، نبتون ، بلۆتۆ ، ئۆرانۆس ) . ئەم کۆمەڵە ئەستێرەیە کە پێیان ئەڵێن کۆمەڵەی خۆر دەیان ملیار ئەستێرەو خۆری تریش کە زاناکان ئەڵێن ١٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠ سەد هەزار ملیۆن ئەستێرەن واتە سەد ملیار ئەستێرەن ئەو هێڵە فراوانەی ناوەڕاستی ئاسمانن کە پێ ی ئەڵێن (گومەزی ئاسمان) یان ڕێگەی کاکێشان (درب التبانە) و پێ ی دەڵێن (المجرە) واتە گەلە ئەستێرە .

زاناکان ئەڵێن (مَجَرَّة) یان گەلە ئەستێرە ، بازنەیەکی هێلکەیی یە تەوەرەی هەیە (قطر)، بەرزی هەیە ماوەی تەوەرەکەی دە ئەوەندەی بەرزیەکەیەتی .

**هەروەها ئەڵێن تەوەرەی گەلە ئەستێرەی (کاکێشان) سەد هەزار ١٠٠,٠٠٠ ساڵی ڕوناکی‌یە ، کە یەك ساڵی ڕوناکی شەش ملیۆن ملیۆن میلە ، کەوابوو ئەم تەوەرەیە هەمووی شەش سەد هەزار ملیۆن ملیۆن میلە ، خۆرو زەوی وهەشت ئەستێرەکانی تریش ٣٠,٠٠٠ سی هەزار ساڵی ڕوناکی لە ناوەڕاستی ئەم گەلە ئەستێرەیەوە دوورن، ٢٠,٠٠٠بیست هەزار ساڵی ڕووناکی لە نزیکترین شوێنەوە کە ئەکەوێتە لای بەرزیەکەیەوە نزیك ناوەڕاستەکەی دوورن .**

**بڕوانە وێنەی ژمارە (١) گەلە ئەستێرەی (کاکێشان )و شوێنی کۆمەڵەی خۆر لەم گەلە ئەستێرەیەدا.**



**وێنەی ژمارە (١) (گەلەئەستێرەی کاکێشان )و شوێنی کۆمەڵەی خۆر**

**بەگوێرەی نەخشەی ( هیرشل )**

**لەڕوانگەی ( یرکس )**

کەوا بوو گەلە ئەستێرەی کاکێشان زۆر گەورەیە ، بەڵام ئایا لە ئاسمانەکاندا تەنها ئەم گەلە ئەستێرەیە هەیە ؟

زاناکانی گەردوون ناسی توانیویانە تاکوو ئێستا حەفتاو پێنج ملیۆن گەلە ئەستێرەی وەك ئەم گەلە ئەستێرەی کاکێشانە بدۆزنەوە ،هەندێکیان زۆر زۆر لەم گەلە ئەستێرەیە گەورەترن .

گەلە ئەستێرەیان هەیە دە جار لەم گەلە ئەستێرەیەی ئێمە گەورەترە سەدو پەنجا هەزار ساڵی ڕووناکی بگرە زۆر زیاتریش دووری تەوەرەکەیەتی .

ئەم هەموو مانگ و خۆرو ئەستێرانەی ئەو گەلە ئەستێرانەیان پێك هێناوە لەو ڕۆژەوە پەروەردگار دروستی کردون زۆر بە خێرایی بە دەوری خۆیان داو خۆرەکان دا ئەسوڕێنەوەو زۆر بەخێرایی بە بۆشایی گەردوون دا بەردەوام ئەڕۆن بەڕێوە بە یاسایەکی ڕێك وپێك وزۆر ووردەکاری بە بێ ئەوەی یەکێکیان لە خولگەو ڕێڕەوی خۆی لابدات .

ئایا گەردون تەنها ئەم گەلە ئەستێرانەی تێدایە ؟ نەخێر زاناکان لەسەر ڕۆشنایی زانستی نوێ ئەڵێن :

گەردوون شتی زۆری تێدایە گەلە ئەستێرەکان ژمارەیان لە حەفتاو پێنج ملیۆن بووە بە سەد ملێۆن گەلە ئەستێرە . کە بە دووربینی ڕوانگەی چیای (وڵسون) لە ڕۆژ ئاوای ووڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دانراوە ئەبینرێن .ئەم دووربینە ئاوێنەکەی سەد بۆصە پانەو زاناکان ئەڵێن ئەگەر بمانەوێت هەموو گەلە ئەستێرەکانی ئاسمانەکان ببینن پێویستمان بە دووربینێك هەیە کە ماوەی پێنج سەد ملیۆن ساڵی ڕووناکی شتی پێ ببینین ئینجا ئەتوانین بزانین ئەم گەردوونە چی تێدایە و پەروەردگار چی درووست کردووە . ئەمە تەنها لە توانای خۆی دایە .

( أدوين هبل ) زاناى فەلەكى ئەمريكى ئەڵێ :

ئەوەندە گەلە ئەستيرە لە گەردوون دا هەيە لە سەد مليار تێپەڕ ئەكەن . هەروەها ئەڵێ: ئەگەر دوور بينى باشترهەبێت و زانست زياتر پێش بكەوێت گەلە ئەستێرەكان لەم ژمارەيە تێپەڕ ئەكەن زۆر زۆريش .

كەوا بوو زانايان وزانست هێشتا وان لە سەرەتاى زانيارى داو زۆر زۆر كەمێ زانست لە سەر زەوى هەيە .

﴿وما أوتيتم من العلم ألا قليلا ﴾ سورەتى الاسراء ئايەتى ٨٥

واتە كەمێك نەبێت زانستمان پێنەداون.

لێرەدا پێويستە باسى ئاسمان و ئاسمانەكان بوەستێنين و كەمێك باسى ڕاستى يەكان بكەين .

(( دۆزينەوەى ڕاستى يەكان ))

زانايانى سروشت بە ڕێگەى ڕانومايى ڕاستى يەكان ئەسەلمێنن ئەمەش بە بەڵگەكانيان دەرى ئەخەن .

## بە دوو ڕێگە ڕاستى يەكان ئەسەلمێنن :

### أ/ بە تاقى كردنەوە

### ب/ بە بەڵگە

بە تاقى كردنەوە ، هەروەكوو شيتاڵ كردنەوەى ئاو بە كارەبايى ئەيسەلمێنن كە ئاو بريتى‌يە لە يەك گەرديلە ئۆكسجين و دوو گەرديلە هيدروجين و يەكيان گرتووە بە هۆى چەند گۆڕانێكى كيمياوى يەوە . لە وانەيە پرسيار بكەن لێرەدا ،ئايا دەورى ئەقڵ چى يە كە بە تاقى كردنەوە ڕاستى بسەلمێنێ؟

بەڵێ ئەقڵ دەورى خۆى هەيە ئەويش ئەوەيە ئەگەر زانيت تاقى كردنەوەكە ئەنجام بدەيت و زانيت بەشێكى كەم لە ئاو بەم جۆرە دروست بووە ، چونكە ئاوەكان لە هەموو سيفەتێك دا وەكو يەك وان ،ئەمە ڕێگەيەكى ئەقڵى يە زانست گرتوويەتە بەر بۆ بلاّو كردنەوەى ئەو ڕاستيانەى ئەيدۆزێتەوە .

بەلاَم دۆزینەوەی ڕاستی یەکان بە بەڵگە :

ئەمەش یەکخستنی ئەنجامی تاقی کردنەوەکانە بەیەکەوەو دەرخستنی ئەنجامێکی ڕاستە لە بارەی ئەو شتەوە کە ئەیانەوێ بیزانن :

بۆ نموونە :کە ئەڵێن زەوی خڕە تاقی کردنەوەی زۆری لە سەرکراوە :

## لەوانەش :

کاتێ گەڕۆکەکانی بۆشایی ئاسمان توانیان تەماشای زەوی بکەن لە بەرامبەری خۆیانەوە پاشان سووڕانەوە بۆ ڕووی دووەم دیسانەوە بۆ ڕووی سێ یەم ئینجا بۆیان دەرکەوت و توانیان بڵێن زەوی خڕە .

لێرەدا ئەقڵ دەوری خۆی بینی چوونکە لە ئەنجامی ئەو تاقی کردنەوانە ئەقڵ بڕیاری دا کە زەوی خڕە .

زۆر جاریش ئەقڵ خۆی ڕاستی ئەدۆزێتەوە بە بەڵگە بۆ نموونە: زانای بەناوبانگی فیزیا (أسحاق نیوتن ) هێزی ڕاکێشانی (قوة الجاذبیة) دۆزیەوە بە وورد بوونەوەی لە سووڕانەوەی ئەستێرەکان و کەوتنەخوارەوەی میوەی درەختەکان و بەر بوونەوەی هەر تەنێك هەڵی دەی بۆ سەرەوە بەرەو خوار دێتەوە کەوا بوو لە هەمووحاڵەتەکان دا ئەقڵ دەوری خۆی بینی و بە ئەقڵ ئەو ڕاستی یانە دۆزرانەوە کەوابوو زانست متمانە ئەکاتە سەر بەڵگەو ئەقڵ بۆ دۆزینەوەی ڕاستی یەکان (ئەوانەی هەستیان پێ ناکەین).

کەوابوو : بۆچی زانست بۆی هەیە متمانە بخاتە سەر ئەقڵ بۆ دۆزینەوەی ڕاستی یە هەست پێ نەکراوەکان ؟

ئەی بۆچی ئاین بۆی نەبێ پێ ی بووترێ زانستخواز هەر چەندە بە ئەقڵ وبە بەڵگە ڕاستی یە هەست پێ نەکراوەکان دەرئەخات ؟

مادی یەکان ئەڵێن هەرچی هەستی پێ نەکرێ باوەڕمان پێ ی نی یە !!!

ئێمە دیسانەوە ئەڵێین بۆچی باوەڕمان بە هێزی ڕاکێشان هەیە دیاریش نی یەو هەستی پێ ناکرێ

لەوانەیە بڵێن ئەم هێزە دیارەو تەنەکان ڕائەکێشێ بەلاَم پەروەردگار دیار نی یە و هەستی پێ ناکرێ !!!

ئێمه ئەڵێین ئەگەر یەکێکیان بەناو بەفردا ڕۆیشت و بزربوو یەکێکی تریش دوای ئەو تەماشای بەفرەکەی کرد هەرچەندە ڕۆیشتووەکە دیاریش نەبێت ئەزانیٚ کە یەکێك بەناو بەفرەکەدا ڕۆیشتووە بێگومان بە جێگە پێکانیدا

ئایا جێگە دەستی پەروەردگار لەم گەردوونەدا لە دروست کراوەکانیدا دیار نی یە؟

**پرۆفیسۆر( أ-ی-ماندیر ) ئەڵیٚ :**

ئەو ڕاستیانەی ڕاستەوخۆ ئەیانبینین پیٚ یان ئەڵێین (ڕاستی‌یە هەست پیٚ کراوەکان) واتە (الحقائق المحسوسة) بەڵام ڕاستی یەکان تەنها هەست پیٚ کراوەکان نین بەڵکو ڕاستی‌یە دەرهاتووەکانیش هەیە ، واتە ئەو ڕاستیانەی هەستیان پیٚ ناکەین و نایان بینین ، بەڵکو بەهۆی تەماشاکردن وبیرکردنەوە یان دەرهێنانەوە هەستیان پیٚ ئەکەین زانست ئێستا وازی هێناوە لەوانەی هەستیان پیٚ ئەکریٚ چونکە دیارەو ئاشکرایە ، بەڵام ئەگەڕیٚ بەشوێنی ئەو ڕاستیانەدا هەستیان پیٚ ناکریٚ ، بە تەماشا کردن و بیرکردنەوە ئەبیٚ ئەو ڕاستیانە دەربێنین ، هەروەکو زانستی ئاینی ئەم ڕێگایەی گرتووەتە بەر ئەویش ڕێگای خواناسینە ، إسحاق نیوتن هێزی ڕاکێشانی بەم جۆرە دۆزی‌یەوە ، نەك بە هەست کردن وبینینی ئەم هێزە.

**( پەروەردگار یان مادده )**

## سیٚ جۆر قوتابخانەی فەلسەفە هەیە :

**١-قوتابخانەی ئیلاهی**

**٢-قوتابخانەی واقعی ماددی**

**٣-قوتابخانەی میثالی**

* میثالی یەکان فەلسەفەکەیان پڕو پوچە و زانست بە درۆی خستۆتەوە چونکە ئەمانە ئەڵێن :

گەردوون مادده نی یە و شتێکی خەیاڵی یە و هەموو شتێك لە بوون و بوونەوەر خەیاڵین هەتاکو ئادەمیزادیش

ئەمانە دەمێکە ئاشیان لەگەڕ وەستاوەو زانست دەری خستووە گەردوون و بوون و بوونەوەر چین.

* مادی یەکان ئەڵێن زانست دەری خستووە گەردوون مادەیەو هەستی پێ ئەکرێ و دوورە لە ئەقڵەوەو بە ڕێکەوت درووست بووە !!!

* فەلسەفەی ئیلاهی ئەڵێ:گەردوون مادەیە بەلاّم دروست کراوە و یاسایەکی ڕێک وپێکی هەیەو بە ئەندازەیەکی سەرسوڕ هێنەر هێزێکی زۆر بە دەسەلاّت و بە توانا دروستی کردووە . ئەویش پەروەردگارە .

* کەوابوو ... بۆچی مادی یەکان تەنها لەگەڵ میثالی یەکان بەربەرەکانی ئەکەن .

تەنها لەبەرئەوەیە فەلسەفەی ئیلاهی بەفەلسەفە نازانن . هەروەها زۆر بە ئاسانی فەلسەفەی میثالی یەکان یان بەزاندووە ئیتر خۆیان بە ڕاست ئەزانن وا ئەزانن هیچ فەلسەفەیەکی تر نی یە ململانێ یان بکات . بەلاّم وانی یە .هەردوو فەلسەفەی مادی و میثالی با چاك بزانن : فەلسەفەی ئیلاهی فەلسەفەیەو ململانێ ی ئەوان ئەکات وبیرو بۆچوونی خۆی هەیە پێویستە بیسەلمێنین :

یەکەم جار پرسیارێك دەکەین لە میثالی یەکان و ئەڵێین :

**کێ ئەم گەردوونەی دروست کرد ؟**

ئەوان لەوەلاّمدا دەڵێن :گەردوون دروست کراو نیەوشتێکی خەیاڵی یەو هەموو بوونەوەران وئادەمیزاد ئەمانە شتی وەهمین .

لێرەدا فەلسەفەی ئیلاهی پرسیار ئەکات وئەڵێ : ئەگەر سەردانی نەخۆشخانەیەك بکەین وچەند کەسێکمان دی بە کارەساتی ئۆتۆمبیل هەندێکیان مردوون و هەندێکیان بریندارو هەندێکیان دەست یان قاچیان شکاوە یان پەڕیوە .. ئەگەر هەموو شتێك خەیاڵی بێت چۆن بە خەیاڵ ئەو خەڵکە وای لێ هات ؟ ئێوە فەرموون بە خەیاڵ قاچی مێروولەیەك بشکێنن !!!

کەوا بوو ئەم فەلسەفەیە خۆی وەهم و خەیاڵەو ئاشی لەگەڕ کەوتووەو بەتاڵە.

مادی‌یەکان خۆیان لە میثالی یةکان بەباشتر ئەزانن وئەڵێن :
گەردوون مادەیەو بە ڕێکەوت دروست بووە خۆی خۆی ئەبات بەڕێوەو خاوەنی نی یە. ئەگەر هەموو دروست کراوێك دروست کەرێکی هەبێ ئەی پەروەردگار کێ دروستی کردووە ؟
**( لێرەدا فەلسەفەی ئیلاهی وەلامیان ئەداتەوە )**
گەردوون دروست کراوی پەروەردگارە و پەروەردگار (ئەزەلی) یەو دروست کەری نی یە و سەرەتای نی یە و کۆتایی نی یە .
دروست کەری گەردوون و بوون وبوونەوەرە ڕێکخەرو ڕاهێنەروڕاگری هەموو گەردوونەو ڕۆشنایی هەموو ئاسمانەکان و زەوی یە .
﴿الله نور السموات والارض﴾ (النور ٣٥) . واتە : پەروەردگار ڕووناکی ئاسمانەکان و زەوی یە .
لەبەشەکانی داهاتووی ئەم کتێبەدا بۆمان دەرئەکەوێ ئەو ڕووناکی یە کامەیە.
دیسانەوە مادی‌یەکان ئەڵێن :
بۆچی بە شتێك بڵێین (ئەزەلی) هەستی پێ ناکەین .
بۆچی بە گەردوون نەڵێین ئەزەلی هەستی پێ ئەکەین ومادەیە ؟
لێرەدا بۆمان دەرکەوت کە لە هەردوو فەلسەفەی میثالی ومادی دا ئەزەلیەت هەیە .
ئیلاهی یەکان ئەڵێن : پەروەردگار ئەزەلی یە.
مادی یەکان ئەڵێن : گەردوون ومادە ئەزەلین . لێرەدا پرسیارێك ئەکەین لە مادی یەکان :
ئایا مادەیەك بێ ئەقڵ وبێ زمان و بێ چاو بێ گوێ ئەبێت ئەزەلی بێت وخاوەنی هەموو شتێك بێت و دروست کەری هەموو بوونەوەرێك بێت ؟
کەوابوو بەردێکی ڕەق ئەبێ لەهەموو زانایانی جیهان ئاقڵ تر بێت .
ئەمە بە ڕای من . بەلام با بزانین زانست چی ئەڵێ لەم بارەیەوە :
..زاناکانی گەردوون ناسی ئەڵێن : گەردوون لە ئەنجامی :

**١-تەقینەوەیەکی گەورە دروست بووە کە ٥٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠ پێنج بلیۆن یان پێنج هەزار ملیار ساڵ لەمەو پێش ڕووی داوە .کەوا بوو لێرەدا زانست دەری خستووە گەردوون ئەزەلی نیە چونکە ئەزەلی سەرەتای دروست بوونی نیە بەلاّم زاناکان سەرەتای دروست بوونی گەردوونیان دیاری کردووە .**

**٢-یاسای دووەمی گەرمای دایناميکی یان یاسای ووزەی ئامادە یان یاسای ووزەی رەخسێنراوLaw of Entropy ئەڵێت :**

**گەیشتنی گەرما بەردەوامە لە نێوان تەنە جیاوازە گەرمەکاندا ئەگەر ..ڕادەی گەرما یەکسان بوو لەم تەنانەدا . گواستنەوەی گەرما ئەوەستیٚ و ئیش کردن نامێنیٚ بەلاّم ئێستا تەنە گەردوونی یەکان لە گەورەو لە بچووکیان گواستنەوەی گەرما لە نێوانیاندا هەیە وە ڕۆژێك دێت گەرمایی هەموویان یەکسان دەبێت و هەموو شتێك کۆتایی دێت و لەکاردەکەوێت .**

**کەوابوو : گەیاندنی گەرمایی لە نێوان تەنەکاندا لە کاتێکی دیاری یەوە دەستی پیٚ کردووە و لە کاتێکی تریش دا کۆتایی دێت .**

**واتە: گەردوون ئەزەلی نی یە .چونکە بۆمان دەرکەوت گەردوون سەرەتای دروست بوونی هەیەو هەروەها کۆتایی دێت ، بەلاّم ئەزەلی سەرەتای دروست بوونی نی یەو کۆتایی نایەت واتە پەروەردگار ئەزەلی یە نەوەك گەردوون .**

**زانای سروشتی (جیمس جینز) ئەڵیٚ : زانستی سروشتی باوەڕی وایە کرداری گۆڕانی گەرما بەردەوام ئەبێت تاکو ووزەی بەتەواوی کۆتایی دێت، وەئەم کردارە هێشتا نەگەیشتوەتە پلەی کۆتایی ووزە ، ئەگینا ئێمە ئێستا لەسەر ئەم زەوی یە نەئەبووین تاکو بیری لیٚ بکەینەوە !!**

**کەوابوو: دەست پیٚ کردنی کرداری گۆڕانی گەرما لە کاتێکەوە دەستی پیٚ کردووە، کاتێکیش ئەبێت کۆتایی دێت واتە گەردوون ئەزەلی نی یە .**

**لەوانەیە هەندیٚ کەس پرسیار بکەن و بڵێن:**

ئەگەر گەردوون لە ئەنجام دا سارد بێتەوەو بفەوتێ کەوابوو ئەو یاسا زانستی‌یەی ئەڵێت مادە نافەوتێ و لە نەبوون دروست نابێت وەڵامی چی یە ؟

هەمان زانای سروشتی واتە (جیمس جینز) وەڵام ئەداتەوە ئەڵێ :

ڕاستە ووزەو ماددە نافەوتێن بەڵام ئەگۆڕێن لە شێوەیەکەوە بۆ شێوەیەکی تر واتە بەم شێوەیەی ئێستای نامێنێ و پەروەردگار بە شێوەیەکی تر دروستی ئەکاتەوە ، وەلە هەموو گۆڕانێکدا وێنەی ووزەو گەرمایی ئەگۆڕێت وبەم جۆرە ئەبینین گەردوون بەرەو مردن ئەڕوات و کۆتایی دێت .

لێرەدا بۆمان دەرکەوت گەردوون سەرەتای دروست بوونی هەیە وکاتێکیش دێت کۆتایی دێ ، بەڵام ماددە و ووزە نافەوتێن پەروەردگار خۆی ئەزانێ چی تر دروست ئەکات لەو مادەیەو لەو ووزەیە !!!

٣-لە گەردوون دا هەندێ ڕەگەزی ماددە هەن پێیان ئەڵێن : (النَّظائر المُشِعة) ئەم ڕەگەزانە تیشکی ئەلەکترۆنی ئەدەنەوەو ئەگۆڕێن بە ڕەگەزێکی تازە کە زۆر جیاوازە لە ئەسڵەکەی خۆی وەکو ڕەگەزی (الترتیوم) کە تیشك ئەداتەوەو تیشکەکەی پێ ی دەڵێن تیشکی (بیتا)و گۆڕاوە بە مادەیەکی تری جیاواز پێ ی دەڵێن (نظیر الهلیوم) واتە هاوشێوەی هیلیوم ، هەروەها ڕەگەزی (یورانیوم) تیشکی (گاماو الفاو بێتا) ئەداتەوە ئەگۆڕێ بۆ ڕەگەزی (ڕادیۆم) ئەمیش دوایی ئەگۆڕێ و ئەبێ بە(رصاص) واتە قورقوشم .

لێرەدا دیسانەوە دەرئەکەوێ گەردوون ئەزەلی نیە چونکە ئەگەر ئەزەلی بوایە دەمێك بوو ئەو ڕەگەزانە لە تیشك دانەوە کەوتبوون و تیشك دانەوەیان تەواو بوبوو ، واتە سکوتیان کردبوو ..تیشك دانەوەیان تاکو ئێستا بەڵگەی دروست بوونی مادەکەیانە لەلایەن پەروەردگارەوە .

٤-زانایانی گەردوون ناسی ئاشکرایان کرد کەزۆربەی ئەستێرەکان بە بەردەوامی دوور ئەکەونەوە لە یەکترو توانیان دووری نێوان ئەم ئەستێرانە پێوانە بکەن . (لەبەشەکانی داهاتوودا ئەم دووریانە دیاری ئەکەین) ئەمەش ئەیسەلمێنێ گەردوون

ئەزەلى نى يە ، چونكە ئەگەر ئەزەلى بوايە ئێستا كەس تواناى پێوانەى دوورى ئەم ئەستێرانەى نەبوو ئەوەندە لەيەكتر دووركەوتبوونەوە .

كەوابوو ديسانەوە بۆمان دەركەوت گەردوون ماوەيەكە دروست بووە -ئەزەلى نيە- ئەوەى دروستى كردووە ئەزەلى يە .

٥- زانايانى گەردوون ناسى بۆيان دەركەوتووە : خۆرو مانگ و زەوى وحەوت ئەستێرەكەى ترى كۆمەڵەى خۆر، زۆر بەخێرايى بەرەو ئەستێرەيەكى زۆردوور ئەڕۆن پىێ ى ئەڵێن (النسر الواقع) ڕۆژێك ئەبێت ئەگەنە ئەم ئەستێرەيەو نازانين چى ڕووئەدات !!!

## لێرەدا پێويستە بڵێين:

﴿ وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍ لَهَا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ ﴾ (يّس: ٣٨)

واتە: خۆر ئەڕوا بەرەو ئارامگاى خۆى ئەمەش فەرمانى پەروەردگارى بەدەسەلآت و بەعزەت و زانايە.

ئەگەر گەردوون ئەزەلى بوايە، زۆردەمێك بوو خۆر گەيشتبووە ئارامگاكەى خۆى لەگەڵ كۆمەڵەكەى خۆىدا.

كەوابوو گەردوون ئەزەلى نيەو دروست كراوى پەروەردگارە.

٦- ئەگەر بڵێين گەردوون ئەزەلى يە....... بابڵێين وايە!!كەوابوو ژيان و هەموو بوونەوەرەكان ئەوانيش ئەزەلين!! ئەمەش وانيە چونكە زانست ئەڵىێ: ژيان لەسەر زەوى هەزار مليۆن ساڵ لەمەوپێش دەستى پىێ كردووە ماددىيەكان خۆيان ئەم راستىيەيان پەسەندكردووەو ئەڵێن ژيان ئەزەلى نيە بەلآم:

(گريمانى ئەزەلى بوونى ژيان جياوازى تەواوى هەيە لەخسوسيەكانى پرۆتۆناتى زيندوو)

ئەمە لەكتێبى (النظرية المادية في المعرفة/ ص١٢٧)دا هاتووە بەم جۆرە:

(إنَّ فَرضية أَزلية الحياة تَجِدُ نَفسها في تناقض مطلق مع خصائص البروتونات الحية).

دیسانەوە دەركەوت ئەگەر گەردوون ئەزەلی بێت ژیانیش ئەزەلی‌یە، بەڵام ماوەیەكی كەمە ژیان دەستی پێكردووە لەسەر زەوی كەوابوو نەژیان و نەگەردوون هیچیان ئەزەلی نین.

لەوانەیە مادی‌یەك بڵێ: بۆیە ماوەیەك دوای دروست بوونی گەردوون ژیان دەستی پێكردووە چونكە ئەوكاتە زەوی گەرم بووەو ساردنەبووەتەوە دوای تەقینەوەی گەورە دروست بووە.......

ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ گەردوون دوای تەقینەوەی گەورە دروست بووە، واتە ئەزەلی نی یە..... بۆیە پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقاً فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حي أَفَلا يُؤْمِنُونَ﴾ (الانبياء:٣٠)

واتە: ئایا ئەوانەی كافربوون نەیان دی ئاسمانەكان و زەوی پێكەوە لكابوون ئێمە لەیەكترمان جیاكردنەوەو لەئاو هەموو شتێكمان زیندووكرد.

لەم دوایی یەدا زانای بەناوبانگ (لابلاس) ئەمەی سەلماندو دانی بەم ڕاستی یەدا ناو ڕاستی ئەم ئایەتە پیرۆزەی پەسەنكرد:

**Have not those who disbelieve known that the heavens and the earth were of onepiece, then we parted them, and we made every living thing of water...** دەقی ئایەتەكە بەئینگلیزی

## دیسانەوە ماددی یەكان هەندێ جار ئەڵێن:

گەردوون خۆی ئەزەلی یەو مەكینەی گەردوون ئەزەلی نیە، ئەم مەكینەیە لەئەزەلەوە كاری نەكردووە بەڵام لەكاتێكدا دەستی كردووە بەكاركردن.

باشە ئەگەر گەردوون ئەزەلی بێت بۆچی مەكینەكەی لەگەڵ خۆی نەكەوتەكارو دوای خست؟ ماددەیەكی بێ ئەقڵ و بێ زمان و بێ هۆش چۆن مەكینەی خۆی دواخست لەبەرچی؟ ئێمە ئەڵێین ئەوە كاری پەروەردگارە ماددەی دروست كردوو پاشان مەكینەكەی خستەكار، چونكە گەردوون ماددەیەو ماددەیش لەبارگەی كارەبایی ساردوگەرم + و – پێك هاتووە هەرگیز ناتوانێ بیربكاتەوەو ئەقڵی نیە مەكینەی خۆی دوابخات لەكاركردندا.

کەوابوو گەردوون و مەکینەکەی ئەزەلی نین و پەروەردگار ئەزەلی یە.

ئەوانە دروستکراوی پەروەردگارن.

لەوانەیە هەندێ لەماددیەکان بڵێن گەردوون دروستکراوە لەمادده گەردوونی یە ئەزەلی‌یەکەی!!! ئێمە پرسیار ئەکەین ئایا مادده خۆی ئەزەلی یە یان شتێکی تری لەگەڵە ئەویش ئەزەلی یە؟ بێ گومان وەڵام ئەدەنەوە ئەڵێن:

(هەموو گەشەکردنێك و پێ گەیشتنێك لەسروشت دا دەری ئەخات سروشت دروست نەکراوەو ئەوەنیشان ئەدات ماددەو جووڵانەوەکەی ئەزەلی یە ئەمەش لە:

(المادية الدياليكتية)دا لاپەڕە (٢٧٨)هاتووە، ئێمەش پرسیار ئەکەین:

ئایا ئەو جووڵانەوەیە لەمادەدا هەیە بریتی لەیاساو ڕێك و پێكی..........یان کوێرانەیە؟

گومانی تێدانی یە ئەوان ئەڵێن: (عشوائیە)واتە کوێرانەیە!! لەخۆیەوەئەبێت هەروەها لەسروشت دا کاریگەری هێزی کوێرانەو بێ ئەقڵ ئەگۆڕێن...

هەمان سەرچاوە ـ لاپەڕە ٢٧٨و ٢٠٩

## ئێمە پرسیاریان لێ ئەکەین:-

ئایا مادده لەسەرەتاوە معقدو بیرکەرەوەبوو یان سادەو بێ ئەقڵ بوو؟ ماددی یەکان وەڵام ئەدەنەوە ئەڵێن: لەسروشت دا ئامانجی ئەقڵ نی یەو تێ گەیشتن نی یە لەمادەدا......هەمان سەرچاوە ـ لاپەڕە /٢٠٩ کەوابوو: مادده ناتوانێ بیربکاتەوە بەڵکو سادەیەو هیچ نازانێت.

واتە: دروست بوونی گەردوون بەم شێوەیە بەو یاساو ووردەکاریەو بەو ئەندازیاری‌یە سەرسوڕهێنەرەوەو بەوبوونەوەرە هەمەجۆرانەوە هۆی چی‌بوو؟ چۆن دروست بوون؟

ماددیەکان ئەڵێن: مادەو جووڵانەوەی بەردەوامی گەردوونیان دروست کرد بەم ڕێك و پێكی یە و بەڕێکەوت دروست بوو.

ئێمە دیسانەوە ئەڵێین:

ڕێکەوت یاسای تایبەتی خۆی هەیەو بناغەی خۆی هەیە لەزانکۆکانی جیهان دا ئەیخوێنن و ئەڵێن:

ئەم گەردوونە هەرگیز بەڕێکەوت دروست نەبووە....

چونکە مرۆڤایەتی سەدان ساڵە ئەگەڕێ بەشوێن یاساکانی گەردوون دا هیچی بۆ دەرنەکەوتووە شایانی باس بێت تەنها ئەوەندە زانست زانیویەتی بەقەدەر دڵۆپە ئاوێك لەئۆقیانوسێك.........

﴿ وَيَسْأَلونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلاً﴾ (الاسراء:٨٥)

واتە: زانستمان بۆنەهێناون کەمێك نەبێت.

هیچ گومانی تێدانی یە زانست زۆرکەمەو هەربەکەمیش ئەمێنێتەوە لەچاوگەردوون داو دروست کراوەکانی پەروەردگارا.

هەمووشتێك یاسایەکی تایبەتی هەیە لەگەردوون دا کەزاناکان لێ ی سەرگەردانن!!!

زانایانی بیرکاری ئەڵێن: هەرگیز گەردوون بەڕێکەوت دروست نەبووە....چونکە بەئەندازەو ژمارەو هەمووجۆرەکانی بیرکاری ئینجا کەمێك لەگەردوون ئەزانین: واتە بەئەقڵ لەگەردوون ئەکۆڵینەوە چونکە گەورەترین ئەقڵ دروستی کردووە ئەگەر گەردوون بەڕێکەوت دروست بوو بۆچی هیچ ئاژاوەو تێك چوونێك لەتەنەکان و جووڵانەوەکانیان دا ڕووی نەدا.

بۆچی بەم شێوە ڕێك و پێکە بەردەوام کاری خۆیان ئەنجام ئەدەن؟

ئایا ڕێکەوت و مادده ئەقڵیان هەیە تاکوو ئەم یاسا ڕێك وپێکە دروست بکەن؟ بێگومان نەخێر... هەروەها ڕێکەوت ناتوانێ بەردەوامی دروست بکات... هەروەکوو مەیموونێك فێری بکەین بەئامێری چاپ شت بنووسێ بۆ نموونە پارچە هەڵبەستێکی بدەینێ و چاپی بکات ئایا ئەوە ئەبێتەهۆی ئەوەی مەیموونەکە ببێ بەشاعیر بەردەوام شت بنووسێ؟ بێ گومان نەخێر ئەم بەردەوامی‌یە دروست نابێت.

بەڵام لەوکاتەوە گەردوون دروست کراوە تاکوو ئێستاو دواتریش جووڵانەوەی بەردەوام لەتەنە گەردوونی یەکاندا هەیەو بەڕێکوپێکی.

لێرەدا بۆمان دەرکەوت ئەقڵ پێش مادەیەو مادە دروستکراوی ئەقڵە........ ئەویش پەروەردگارە.

(ڕای زانست لەڕەگەزەکان و پێك هاتووەکان و مادەکانیان)

ئەگەر مادده هۆی ماددەیە لەگەردوون دا ئایا هۆی ئیش کردن چی یە؟

ئایا ڕاستە هۆی ماددی و هۆی ئیش کردنی گەردوون لەیەك کاتدا بووبێت؟

بێ گومان هۆی ماددی و هۆی ئیش کردن جیاوازن لەیەکتری.......

**بۆ نموونە:**

هۆی ماددی لەکورسی یەکدا دارەکەیەتی....بەڵام هۆی ئیش کردن دارتاشەکەیەتی....

لەبەرئەوە هەموو زانست و دۆزینەوە فیزیاوی یەکان بڕیاریان داوە کەهەموو ڕەوشتەکانی پێك هێنەرو ڕەگەزەکان ڕەووشتیان پێ دراوە ئەتوانین لێیان وەرگرینەوە چونکە خۆیی نی یەو هی خۆیان نەبووە لەسەرەتاوە.

نموونەیەکی تر: شلی ئاو ڕەووشتێکی پێدراوە چونکە ئەتوانین ئەو ڕەوشتەی لێوەرگرینەوە بەشیکردنەوەی بەکارەباو گۆڕینی بۆ گازی ئۆکسجین و هایدرۆجین، هەر ڕەوشتێك بتوانین لای بەرین ئەوە پێ دراوەو خۆیی نی یە.......

زانستی نوێ سەلماندوویەتی کەمادده بریتی یە لەووزەیەکی چڕوخەست ئەتوانین بیگۆڕین بۆ ووزە بەگوێرەی ئەو یاسایەی زانای بەناوبانگ (ئەنیشتاین) دایناوە:

ووزە= مادده × خێرایی تیشك دووجا.

کەوابوو بۆمان دەرکەوت ماددەو ڕەگەزو پێك هێنەرەکانی پێدراون ئەتوانین لایان بەرین و بیگۆڕین.

بەم جۆرە ئەتوانین بڵێین مادده هۆی ئیشکردنی گەردوون نی یە چونکە لەکاروپێك هێنەرەکانی دا جیاوازی هەیە..............

هەرچەندە گەردوون و بوونەوەرەکانی هەمووی لەماددەو ووزە پێك هاتوون............. بەڵام ئەبینین ئەم دووانە ڕەگەزو ماددەی جیاوازیان دروست

کردووه.... ئەگەر هایدرۆجین بەیەکگرتنی ئۆکسجین ئەنجامەکەی دروستبوونی ئاوبێت.

بەڵام ئەگەر کبریت بوو ئەوەهۆی سێیەم کاری کردوەتەسەر ئەم دووهۆیە بۆیە کبریت دروست بوو لەجیاتی ئاو.

ئەم هۆی سێ یەمە ماددی نی یە بەڵکو پەروەردگارە، کەهەموو جۆرەکان و توخمەکانی دروست کردووەو هەموو جیاوازیەکانی دروست کردووە بەجوانترین شێوە ڕێکی خستوون بەتواناو زانست و دەسەڵاتی خۆی، ئەم دۆزینەوەیە بەبەڵگە (الأستدلال) ڕێگەی سێیەمە لەڕێگەی (إستدلال)ی زانستی یەوە.................

هەموو سەلماندنەکانی منطق و ئەقڵ بڕیار لەسەر هەمان ئەنجام دەدەن و ئاقڵەکان ئەڵێن: (هیچت پێ نەبێ ناتوانی شت بدەی بەکەس) کەوابوو ماددەیەك ڕەوشتێك لەم ڕەوشتانەی باسمان کرد نەیبێت ناتوانێت ئەو ڕەوشتانەی بۆ دروست بکات بەبێ هۆیەکی تر کەماددی نەبێت واتە بەبێ دەسەڵاتی پەروەردگار.

کاتێ ماددە ڕەوشتی وەرگرت و گۆڕانی جۆراوجۆری بەسەرهات ئەوەنیشان ئەدات شتێکی غیرمادی ئەم ڕەوشتانەی پێ بەخشی ئەویش پەروەردگارە.

تەنانەت شی کردنەوەی دیالێکتیکی بۆئەم مەسەلەیە بوونی پەروەردگار ئەسەلمێنێ وەکوو: دیالێکتیکی یەکان ئەڵێن:

ڕەگەزەکان دروست بوون لەئەنجامی ململانێ ی دژەکانی ناو ماددە.....

ئەم ململانێ یە لەناو ماددەدا پێ ی ئەڵێن جووڵانەوەی خۆیی ماددە بەهۆی ئەم جووڵانەوەیەوە ڕەگەزی تازەو جۆراوجۆر لەماددە پێك دێت.

هایدرۆجین ڕەگەزێکی ئاسایی یە ئەگۆڕێ بۆ ڕەگەزێکی بالا پێ ی ئەوترێ (هیلیۆم) بەهۆی ململانێ ی ناوخۆوە ئەم هیلۆمەش هەربەهۆی ململانێ ی ناوخۆوە ئەگۆڕێ بۆ ڕەگەزێکی بالاترو بەردەوام ئەگۆڕێ تاکوو بالاترین ڕەگەز پێ ی ئەڵێن (یۆرانیۆم). کەهیچ ڕەگەزێك لەمە بالاتر نی یە و لێرەدا (تطور) گەشەکردن ئەوەستێ!!!

ئێمە لێرەدا پرسیارئەکەین لەمادی یەکان:

هایدرۆجین ڕەگەزێکی ماددەیە بۆچی هەندێکی گەشەئەکات و ئەگۆڕێ بۆچی هەموو هایدرۆجین گەشەناکات و ناگۆڕێ؟

بۆچی ئەوەی گۆڕا تاکوو (یۆرانیۆم) بوو ئیتر گەشەکردن وەستا بەمەرجێك یۆرانیۆمیش ململانێ ی دژەکانی تێدایە بەڵام گەشەناکات واتە (تطور) ناکات.

بێجگە لەهیدرۆجین بۆچی ڕەگەزەکانی تری ماددە هەموویان گەشە ناکەن و ناگۆڕێن؟..!!!.

باهەموو کافرو ملحدو بێباوەڕان و مادی یەکان زۆرچاك بزانن: گۆڕانی هەندێ ڕەگەزو مانەوەی هەندێکیان وەکوو خۆیان و نەگۆڕانیان و وەستانی گەشەکردن لەیۆرانیۆم دا ، هێزێکە وای دروست کردووەو ئەیبات بەڕێوە ئەویش پەروەردگارە بۆیە وای کردووە یاسای گەردوون تێك نەچێت و زۆر زۆر بەڕێك و پێکی بەڕێوەبچێت... کەوابوو زانست ڕای ئاینی پەسەندکردووەو ڕای مادیەکانی خستووەتەلاوە.

لێرەدا ئەبێ خۆمان ناشارەزا نەکەین.

لەڕێگەی ئاین و زانستی نوێ وە پەروەردگار ببینین!!!.

ئەگەر زانست مادیەت بێت و پێش کەوتن مادیەت بێت ئەگەر ئاینی ئیسلامی پیرۆز دواکەوتن و نەفامی بێت...

من ئەو نەفامی و نەزانینەم لاپەسەندە نەك ئەوپێش کەوتنە کەمادیەت باسی ئەکات پەروەردگار کێ یە؟؟؟

دەرکەوتن و بینینی پەروەردگار، وەڵام دانەوەی بانگەوازێکی ناوخۆیی ئادەمیزادە.

سەلماندنی ڕاستی ئاینی پیرۆزی ئیسلام لەبەر ڕۆشنایی پێوەرەکانی زانستی نوێ یە.

مرۆڤی موسڵمان پێویستی بە(دلیل)ی یان ڕانومایی ئەقڵی نی یە تاکوو باوەڕی بە ئیسلام هەبێت بەڵکوو سەرچاوەی باوەڕی تەماشاکردنی ناوخۆیی یە ئەویش ویژدانە، کەبەرزترە لەڕاستی ئەقڵ.

دەرکەوتن و بینینی پەروەردگار وەکوو هاوکێشەیەکی بیرکاری یان کیمیا نیە کەبەئەقڵ ئەدۆزرێتەوەو لەسنووری ئەقڵ بەدەرنی یە بەڵکوو بانگەوازی ناوخۆیی ئادەمیزادەو زانستێکە لەبوونی خۆی، پەیوەندی ئەم زانینە ئەقڵی نیە بەڵکوو نەفسی یە، واتە خۆییەو دەروونی یە و هەرچی پێك هێنا بەشتێکی نەفسی‌یە لەکیانی خۆی پێویستی بەبەڵگەی ئەقڵی نیە هەروەکوو لەقورئانی ڤیرۆزدا هاتووە سێ‌جۆر نەفس هەیە:

١-نەفسێك بەردەوام فەرمان بەخاوەنەکەی دەکات تاخراپە بکات و سەربکاتە گوناهکردن.

﴿ إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ ﴾ (یوسف:٥٣)

٢-بەڵام نەفسێکی تر لۆمەی خراپەکاری ئەکا لەویژدانی مرۆڤ دا.

﴿لا أُقْسِمُ بِيَوْمِ الْقِيَامَةِ وَلا أُقْسِمُ بِالنَّفْسِ اللَّوَّامَةِ ﴾ (القيامة:٢،١)

٣-هەروەها نەفسێکی تر دڵنیایی یە لەویژدانی مرۆڤ دا:

﴿ يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَرْضِيَّةً﴾ (الفجر: ٢٧ ، ٢٨)

کەوابوو:

ئەگەر ویژدانی پاك و ڕێك و پێك هەبوو لەمرۆڤ دا ئەوە ڕێگەی چاکەو راستی ئەگرێتەبەر.

ئەگەر ویژدانی خراپەو ناڕێکی هەبوو ئەوە ڕێگەی خراپەو نادروستی ئەگرێتەبەر.

لەم کاتەی ئێستادا، زانست زۆرشتی لەژیانی ئادەمیزاد گۆڕیوە. کەبەهۆی زانستەوە تەماشای ئەکرێت بۆ ڕێگاکانی بەڵگەیی کۆن، کەپیاوە ئاینیەکان لەڕابوردوودا بەکاریان ئەهێنا ئەم ڕێگایانە بەتاڵ و بێ سوودن، ئادەمیزادی نوێ باوەڕی بەڕێگەی ڕاستی بەڵگەیی هەیە، کەبیری نوێ و زانست بەرهەمی هێناوە، بەم جۆرە ئەقڵی نوێ داوائەکات زانستی یە ئاینی یەکان ئەبێت لەسەر راستی زانستی بن بۆ پێوەری زانستی نوێ ی بەڵگەیی ئەگینا بەپێچەوانەوە ئەقڵی نوێ ئەتوانێ گومانی هەبێت لەڕاستی یەکانی ئاین، ئەمە تەنها داواکاری دژەکانی ئاین نی یە بەڵکوو زۆربەی موسڵمانان، کەباوەڕیان چەسپاوە ئەیانەوێ لەدەروازەی(لِيَطْمَـئِنَّ

قَلْبِي)یەوە دڵنیابن و وەڵامێکی زانستی بۆ زۆربەی پرسیارەکان بدۆزنەوە تاکوو هەست بەناتەواوی باوەڕەکەیان و ئاینەکەیان نەکەن.

ئێمەش ئەم باسە ئەنووسین بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پێویستی‌یە لەم بەشانەی خوارەوەدا:

(ڕێبان)یان شێوازی بەڵگەهێنانەوە ((طريقة الإستدلال))

ئەگەر دۆزینەوەی راستی لەئەنجامی تەماشاکردن و تاقی کردنەوەی زانستی نەبێت دژەکانی ئاین ئەتوانن دژایەتی بکەن بەتەماشاکردن و تاقی کردنەوەی زانستیانە و بڵێن ئاین بەتاڵە!!!!.

هەڵوێستی زانایانی ئاینی جاران، وەکوو پیاوێك کە چەکێکی بانقی هەبێت و ڕەسیدی نەبێت وابوو !!!

بۆیە ئێمە ئەمە ئەڵێین چونکە تەنها ئەیان ووت (ڕاستی بەرز ناگۆڕێت) هەرچەندە ئەمە زۆر ڕاستە بەڵام پێویستی بە بەڵگەی زانستی و دەرهێنانی ڕاست هەیە ئەگینا ووتەکەیان چەکی بێ ڕەسیدە .

ئەم بۆچونانەی کۆن ئەوە ئەگەیەنێ کە ئاین لەسەر ئەساسێکی زانستی یانە نی یە و تەنها باوەڕە !!!

هیچ باوەڕێکیش ڕاست نی یە ئەگەر سەلماندنێکی ڕاستی لەگەڵ نەبێت لە دەرەوەی باوەڕی ناوخۆیی یەوە ...بۆ نموونە :

ئەگەر بڵێین : هەورە تیشك دارەکانی ئاسمانەکان بریتین لە کۆمەڵێك ئەستێرەی زۆر ، ئەم قسەیە تەنها باوەڕی خۆیی خاوەنەکەیەتی بەڵام ئەگەر بە دووربینێکی گەورە تەماشای هەورە تیشك دارەکان بکەین ئەبینین لە کۆمەڵێك ئەستێرەی هێجگار زۆر پێك هاتوون ، بەم جۆرە قسەکەمان سەلماندو ئەم ڕاستی یەش لە ڕاستی‌یەکی خۆیی یەوە گۆڕا بە جۆرێك هەموو کەس بیبینێ و باوەڕی پێ بکات .

بەڵام ڕاستی یەکانی ئاین ناتوانین تاقی کردنەوەیان لەسەر بکەین ، لە جیهانی دەرەوەدا ، بۆیە دوژمنانی ئاین ئەڵێن : ئاین تەنها باوەڕێکی ناوخۆیی یەو هیچی تر!!

ئێستە پێویستە گفتوگۆ لەسەر ئەم ووتنەیان بکەین :زانایەکی زانستی نویٚ ئەڵیٚ:
کارەبا لە هاتنە دەرەوەی ئەلکترۆنەکانە ئەم ووتەیە ئەوە ناگەیەنیٚ کە ئەم زانایە بە دووربینەکەی ئەلکترۆنەکانی لەناو تەلی کارەباکەدا دیبێت !!!

ئەمە لە ڕۆشنایی گلۆپەکان و سوڕانەوەی پانکەکان و کەوتنە گەڕی ئامێرەکانەوە ئەبینیٚ و ئەیزانی، تەنها دەست نان بە دووگمەیەکدا ئەلکترۆنەکان ئەڕژێنە ناو تەلی کارەباکەوەو کاری خۆیان ئەنجام ئەدەن !!!

کەوابوو بۆچوونەکانی زانست بە تیٚۆری زانستی و فەرزی پێوانەیە ئێمە دژی زانایەك نین کە بۆچوونەکانی خۆی بە تیۆری زانستی باس بکات و بە ڕاستیان بزانیٚ، لەبەر ئەوە بۆ کەسیش نی یە ئەگەر زانایەکی ئاینی بیرو بۆچوونەکانی خۆی لە بارەی ئاینەوە بە تیۆری باس بکات و بە ڕاستیان بزانیٚ ..

## ((گەردوون کیٚ دروستی کردووە)) ؟

ڕای زۆربەی زانا بەناوبانگەکانی زانستی نویٚ ی جیهانی ئەوەیە گەردوون دروست کەری هەیەو بەڕێوەبەری هەیە ..ئەویش پەروەردگارە !!!

ئەو مادی‌یانەی ئەمڕۆ کە بە ناو خۆیان بە پێشکەوتنخواز ئەزانن ، ئاینێکی خۆیان هەیە ئەویش خوانەپەرستی یە لە جیاتی خواپەرستی.

زۆربەی زاناکانی زانستی نویٚ ی ئەمڕۆ لەبەر ڕۆشنایی زانیاری نویٚ ئەڵێن ڕووباری زانست ئەڕژێتە ڕاستی یەکی غەیر میکانیکی‌یەوە . بەڵام کاتێك زاناکانی سەدەی نۆزدەهەم ئەو ڕاستی یەیان بۆ دەرکەوت ، گەردوون یاسای ( بنۆس وبنۆسیاری – العله والمعلول) ئەیبات بە ڕێوە . بیروباوەڕی خوانەناسەکان پووچەڵ بوویەوە ، ئەو خوانەناسانە کۆڵیان نەدا وە ئێستا ئەڵێن ئەم زانستە نویٚ یە جێگری پەروەردگارە هەرچەندە ئەو زانایانە ئەم ڕاستی یەیان دۆزی یەوە وانالێن .

زانای بە ناوبانگ (إسحاق نیوتن) ئەڵیٚ: ئەمە شێوەی کاری پەروەردگارە لە ئیشدا .پەروەردگار ئیشوکاری خۆی لە گەردوون دا ئەبات بە ڕێوە بە هۆی (اسباب و علل) واتە هۆکان و بنۆسەکان بەڵام خوانەناسەکان ئەڵێن : دوا تەفسیری میکانیکی

گەردوون ڕاستی ئەوەیە هەموو ڕووداوەکانی گەردوون بە (علل) واتە بنۆسی مادی بەڕێوە دەچن ودەستی دەرەوەی ناوێت و گەردوون بە زنجیرەی (علە ومعلول) بنۆس وبنۆسیاری یەوە بەستراوە .

بەڵام نوێترین زانستی سەدەی بیستەم ئەوەی سەلماند کە تەفسیری میکانیکی بۆ گەردوون پووچەڵ بوویەوە !!!

**بۆ نموونە :**

ڕەگەزی (ڕادیۆم) تیشك ئەداتەوە Radio-Active هەروەها ئەلکترۆنەکانی ئەگۆڕێن و پارچە پارچە ئەبن لە خۆیانەوە بە کرداری سروشت . زاناکان تاقیکردنەوەی زۆریان کردووە بۆ دۆزینەوەی هۆی تیشك دانەوەی (ڕادیۆم) بەڵام هێشتا نەگەیشتوونەتە ئەنجام و ئێستەش هۆی چوونەدەرەوەی ئەلکترۆن لەیاسای نەوەوی خۆی لە ڕادیۆم نازانن .

دیسانەوە هەموومان ئەبینین موگناتیس ئاسن ڕائەکێشێ بۆلای خۆی و ئاسنیش ئەو ڕائەکێشێ بۆ خۆی ..زاناکان بۆچوونی زۆریان هەیە لەم بارەیەوە .

ئەڵێن : ئێمە نازانین موگناتیس بۆچی ئاسن ڕائەکێشێ بۆلای خۆی ، لەوانەیە : پەروەردگار فەرمانی دابێ بە موگناتیس ئەم کارە ئەنجام بدات بۆ وەستانی هاوسەنگی هەموو گەردوون .

کەوابوو ئەمە سەلماندنێکی ڕاستە کە یاسای گەردوون بە یاسای (علە ومعلول– بنۆس و بنۆسیاری) بەڕێوە دەچێت و بە ڕێکەوت بە ڕێوە ناچێت .

هەروەها ئەقڵێکی زۆر گەورە هەیە ئەم یاسایانەی گەردوون بە ڕێکو پێکی ئەبات بەڕێوە ئەویش پەروەردگارە .

یەکەم پرسیار کە دێت بە بیری هەموو ڕووناکبیرێك دا ئەوەیە ئەم گەردوونە کێ دروستی کرد و ئەم کارگە گەورەیە کێ ئەیبات بە ڕێوە ؟ مرۆڤی کۆن وای ئەزانی ئەمە بە چەند کەسێکی ئاقڵ و ئازا ئەچێت بە ڕێوە واتە چەند خوایەك !!! بەڵام زانست ئەم ڕایەی پووچەڵ کردەوە .مادی‌یەکان خۆیان بە زانست خواز ئەزانن ئاینێکی نوێیان

هەیە و ئەڵێن دروست کردنی گەردوون و بەڕێوەبردنی بە ڕێکەوت بووەو لە خۆیەوە دروست بووەو کوێرانە ئەم کارانە بە ڕێوە ئەچن ..

## واتە: کوفرو ئیلحاد ..ئەم بۆچوونە لەسەر دوو بناغەیە :

### ١-یاسای بە ڕێکەوت دروست بوونی گەردوون :

خاوەنی ئەم یاسایە ئەڵێت :

گەردوون لە پێش ٢,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠ دوو ترلیۆن ساڵ لەمەو پێش نەبووەو هیچ ئەستێرەو مانگ و خۆرێك نەبووە ، بەڵام مادده هەبووە هەروەکو گەردێك لە بۆشایی ئاسمانداو لە ئەلەکترۆنات و پرۆتۆنات پێك هاتووە وە هیچ جوڵانەوەیەکی نەبووە : لێرەدا :

﴿فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُبِينٍ﴾ (الدخان:١٠)

واتە: چاوەڕوان بە ئەو ڕۆژە دێت کە ئاسمان دووکەڵێکی لێوە دیارە !!!

کەوابوو گەردوون کاتێك کاول دەبێت و ڕۆژی دوایی دێتە پێشەوە وەکو ئەو کاتەی لێ دێتەوە پێش دروست بوونی : واتە تەنها ئەو دووکەڵە دیارە لە ئاسماندا کە ئەوەڵ جار هەبووە .

هەروەها زانایانی بیرکاری ئەڵێن : ئەو گەردە وەستاوە لە بۆشایی ئاسماندا بچووکترین جووڵانەوە تێکی داوە و مادەی جوڵاندۆتەوە هەروەکو گۆمێکی وەستاو بجوڵێنین ..جوڵانەوەکە لە ناوەڕاستەوە دەست پێ دەکات تاکو هەموو گۆمەکە ئەگرێتەوە .

لێرەدا خواناسان پرسیارێك ئەکەن ئەگەر جووڵانەوەکە لەگۆمەکەدانەبێت ئەی ئەو جووڵانەوەیە کێ دروستی کرد و جووڵاندی؟؟ تاکوو هەموو ئاوی گۆمەکەی گرتەوە؟؟ مادی یەکان ئەڵێن نازانین!!

بەڵام هەردوولا دڵنیان ئەو جووڵانەوەیە بووەو ئەو گەردە بڵاوبوەتەوەو دیسانەوە یەکی گرتووەتەوەو پاشان تەقیوەتەوە.

ئەو هەموو تەنە ئاسمانی و مانگ و خۆرو زەوی و ئەستێرانە دروست بووە!!! بەلام (ماددی‌یەکان و زاناکانیان)

خۆیان باش ئەزانن ئەم جوولانەوەیە هێزێك دروستی‌کردووە ئەوان پێ ی ئەلێن (ڕێکەوت) خواناسان ئەلێن: پەروەردگارەو دروستکەری گەردون و بەڕێوەبەریەتی!!!

ئەگەر ڕێکەوتی کوێرانە گەردوونی دروست بکردایە ئەو هەموو یاساو ڕێك و پێکیەی نەئەبوو لەبەڕێوەبردنیا لەوکاتەوە دروست بووە تاکوو ئێستاو تاکوو دواتریش چۆن تێك نەچوو؟ ئەوهێزە ناهێڵێ تێك بچێ کەدروستیکرد ئەویش پەروەردگارە.

**٢- بناغەی دووەمی ماددییەکان ئەوەیە ئەلێن:**

ئەقڵ دوای مادده دروست بووە!! هەروەکوو خۆیان ئەلێن: گەردوون لەمادده دروستکراوەو بێ ئەقڵ و بێ چاوو بێ گوێ یەو بێ هەست و هۆشەو کوێرانە دروست بووە... باشە ئەی دروستبوونی ئادەمیزاد لەسەر زەوی بەم شێوە جوانەو هەموو ئەقڵ و زانستەوە لەسەر ئەم مادده بێ ئەقڵە چۆن دروست بوو؟ ئایامادده‌یەکی بێ ئەقڵ و بێ هەست و بێ هۆش توانی ئەم ئادەمیزادە ئاقڵە دروست بکات؟ واتە بەردێك توانا و ئەقڵی زیاتربوو لەزانایەك؟ بێگومان نەخێر ئەقڵی گەورە کەپەروەردگارە پێش دروستبوونی گەردوون و بوون بوونەوەرە.

ئەمە وەلامی ئەو پرسیارەبوو چۆن گەردوون دروست بوو؟ کێ دروستی‌کرد؟

لێرەدا پرسیاری کێ گەردوون بەڕێك وپێکی ئەبات بەڕێوە دێتە پێشەوە؟

ماددی یەکان و هەندێ زاناکانیان کەڕوولاڵن لەوەلام دانەوەی ئەم پرسیارەدا:

چونکە مادده بێ گیانەکان خانەکانیان هەروەکو مادده گیاندارەکان دروست کراون، واتە دروست بوونی گەردوون دروست بوونی ژیانی بەدوادا هاتووە :

﴿يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَيُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَكَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ﴾ (الروم:١٩)

واته : پەروەردگار زیندوو لە مردوو دەرئەهێنیٚ و مردوو لە زیندوو دەرئەهێنیٚ زەوی دوای مردنی زیندوو ئەکاتەوەو بەو جۆرەش لە گۆڕ دەرتان ئەهێنێتەوە بە زیندوویی .

کەوابوو خواناسان ئەتوانن بڵێن : بە گوێرەی ئایەتەکانی قورئانی ڤیرۆزو ئەو یاساو زانستیانەی زانایانی زانستی نویٚ باسی ئەکەن پەروەردگار ئەزەلییەو دروست کەرو ڕاگرو بەڕێوەبەری گەردوونە .

خواناس ئەتوانیٚ وەکو ڕاستی یەك بڕێ لە ئەنجامی زانست و ڕاستی یەکان دەربارەی دروست بوونی گەردوون و بەڕێوەبردنی لەلایەن پەروەردگارەوە ئەمەش کوفرو ئیلحاد بە درۆ دەخاتەوە .

**پرۆفیسۆر( إیدینجتن ) ئەڵیٚ :**

(کۆتایی ڕاستی یەکان دەربارەی گەردوون ئەقڵیٚ دروستکاریانە ) .

**( ئاین و زانست )**

**ئاین :** تەماشاکردنێکی دیاری کراوە بۆ ژیان ، واتە یاسایەکی دیاری کراوە بۆ تەماشاکردنی ژیان .

**زانست :** تەماشاکردنی جیهانێکی هەست پیٚ کراوە بەتەماشاکردن و تاقی کردنەوە..

بەم جۆرە ئاین و زانست هەریەکە مەودایەکە بۆ چەند بابەتێکی فراوان بازنەی هەریەکێکیان لەوی تر جیاوازە .

لەبەر ئەوە ئەبیٚ تەنها باسی ئەوە بکەین کە هەندیٚ کەسانی بیٚ ئاگا هەن ئەڵێن زانست ئاینی بەزاندووە و باوی نەماوە !!!

ئەم قسەیە لە سەدەی هەژدەهەم ونۆزدەهەم دا زیاتر دەنگی دابووەوە زۆر کەس وای دەزانی ئیتر پێویستی بە ئاین نی یە و پێویستی بە باوەڕو بە پەروەردگار نی یە!!!

خواناسان ئەڵێن : هەرباسێك دەربارەی گەردوون و دروست بوونی بکرێت ئەبیٚ لە پەروەردگارەوە دەست پیٚ بکات چونکە هەموو شتێك دروست کراوی خۆیەتی ..

بەلاّم دژە ئاینی یەکان ئەڵێن : پێویست ناکات بڵێین پەروەردگار هەیە کاتێك باسی گەردوون ئەکەین ، بەم جۆرە باسی پەروەردگار بە پێویست نازانن .

بەلاّم: زانستی سەدەی بیستەم دانی بەوەدا ناوە کە داوای ئەمانە هیچ بەڵگەیەکی زانستی نی یە و باوی نەماوەو پووچەڵ بوەتەوە .بابزانین ئەو دۆزینەوانە کامانەن خوانەناسان ئەڵێن :

پێویست بە باسی پەروەردگار ناکات ..باشترینی ئەو دۆزینەوانە ئەوەیە کە گەردوون بە یاسایەکی ڕێك و پێك بە ڕێوە ئەچێت .مرۆڤی کۆن زۆر بە سادەیی ئەیووت: هەرچی ڕووئەدات لەسەر زەوی و دەرەوەی زەوی دەستی پەروەردگاری تێدایە .بەلاّم زانایان وزانستی نویٚ هۆی شاراوەی پشتی هەموو ڕووداوەکانیان دۆزی‌یەوە بە تاقی کردنەوە .

**داروین ئەڵیٚ:** مرۆڤ لە دروست بوونێکی ڕاستەوخۆ نەبووە بەڵکو بەرزترین شێوەی گیان لەبەرە ووردەکانە کە لە سەرەتاوە دروست بوون و دوای ماوەیەکی زۆر گەشەیان کردووەو بەرزترین شێوەی وەرگرتووە کە مرۆڤە !!!

کەواتە: لەمەولا کرمە بچوکەکانیش گەشە ئەکەن و ئەبن بە ئادەمیزاد !!!

لێرەدا پێویست ناکات زۆر ڕەخنە بگرین لەم زانایە چونکە لە کۆتایی هەموو نووسینەکانی دا هەموو کتێبەکانی خۆی بە درۆ خستەوەو باوەڕی بە پەروەردگار هێناو ڕاستی بۆ دەرکەوت .

هەندیٚ لە زانایان ئەیان ووت گەردوون یاسای ڕێك وپێك نایبات بە ڕێوە بەڵکو یاسای ماددەو سروشت ئەیبات بە ڕێوە تا ماوەیەکیش لەسەر ئەم ڕایە بوون و هەندێکیشیان تووشی شێتی بوون لەوانە: فەیلەسووفی ئەڵمانی (کانت) ئەیووت:

(ئەگەر ماددەم بۆ بێنن گەردوون دروست ئەکەم) !!!

(لە ڕاستیدا ئەگەر بەردێك وورد بکەین ناتوانێت وەکوو خۆی دروستی بکاتەوە ) ، هەروەها (هیگل) ئەیووت :

من ئەتوانم ئادەمیزاد دروست بکەم ئەگەر ئاوو هەندێ ماددەی کیمیاوی وکاتم هەبێ !!!

لە ڕاستیدا ئادەمیزاد خۆی ئەو هەموو ماددانەی تێدایە با بتوانێت خۆی ڕاگرێ و لەناو نەچێت واتە خۆی بهێڵێتەوە ...

پاشان (نیچە) ئەیووت: ئێستە ئەوەی ناوی پەروەردگار بوو مرد ، ئەمە لە بەرزترین پلەی شێتی و نەفامیدا بوو !!

بەم جۆرە ماددی‌یەکان وزانا توندڕەوەکانیان بە خەیاڵی خاوی خۆیان بڕیاری زانستی یان داو ووتیان گەردوون دروست کراوی بوونێکی خاوەن دەسەلات و ئەقڵ نی یە بەڵکو گەردوون لەسەرەتاوە تا کۆتایی ماددەیە .

هەروەها ئەیان ووت : هەموو جۆرە جووڵانەوەیەکی گەردوون مردوو بێت یان زیندوو کردارێکی مادی کوێرانەیە ..

لە هیچ بەشێکی دا شوێنەوارێکی دروست کەری نیە کە هەموو ئاینە ئاسمانیەکان باسی ئەکەن .

ئینجا ئەگەر ئەم قسانە ڕاستن بۆچی زانستی نوێ دانی ناوە بەوەدا کە پەروەردگار گەردوونی دروست کردووە ..وەکو باسمان کرد هەروەها ئەم خوانەناسانە ئەڵێن :

یاسای ڕاکێشانی گەردوونی (قانون الجاذبیة الکونیة) هەموو تەنەکانی گەردوون وئاسمانەکان ئەجوڵێنێ بە گەورەو بچووکەوە ، لەبەر ئەوە پێویست ناکات باوەڕمان هەبێت بە بوونی پەروەردگار هەروەها درێژە بە قسەکانیان ئەدەن و ئەڵێن:ئەو ڕووداوانەی لە سروشتدا ڕوو ئەدات هێزێکی شاراوە نی یە ئەیجوڵێنێ بەڵکو بە یاسای (علە ومعلول) ئەو ڕووداوانە دروست ئەبن .

بۆ نموونە: پەلکە زێڕینە کە دروست ئەبێت لە ئەنجامی پێچەوانەبوونەوەی تیشکی خۆرە لەسەر باران لەبەر ئەوە درۆیە بڵێین کرداری پەروەردگارە. ئەمە (هکسلی) وا ئەڵێت و درێژەی پێ ئەدات و ئەڵێ:

ئەگەر ئەم هۆکارانە ئەنجامی سروشتی بن پێویست بەهۆی سەرووی سروشت ناکەن!!!

## ئێستا ئێمە پرسیار ئەکەین :

ئایا لاوازی ڕای ئەو بە ناو فەیلەسووفانە لە کوێ دایە ؟

(شەمەندەفەرێك بەسەر سکەی ئاسندا ئەڕوات ئەڵێن بە هۆی ئامێرەکەیەوە ئەو فارگۆن و بارو نەفەرانە ڕائەکێشێ و ئەڕوات بەڵام وانی یە پێویستە شۆفێر لێی خوڕێ‌و ئەندازیاریش دروست کەری بێت واتە شەمەندەفەرەکە بوونی نی یە بەبێ ئەو دووانە ، ئەو دووانەش کۆتایی نین بۆ دروست بوون و ڕۆیشتنی شەمەندەفەرەکە بەڵکو ئەقڵ ئەوەی دروست کردو خستیە گەڕ ، واتە سروشت وگەردوون بە بێ ئەقڵ بە ڕێوە ناچن : یەکێك لە زاناکانی مەسیح ئەفەرموێ : سروشت لێکدانەوەی گەردوون نی یە بەڵکو سروشت خۆی پێویستی بە لێکدانەوە هەیە لەبەر ئەوە سروشت ڕاستی یەکە لە ڕاستی یەکانی گەردوون وە لێکدانەوەی گەردوون نی یە !!

**Nature does not explain , She is indeed of explanation .**

## (باوەڕهێنانی زۆربەی زانایانی سروشت و گەردوون بە پەروەردگار )

١ ) **روبرت صوریس بیج**: زانای سروشتی، بڕوانامەی دکتۆرای وەرگرتووە لەو زانستەدا لەزانکۆی (هاملین) یەکەم کەس بوو ڕاداری داهێنا لەساڵی ١٩٣٤ ز. دا. ئەم زانایە، باوەڕی تەواوی بەپەروەردگار هێناوەو ئەڵێ:

ئەو خوایەی گەردوونی دروست کردووە لەماددە، خۆی ماددە نی یە!!

بۆیە هەست بەبوونی گەردوون ئەکەین بەڵام هەست بەبوونی پەروەردگارناکەین چونکە پەروەردگار ماددەنی یە. بەڵکو ئەقڵ و ڕۆحێکە لەسەرووی هەمووشتێکەوە. هەموو نێرراوەکانی خۆی‌و کتێبەئاسمانی یەکان ئەم باسەیان کردووەو جیهانێکی تری ڕۆحانی هەیە. کەئێمە هێشتا ئەوەندەی لێ نازانین شایانی باس بێت!!!.

٢ ) **میربت ستانلی کونجدن**: زاناو فەیلەسوفی سروشتی بڕوانامەی دکتۆرای وەرگرتووە لەزانکۆی بورتون.

ئەڵێ: ئەم گەردوونە کەدروست کراوە تەنها ماددە نی یە بەڵکو ماددەیەو ڕۆح.

لەبەرئـەوە نـاتوانین بەهــەموو شـتێك بڵـێین مـاددە، هــەروەكو لەشـی ئـادەمیزاد – ماددەیەو ڕۆح.

زانست زۆر ڕووداوی سروشتی زانیـوە، بـەڵام هێشتا زانسـت ناتوانێـت بەتـەواوی بڵێت جیهانێكی تری نامادی نی یە لەسەرووی جیهانی ماددەوە، بەڵام ئێمـە بـەهۆی ئەقڵـەوەو زیرەكـی مرۆڤـەوە كەئـەبینیٚ زۆرشـتی سەرسـوڕهێنەر لەسـەرئەم زەوی یـە هەیەو ڕووئەدات وەكوو: سووڕی ئاو لەسروشت دا، سووڕی دووەم ئۆكسیدی كاربۆن لەسروشت دا، كرداری زۆربوون، كرداری ڕۆشـنەپێك هـاتن و شـتی زۆرتـریش كـەبۆمان دەرئەخات گەردوون بەڕێكەوت دروست نەبووەو كوێرانە بەڕێوەناچێت..

**هەروەها ئەم زانایە ئەڵیٚ:**

هەرچـی لەگـەردوون دا هەیـە لـەبوون و بوونـەوەر، شـاهدی ئەوەیـە پـەروەردگار دروست كەری هەمووشتێكەو بەڕێوەبەری گەردوونە بەڕێك و پێكی:

﴿ أَمَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَأَنْزَلَ لَكُمْ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَنْبَتْنَا بِهِ حَدَائِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَا كَانَ لَكُمْ أَنْ تُنْبِتُوا شَجَرَهَا أَإِلَهٌ مَعَ اللَّهِ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ﴾ (النمل:٦٠)

واتــە: ئەوكەســەی یــان ئــەو زاتــەی كەئاسمانــەكان و زەوی هێنایــە بەرهــەم و لەئاسمانـەوە بـارانی بـۆ بـاراند و ئـاوی هـەموو باخـچەو بێـستانەكان دراو بـەجوانی سـەوزبوون، لەكاتێكـدا ئێـوە توانـای سـەوزكردنی دارێكتـان نـی یـە ئایـا كەسـێكی تـر هەیە لەگەڵ پەروەردگار، بەڵام بیٚ باوەڕان لەحەق لایان داوە.

٣) **لورد كیلفی:** لە گەورەزانایانی سروشتی جیهانەو ئەڵیٚ:

((ئەگــەر بیربكەینــەوە بەبیركردنەوەیــەكی قــووڵ، زانـست ناچـارت ئـەكات بــۆ باوەڕهێنان بەپەروەردگار)).

هەروەها ئەڵێ: ئەگەر بەووردیو بەزیرەکی تەماشای گەردوون بکەین بۆمان دەرئەکەوێ سێ جیهان هەیە: -

**١-جیهانی مادە ٢-جیهانی ئەقڵ ٣-جیهانی ڕۆح**

کیمیا لەگۆڕانکارییەکانی ئەقڵ ئەکۆڵێتەوە لەبەرئەوە ناتوانێ بەڵگەی ماددی دەرخات لەبارەی بوونی ڕۆحی گەورەوە، واتە پەروەردگارەوە کەئەم گەردوونەی دروست کردووە.

هەموو تاقی کردنەوەکان دەریان خستووە هەموو بەشێك لەمادده یاسایەکی ڕێكو پێکی تێدایە واتە بەڕێکەوتو کوێرانە لەخۆیەوە دروست نەبووەو دروستکەری هەیە ئەویش ((پەروەردگارە)).

٤ ) **أدوارد لوثرکیسیل**: زانای زیندەوەرناسی، بڕوانامەی دکتۆرای وەرگرتووە لە زانکۆی / کالیفۆرنیا/ ئەڵێ:

لەئەنجامی دۆزینەوە زانستی یەکانی ئەم دوای یەدا بەڵگەی نوێمان دەست کەوتووە، بێجگە لەبەڵگەکانی ڕابووردوو بۆ دەرخستنی ئەو ڕاستی یەی، کەپەروەردگار دروست کەری گەردوونە.

لەم ساڵانەی دوایی دا لەهەموو شوێنە زانستییەکانی ئەمەریکا داواکاری گەڕانەوە بۆئاینو پەروەردگار پەرەی سەند، ئەویش لەئەنجامی ئەو دۆزینەوەو بەڵگە زانستیانەبوو کەسەلمێنرا گەردوون دروست کراوەو بەیاسایەکی ڕێکوپێك بەڕێوەئەچێتو گەردوون سەرەتای دروستبوونی هەیەو زاناکان دایان ناوە.

هەروەها دروست بوونی زیندەوەر سەرەتای هەیەو زاناکان دایان ناوە.

واتە: هەرشتێك سەرەتای دروستبوونی هەبوو ئەزەلی نیەو ئەودەسەڵاتە ئەزەلییە گەردوونی دروست کردووە کەپەروەردگارە.

٥ ) **وولتر أوسکار لندبرج**: زانای فسیولوجیو کیمیا ی زیندەیی (الفسیولوجیا والکیمیاء الحیویة) ئەڵێ:

سەرنەکەوتنی هەندێ لەزاناکانو ڕازی نەبوونیان بەو بەڵگە زانستیانەی ئەیسەلمێنێ گەردوون دروستکراوی پەروەردگارە ئەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆ:

١) كوفرو ئيلحاد،ئەگەرێتەوە بۆ هەندێ ڕێكخراوو كۆمەڵ یان دەوڵەت كەئەیانەوێ بەكوفر دژایەتی بوونی پەروەردگاربكەن، چونكە ڕای ڕاستی زاناكان دژی بەرژەوەندی ئەمانەیە.

٢) ئەگەر هەندێ لەزاناكان ئەم ترسەشیان نەبێت كەلەخاڵی یەكەمدا باسمان كرد، دەمار توندیو خۆبەڕاست زانینی كوێرانە وایان لێ ئەكات ڕاستی نەڵێن.

بەڵام هەموو بەڵگە زانستیەكان ڕامان ئەكێشن بۆ باوەڕی تەواو بەبوونی پەروەردگار.

٦) **فرانس بیكون:** فەیلەسوفی ئینگلیزی پێش سێ سەد ساڵ لەمەو پێش ووتوویەتی:

كەمێك فەلسەفە نزیكمان ئەكاتەوە لەكوفرو ئیلحاد بەڵام زۆرزانین لەفەلسەفە ئەمانخاتەسەر ئاینو خواپەرستی.

٧) **بول كلارنس ابرشولد:** زانای سروشتی بەناوبانگ بڕوانامەی دكتۆرای هەیە لەزانكۆی كالیفۆرنیا ئەڵێ:

ئادەمیزاد ناتوانێ تەنها بەبەڵگەی ماددی پەروەردگار بناسێ بەڵكوو ئەبێت بەڵگەی ماددی و ڕۆحی بەیەكەوە ببەستێو لەناخی دەروونیا ڕاستی بۆدەركەوێ كەپەروەردگار دروست كەری بوونو بوونەوەرە.

٨) **جورج إیرل دافیز:** زانای سروشتی ئەڵێ: هەتاكو ڕەوڕەوەی زانست پێش كەوێو خەرافیاتی كۆن كەم بێتەوە مرۆڤ زیاتر ڕێزئەنێ لەئاینو زانینەكانی........

هەروەها ئەڵێ:

كوفر زیاتر لەناو زاناكان دا بڵاوبوەتەوە، هەرچەندە باوەڕهێنانیش بە پەروەردگار لەنێوان هەندێكیان دا بڵاوبووەتەوە

هەروەها ئەڵێ:

هەر لەمناڵی یەوە باوەڕم بەپەروەردگار هەبووە بەئاینی.

بەڵام ئێستا زیاتر باوەڕم هەیە، بەزانستو بەڵگەی زانستی.

ئەوانەی ئەڵێن گەردوون ماددەیە، واتە ئەم مادده خۆی خۆی دروست کردووە، باشە: ئەگەر دروست کەر ئەزەلی بێت مادده ئەزەلی نی یە.

لەبەرئەوە پەروەردگار بەدیهێنەری گەردوون و بوونەوەرە.

٩ ) **توماس دافید بارکسن:** زانای کیمیا، بڕوانامەی دکتۆرای وەرگرتووە لەزانکۆی ألینوی بەشی کیمیا. ئەڵێ:

ئەوخەڵاتانەی پەروەردگار بەخشیویەتی بەئادەمیزاد، بۆئەوەی زنجیرەی ژیانی لەسەر زەوی بەردەوام بێت لەژماردن نایەت هەروەها ئەویاساو ماددەو ڕەگەزو توخمانەی دروستی کردوون لەئاسمانەکان و زەوی دا لەژماردن نایەن.

ئەگەر تەماشای ئاوبکەین ئەبینین تەنها شلی یەکەی بەسە بۆ ئەوەی بوەستین و بیربکەینەوە.

ئاو سێ بەشی ڕووی زەوی داپۆشیوە، بۆیە کارئەکاتەسەر پلەی گەرماو هەوای سەرزەوی.

ئەگەر هەندێ لەتوخم یان ڕەوشتی ئاوکەم بێتەوە، کارەساتی ناهەموار لەسەرزەوی دروست ئەبێت.

ئاو بەشلی ماوەیەکی زۆر ئەمێنێتەوە، لەبەرئەوە پارێزگاری مانەوەی پلەی گەرمای سەرزەوی ئەکات بەتێکڕایی یەکی نەگۆڕاو.

هەروەها زەوی ئەپارێزێ لەهەندێ گۆڕانکاری خراپ و ئاویش نەبوایە ژیان نەئەبوو.

﴿وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيّ أَفَلا يُؤْمِنُونَ﴾ (الانبياء:٣٠)

واتە: هەمووشتێکی زیندوومان لە ئاو گوروانند، یان بەهۆی ئاوەوە هەموو شتێکمان بەزیندوویی هێشتەوە.

١٠ ) **ماندالیف:** زانای ڕووسی لەسەدەی نۆزدەهەم دا ئەم زانایە خشتەی خولی بۆ توخمەکان دانا بۆ دۆزینەوەی ژمارەی ئەلەکترۆنەکانی دەوری ناوك و خولگەکانی، تاکوو ئێستاش زانایانی ئەمڕۆ ئەم خشتەیە بەکارئەهێنن و باوەڕی تەواویان هەیە ئەم گەردوونە زۆر بەووردەکاری و بەئەندازەیەکی زۆر ڕێکوپێك و سەرسوڕهێنەر دروست

کراوەو بەهیچ جۆرێك بەڕێکەوت و کوێرانە دروست نەکراوە بەڵکوو هەمووشتێك دروست کراوی پەروەردگارە.

١١ ) **جون ولیام کلوتس**:زانای بنەچەو ژینگە، بڕوانامەی دکتۆرای وەرگرتووە لە زانکۆی بیتسبرج ئەڵێ:

کاتێ ویستم دەربارەی پەروەردگارو گەردوون بنووسم – دووحیکمەتی کۆنی پیرۆزم بیرکەوتنەوە کەئەڵێن:

(ئاسمانەکان شاهیدی گەورەیی و دەسەڵاتی پەروەردگارن، مانەوەیان بەیاسایەکی ڕێکوپێك/ جوانی دروست کراوەکانییەتی).

((تەنها بێ ئەقڵەکان ئەڵێن پەروەردگار نی یە)).

١٢ ) **إیرفنج ولیام نوبلوتشی**: زانای سروشتی بڕوانامەی دکتۆرای هەیە لەزانکۆی أیووا ئەڵێ:

زانست ناتوانێ مانای: ڕاستی – جوانی – بەختیاری – لێك بداتەوە..........

هەروەها بەهیچ جۆرێك ناتوانێ مانای ژیان و بۆچی ژیان هەیە لێك بداتەوە.

لەبەرئەوە هەرگیز ناتوانێ و زۆر داماوەو زۆرکەمە دەربارەی زانیاری لەپەروەردگار ئەگەر بڵێت دروست کەری هەموو شتێك نیە.

هەتاکو زانست پێش کەوێ جیاوازی ئاین و زانست بەرەونەمان ئەچێت تێ گەیشتنی ڕاستی لەزانست باوەڕهێنانە بەپەروەردگار.......

هەروەها ئەم زانایە ئەڵێ: من ناتوانم لەماددەو لەڕێکەوت بەیەکجاری وازبێنم بەڵام ئەتوانم بڵێم ئەم دووانە لە هەندێ بواری زانست دا پێویستن بۆ لێکۆڵینەوەو تاقی کردنەوە، بەڵام باوەڕی تەواوم بەپەروەردگارە.

چونکە خانەکان بە ئەلکترۆن و پرۆتۆنەکانیانەوە هەرگیز بەڕێکەوت دروست نەبوون.

١٣ ) **رسل لویل مکستر**: زانای زیندەوەرزانی بڕوانامەی دکتۆرای لەزانکۆی (الینوی) وەرگرتووە..... ئەڵێ:

قسەی ڕاست ئەوەیە، کەئادەمیزاد خۆی ئەتوانێ کاری زۆرگەورەو سەیرو سەمەرە ئەنجام بدات کەدروسنکراوی پەروەردگارە.

هەرچەندە جیاوازی هەبێت لەدروست کردنی ئادەمیزاد لەڕەنگ و ڕەگەزو شێوەدا، یان هەرچەندە جیاوازی هەبێت لەنێوان ڕووەکەکان دا یان گیان لەبەران دا – ئەمانە دروست کراوی پەروەردگارن لەسەرەتاوە تاکوو ئێستا – لەبەرئەوە گەوجییە هەرکەس باوەڕی بەپەروەردگار نەبێت کەدروست کەری هەموو شتێکە.

﴿وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِلْعَالِمِينَ﴾ (الروم:٢٢)

(لەنیشانەکانی پەروەردگار دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی و جیاوازی زمانەکان و ڕەنگەکانتان ئەمە نیشانەیە بۆ زاناکان).

١٤) **لورنس کولتون ووکر**: زانای ڕووەك و دارستانەکان بڕوانامەی دکتۆرای دراوەتێ لە (زانکۆی نیویورك) ئەڵێ:

((جوانی گەردوون، جێگە دەستی پەروەردگارە، ئادەمیزاد بەڕووکەشی ئەمە ئەبینێ، بەڵام ئەگەر لەناخی دروست کراوەکانەوە بتوانێ تەماشایان بکات و زانستی هەبێت ئەوکاتە ئەزانێ ئەقڵ و زانست زۆرداماون لەم کارانەی پەروەردگارو ئەزانێ ئەقڵێك و هێزێك ئەمانەی دروست کردووە لەسەرووی هەمووشتێکەوەیە، ئەویش پەروەردگارە...

شتە سەرسوڕهێنەرەکانی گەردوون تەنها ئەوەندە نی یە باوەڕبێنین بەپەروەردگار بەڵکو داوا لەخەڵك بکەن بۆ باوەڕهێنان بەپەروەردگار))

١٥) **وولتر إدوارد لاميرنس**: زانای بنەچەو ڕەچەڵەك بڕوانامەی دکتۆرای وەرگرتووە لەزانکۆی کالیفورنیا ئەڵێ:

ئەگەر یەکێك پرسیارم لێ بکات بڵێ بۆچی باوەڕت بەخوا هەیە؟

ئەڵێم: بەم شێوەیە فێریان کردم دایك و باوکم.

کەوابوو: باوکان و دایکان: زۆر وورپابن لەپەروەردەکردن و پێ گەیاندنی منداڵەکانتان تاکوو کافرو مولحیدنەبن...

هـەروەها ئـەم زانایـە ئـەڵێ: دوای تـێ گەیـشتنم لەزانـستی بنەچـە بـۆم دەركـەوت ئـەوەی لـەدایك و بـاوكم فێربـووم هـەمووی ڕاسـتە ئـەویش باوەڕهێنانـە بـەبوونی پەروەردگار.

١٦) **بول زانای ئاینی:** ئەم زانایە ئەڵێ:(ئێمە ئەمڕۆ ڕاستی یەكان لەپشتی پـەردەوە ئـەبینین – بـەڵام سـبەینێ پـەردەیان لەسـەر لائـەدرێ و خۆیـان بـە ئاشـكرائەبینین – لەبەرئـەوە ئـەمڕۆ نـازانین كـەمێك نـەبێت بـەڵام سـبەینێ زانـستێكمان بـۆ دەرئەكـەوێ كەلەمەوپێش نەمان زانیوە). واتە پێش كـەوتنی زانـست پـێش كەوتنـە بـەرەو بینینـی پەروەردگار بەئەقڵ و ڕۆح نەك بەچاویان بینینی سادە.

١٧) **رسـل تـشارلز آرتـست:** زانـای زینـدەوەرزانی: لەنامەكەی‌دا دەربـارەری خانـە زیندووەكان كاری خۆیان بەجێ ئەهێنن ئەڵێ:

ئەگـەر تەماشای خانـە زینـدووەكان بكـەین ئـەبینین چـۆن هەریەكـەیان كـاری خـۆی بـەڕێكوپێكی ئـەنجام ئـەدات و شـاهدی ئـەدەن دروسـتكەریان زۆربـەووردی دروسـتی كـردوون و هەریەكـەیان كـاری خـۆی بـەجێ ئـەهێنێ لەبەرئـەوە مـن بـاوەڕی تـەواوم بەپەروەردگار هەیە...

١٨) **جوج هربرت بلونت:** زانـای فیزیـا – بڕوانامـەی ماجستێری هەیـە لەپەیمانگـەی (كالیفۆرنیای تكنولوجی)

ئەڵێ:مـن باوەڕم بەپـەروەردگار هەیـە، بـەڵكو لەمـەزیاتریش، بیری خواپەرسـتی لای مـن تـەنها فەلـسەفە نـی یـە، بـەڵكو نرخـی زانـستی گـەورەی هەیـە ئـەویش بـاوەڕی تەواومەبە پەروەردگارو بەشی هەرە گەورەی ژیانی ڕۆژانەمە.

١٩) **كلودم – هاڤاوای:** ڕاوێژكاری ئەندازەیی بڕوانامەی ماجستێری هەیـە لـەزانكۆی (كلۆرادۆ) ڕاوێژكاری ئەندازەیی كارگەی ( جنرالْ ألكتريك)ئەڵێ:

زۆربـەی هۆیـەكانی باوەڕهێنـانم بەپـەروەردگار لەسـەر زانـست و بـەكارهێنانی سەلماندی بۆم كەپەروەردگار دروست كەرو بەڕێوەبەری هەمووشتێكە لەگـەردوون داو ئەنـدازەی ئـەو لەسـەرووی هـەموو ئەندازەیەكەوەیـە. ئـەم گەردوونـە بەیاسـایەكی

تایبەت و ڕێکوپێك دروست كراوەو ئەڕوا بەڕێوە، ئەویش هێزێکە دەسەلاتی ئەو یاساو ڕێکوپێکی یەی هەیە کەپەروەردگارە.

٢٠ ) **أدوين فاست: زانای سروشتی:** بڕوانامەی دکتۆرای هەیە لەزانکۆی أوکلاهوما.

٢١ ) **جون أدولف بوهلر:** ڕاوێژکاری کیمیاوی ( دکتۆرا لەزانکۆی إندیانا).

٢٢ ) **ألبرت ماكومب ونشستر:** شارەزای زانستی زیندەوەرزانی دکتۆرا لەزانکۆی تکساس.

٢٣ ) **إيرل تشترريكى:**زانای بیرکاری و فیزیا/ بڕوانامەی ماجیستیر لەزانکۆی واشنتن: ئەم زانایانە ئەڵێن: تەماشاکردنی دروست کراوەکانی گەردوون بەتایبەت شانەی هەنگ دەری ئەخات کەدەسەلاتێکی ناوەندی (السيطرة المركزية) هەموو گەردوون ئەبا بەڕێوەو هەموو فەرمانێك لەوەوە دەرئەچێت بۆ بچووکترین شت تا گەورەترین شت لەم گەردوونەدا...لەبەرئەوە باوەڕی تەواومان هەیە بەو کتێبە ئاسمانی یانە کەباسی ئەکەن، بەکورتی ئەگەر بەدرێژی باسی دروست کراوەکانی و گەورەیی خۆی بکەین ئەم باسە کۆتایی نایەت.

٢٤ ) **مالكولم دتكان وينر:** پزیشکی ناوسك/ بڕوانامەی بکالوریوسی لەزانستی زیندەوەرزانی لەکۆلیژی هویتن و دکتۆرا لەپزیشکی لەزانکۆی نورث وسترن/ لەنامەکەی دا – دەربارەی ڕاستی ئاین سەلماندویەتی – کەئاین و کتێبە ئاینی یەکان واتە ئاسمانی یەکان ڕاستن، زانست هێشتا نەگەبشتووەتە ئەوزانینە لەو کتێبانەدا هەیە کەدووجۆرە: مێژوویی – زانستی.

بێجگە لەهەزاران ئامۆژگاری مرۆڤایەتی و یاسایی و دادوەری و کۆمەلایەتی.

٢٥ ) **لستر جون زمرمان:** زانای خاك و ڕووەك دکتۆرا لە زانکۆی بۆرد ئەڵێ:

ئێمە جاری وا هەیە ئەبین بەفەیلەسوف:

کاتێ بەلای کێڵگەیەکدا تێ پەڕئەبین ئەو هەموو گەنم و دانەوێڵەو بەروبوومە جۆراوجۆرانە ئەبینین پێگەیشتووە لەبارە بۆ خۆراکی مرۆڤ...پرسیارێك لەخۆمان ئەکەین/ ئەم هەموو شتانە لەکوێ وەهاتن؟

گەورەمان عیسی (د.خ) فەرمووی بەیەکێ لەقوتابی یەکانی:

ئەگەر گەنم نەمرێت و نەبێت بەپووش پاشان دەنکەکەی نەچێتە ژێرخاك ژیانی نویێ ی دروست نابێتەوە...

بەڵام بێ گومان ئەبێت ئاوهەبێت تاکوو ژیانیش هەبێت هەروەها خۆراکی پێویستەو تیشکی خۆرو هەوایشی پێویستە.

واتە مردنی گەنمەکەو ژیانەوەی سەرلەنوێ بە ویستی پەروەردگارە

﴿أَمَّنْ يَبْدأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ وَمَنْ يَرْزُقُكُمْ مِنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَإِلَهٌ مَعَ اللَّهِ قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ ﴾ (النمل:٦٤)

واتە: کەسێك کەبوونەوەر دەس پێ ئەکات و پاشان دەیگێڕێتەوە، کێ ڕزقتان ئەداتێ لەئاسمان و زەوی ئایا پەرستراوێك هەیە لەگەڵ پەروەردگارا بەڵگەتان بێنن ئەگەر ڕاست ئەکەن.

٢٦ ) **روبرت هورتون كاميرون:** زانای بیرکاری ( بڕوانامەی دکتۆرای هەیە و مامۆستای بیرکاری یە لەزانکۆی مندیسوتا ) ئەڵێ:

بیرکردنەوە بریتی یە لەبەکارهێنانی ڕاستی و توانای بڕیاردان ڕاستی هەڵەو هەندێ شت دەرئەخا بەڵام ئەقڵ بڕیاری لەسەرئەدات هەموو ئادەمیزاد هەستی هەیە بەچاك و خراپ بەڵام بیروبۆچوونیان جیاوازە.

زانستی دەروونی ئەڵێ ئەقڵ سێ هێزە: (توانا، زانین، هەست) بۆیە منیش ئەقڵم بڕیارێکی دەرکردو توانام جێ بەجێ ی کرد...

ئەویش باوەڕی تەواومەبە پەروەردگار.

ئادەمیزاد لەم ڕەوشتانەدا پێش کەوتووترە لەگیان لەبەران بۆیە بە پیرۆز ترین بوونەوەو ناسراوە لەسەر زەوی و ناوی براوە لەلایەن پەروەردگارەوە، لەکتێبە ئاسمانی یەکان دا هاتووە: کەئادمیزاد بە دوو ڕێگە فێری زانست ئەبێت ئەویش بینایی و بیذین، بینایی ئەوەیە چاوهەستی پێ ئەکا لەدەوروبەرمان لەپێویستی ژیان مان دا.

بەڵام بینین. ڕووناکی یە لەناو دڵ و دەروونمان دا پەروەردگار پیٚ ی بەخشیوین بۆ دۆزینەوەی شتێك کەنایزانین واتە بەتەماشاکردنی شتە سەرسوڕهێنەرەکانی و بەبیرکردنەوەی ڕووناك پەروەردگار ئەبینین.

﴿ يُؤْتِي الْحِكْمَةَ مَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْراً كَثِيراً وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ﴾ (البقرة: ٢٦٩)

واتە: پەروەردگار دانایی ئەدات بەهەرکەسێك بیەویٚ هەرکەسێکیش ئەو داناییەی پێدرا لەلایەن پەروەردگارەوە چاکەیەکی زۆری دەست کەوتووە. تەنها خاوەن بیرەکان پەندی لیٚوەرئەگرن.

٢٧ ) **واین أولت**: زانای تایبەتمەند بەکیمیای جیولوجی: بڕوانامەی دکتۆرا لەزانکۆی ((کولومبیا)) ئەڵیٚ:

باوەڕت بەهێزنی یە بەبوونی پەروەردگار تاکوو بەهۆی زانستێکی راستەقینەوە نەچەسپێت و دڵنیانەبێت.

ئەوزانستی یەش زۆربەی لەکتێبە ئاسمانی یەکان دا دیارە کەچەندەها سەدەیە هێشتا هەڵەو ڕەخنەیان لیٚ نەگیراوە بەشێوەیەکی زانستیانە.

﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِنْدِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلَافاً كَثِيراً﴾ (النساء:٨٢)

واتە: بۆچی بیر لەواتاو ئەنجامی قورئان ناکەنەوە، ئەگەر قورئان لەلایەن غەیری خواوە بوایە جیاوازی زۆرتان بەدیئەکرد.

ئەم زانایە لەکۆتایی دا ئەڵیٚ: لەبەرئەوە من لەسەر ڕۆشنایی زانست پەروەردگارم ناسیوە و دروست کەری هەموو گەردوونەو ئەیپەرستم!!.

٢٨ ) **بول إرنست أدولف**: پزیشکی بەناوبانگ و بڕوانامەی ماجیستیر و دکتۆرای هەیە لەزانکۆی (بنسلڤانیا) ئەڵیٚ:

پێم خۆشە بڵێم: من باوەڕی تەواوم بەپەروەردگار هەیە وشکی (گومانی) تێدانی یە ئەمەش تەنها زانستێکی ڕۆحی نی یە بەڵکوو ئەنجامی کارکردنم لەبواری پزیشکیدا باوەڕی بەهێزکردم...

لەبواری کارکردنم لەنەخۆشخانەکان دا دووڕێگەم بەکارهێناوە بۆ چارەسەرکردن:-

یەکـەم: ڕێگـەی پـشت بەسـتن بەپـەروەردگارو تـێ گەیانـدنی نەخۆشـەکە لـەمانای پەروەردگار کەدروست کەری هەموو بوون و بوونەوەرە.

دووەم: ڕێگەی چارەسەرکردنی پزیشکایەتی بەزانستی نوێ.

لەم بوارەدا سەرکەوتنم بەدەست هێناوە.

چونکە ئەوقوفڵەی دراوە لەدەرگای تەندروستی، ئەبێ پەروەردگار کلیلەکەمان پێ ببەخـشێ بۆکردنـەوەی ئەودەرگایـە بـەهێزو دەسـەڵاتی خـۆی و بەوزانـستەی پـێ ی بەخشیوین!!!.

لەبەرئـەوە ئـەڵێم پـەروەردگار هەیـەو هەرئـەوە ئێـسقان و دڵـی شـکاو چـاك ئەکاتەوە......

﴿ أَمَّنْ يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ السُّوءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَاءَ الْأَرْضِ أَإِلَهٌ مَعَ اللَّهِ قَلِيلاً مَا تَذَكَّرُونَ﴾ (النمل:٦٢)

واتـە: یاکەسـێ کـەوەڵامی دامـاو یـان پـێگیراو ئەداتـەوە کـاتێ هـاواری بۆئەبـەن و کێـشەو کۆسـپیان بۆلائـەبات و ئێـوە ئـەکات بەجێنـشینی پێـشینان لەئـەرزدا ئایـا پەرستراوێکی تر لەگەڵ پەروەردگارا هەیە بێگومان (نی یە) زۆر کەم بیردەکەنەوە!

٢٩ ) **سیسل هامان:** زانای بایۆلۆجی: بڕوانامەی دکتۆرای هەیە لەزانکۆی ((جوردو)) ئەڵێ:

لـەجیهانی زانـست دا ( تەماشای هەرلایـەکم کرد) ووردەکـاری و هێزو دەسـەڵات و جوانی و ڕێـك و پێکـی و یاسـام دی لەدروسـت کراوەکـانی پـەروەردگار بۆیـە بـاوەڕی تەواوم هەیە بەبوونی.

ئەگـــەر تەماشـــای ئاسمـــان بکـــەین ســـەرمان ســـوڕئەمێنێ لـــەزۆری مـــانگ و ئەسـتێرەوخۆر، بەیاسـایەکی ڕێـك و پێك ئەجووڵێنـەوەو مەلەئەکـەن لەئاسمانـەکان دا هـیچ جـۆرە هەڵەیـەك نـی یـە لـەجموجوڵمان دا بـەجۆرێك مـانگ گیران و خـۆرگیران.... ئـەزانین کـەی ڕووئـەدات پـێش چەندسـاڵێکیش، ئەگـەر بچووکترین گۆڕانکـاری ببوایـە نەمان ئەزانی دوای چەندساڵێك خۆر یان مـانگ ئـەگیرێ ئـەم زانـستە دەنکە گەنمێکـە لەهەموو گەنمەکانی جیهان دەربارەی گەورەیی و دەسەڵاتی پەروەردگار، لەبەرئەوە مـن

باوەڕم هەیە بەخوا کە خوای من و هەموو گەردوون و بوون و بوونەوەرە ئەی بینم هەروەکوو شتەکانی دەورووبەرم، پەروەردگار دڵی ئەوانە ڕۆشن ئەکاتەوە کە بەشوێنی دا ئەگەڕێن و ئەیدۆزنەوە...

٣٠ ) **ئەدیسۆن**: زانای ئیگلیزی بەناوبانگ – خاوەنی (١٠٠٠) هەزار دۆزینەوە کەلەپێش هەموویانەوە کارەبایە کاتێ لەفەرەنسا لەشاری پاریس ئەندازیاری شارەزاو کارامە (إیڤل)بورجەکەی دروست کرد، بۆیەکەم جار ئەدیسۆن رۆیشت بۆ تەماشاکردنی، پاشان لەتۆمارگەی ئاڵتونی بورجەکەدا ئەمەی نووسی:

(بۆ بەڕێز ( إیڤڵ) لەئەدیسۆنەوە، کەزۆر ڕێزی هەیە بۆ هەموو ئەندازیارەکان بەلاّم لەسەرووی هەموویانەوە ئەندازیاری گەورە (پەروەردگار) ئیمزا/ ئەدیسۆن

لێرەدا پێویستە ئەوە بزانین زانایەکی وەکوو ئەدیسۆن خاوەنی (١٠٠٠)هەزار دۆزینەوە کەیەکێکیان دۆزینەوەی هێزی کارەبایە چی ئەڵێ؟؟

دەربارەی پەروەردگار ...کەوابوو: ئەی نەزانی نەفامی خوانەناس تۆچیت زانیوە؟ چیت دۆزیوەتەوە بۆ خزمەتی مرۆڤایەتی؟ تەنها فێری ووشەیەك کراوی (خوا نی یە) ئێمە هەزاران بەڵگەمان لەبەردەستدایە شاهیدی بوونی پەروەردگارن. ئەی تۆچیت بەدەستەوەیە؟ سەرنجی ئەوقسەیەی ئەدیسۆن بدەو سەرنجی قسەکەی خۆت ئینجا ئەزانی و خۆت دێتەبەرچاوت کەزۆر هەڵەی ... بۆیە پێت ئەڵێم ڕاستی بدۆزیتەوە پەروەردگار هەموومان بخاتە سەرڕێ ی ڕاست.

٣١ ) ( **ئەلبرت ئەنیشتاین** ): زانای ئەڵمانی بەناوبانگ و شارەزای زانستی فیزیا – (خاوەنی تیۆری ڕێژەیی (النظریة النسبیة) خاوەنی بڕوانامەی دکتۆرا لەزانکۆی زویریخ و خاوەنی جائزەی نۆبڵ لەفیزیادا) ئەڵێ:

باوەڕ بەبوونی پەروەردگار کەدروست کەری گەردوونە، بەهێزترین جووڵێنەرو پاڵ پێوەنەرە بۆ دۆزینەوەی زانستی ڕاست و دروست. ص١٠١ ((مولد الكون)) أمید شمشك.

هەروەها دیسانەوە ئەنیشتاین ئەڵێ:

ئـاینی مـن سەرسـوڕمانمە لـەو ڕۆحـە بـەرزەی کەسـنووری نـی یـە لەبەشـە زۆر ووردەکاندا دیـارە کەئـەقڵی لاوازی ئێمـە کـەمێك هەسـتی پـیٚ ئـەکات، هـەوەها بـاوەڕی تەواوم بەوهێزەو بەوئەقڵە گەورەیە هەیە کەهەموو گەردوونی دروست کردووە.

ئەو باوەڕەشم باوەڕە بەبوونی پەروەردگار:

((مَعَ اللّه فِي السماء)) ص٢٠٨ د. أحمد زکی.

٣٢ ) ( **أسـحاق نیـوتن** ): زانـای ئینگلیـزی شـارەزای بیرکـاری و فیزیـا لـەزانا هـەرە بەناوبانگەکانی مێژووی مرۆڤایەتی یە.

خاوەنی دۆزینەوەی هێزی ڕاکێشانە (القوة الجاذبية)

ئەڵیٚ: گومانی تیٚدا نی یە دروست کەری گەردوون هـەموو نهێنـی یـەکانی گـەردوون ئەزانیٚ بەبیٚ کەم و کوڕی.

((رؤية علمية لِلإيمان)) ص٦٢/ محمد رشيدی.

**هەروەها ئەم زانایە ئەڵێ:**

چۆن لەشی ئەم هەموو گیان لەبەرانە بەم شێوە ڕێك و پێك و جوانە دروست بوو؟ ئایا چاو بەبێ زانست ئەزانێ چی بینیووە؟ یان گوێ بەبێ زانست ئەزانێ چی بیستووە؟ بێ گومان نەخێر ئەی ئەو گیان لەبەرانە ئەو هەموو کارانە چۆن ئەزانن هەر کەلەدایك ئەبن؟

بۆ نموونە/ بەچکە دەمی بۆ گوانی دایك ئەبات و زەرنەقوتەش دەم ئەکاتەوە دایکە شتێك بخاتە دەمی یەوە بیخوات....هەزاران کاری تری لەم جۆرە ئایا ئەمە نیشانەی بوونی پەروەردگار نی یە... هەمان سەرچاوەص٣٣.

## هەروەها ( إسحاق نیوتن ) دیسانەوە دەڵێ:

گومان نی یە لەبوونی پەروەردگار، ئەم لقە جیاوازانە لەم بوونەوەرانەدا و ڕێك و پێکی بەشەکانیان و گونجاندیان لەگەڵ یەکترو لەگەڵ کات و شوێنی نیشانەی ئەوەیە لەلایەن زانایەکی خاوەن زانستی هەموو گەردوونەوەیە.

دیسانەوە ئەڵێ: مەبەستم لەتاقی کردنەوەکانم و باسە زانستی یەکانم ئەوەیە بگەمە رادەیەك خاوەن ئەقڵە ڕاستەکان بخەمە سەر باوەڕهێنان بەپەروەردگار.

٣٣ ) **ماکس بلانك**:زانای ئەڵمانی خاوەنی تیۆری (الکم) و خاوەنی جائزەی نۆبڵ لەفیزیادا ئەڵێ:

ئاین و زانست بەیەکەوە ئەجەنگێن دژی نەزانین و دوودڵی و خەرافیات، سەرکەوتنی ئەم جەنگەش ئەنجامەکەی دەرکەوتن و بوونی پەروەردگارە

هەروەها ئەم زانایە ئەڵێ:

هەرزانایەك لەگۆڕەپانی زانست دا کاربکات ئەم ووشەیە ئەخوێنێتەوە(باوەڕ) چونکە باوەڕ شتێکە هیچ زانایەك ناتوانێ وازی لێ بێنێ و بەڕاستی نەزانی کتێبی (الإنفجار الکبیر) ل٦٩ أمیدشمشك

٣٤ ) **گالیلۆ**: داهێنەری تەلەسکۆب ئەڵێ: من قەرزاری پەروەردگارم کەتوانای دام و زانستی پێ بەخشیم ئەم دروست کراوە جوان و سەرسوڕهێنەرانەی ببینم کەئادەمیزادی پێشوو نەیاندیوە

٣٥ ) **روبـرت مـوريس:** داهێنـەری ڕادار ئـەڵێ: باوەڕهێنـان بەپـەروەردگار کـارێکی تایبەتە کەلە هەست و ویژدانی مرۆڤدا سەوز ئەبێت.

٣٦ ) **داروین:** خاوەنی تیوری گەشەکردن (نظریة التطور) ئەم زانایە لەسـەرەتاوە بوومەلەرزەی خستە بیروباوەڕی تێگەیشتووانەوە..... لەکۆتایی تەمەنیدا گەڕایەوە سەر ڕاستی و باوەڕی هێناو – ووتی:

(هەرگیز ئەقڵی تێ گەیشتوو – ئەقڵی زانا –گەردیلەیەك گومانی نابێت کەئەم گەردوونە فراوانە ئەم هەموو نیشانانەو ئەم هەموو گیان لەبەرانەو ئەم هەموو مرۆڤانە..... هتد

لەئەنجامی ڕێك کەوتنی کوێرانەوە دروست بووبن........

چونکە ڕێکەوت یاسا دروست ناکات، ڕێکەوت حوکم نادات ئەم راستیەش باشترین نیشانەی بوونی پەروەردگارە!!

٣٧ ) **کلودم هاثاوای زانای یابانی:** دروست کەری ئەقڵی ئەلەکترۆنی ئەڵێ:

دوای کارکردنم لەڕێکخستنی ئامێری کارەبایی بۆم دەرکەوت: ئەندازیار فێرئەبێ چۆن ڕێزبنێ لە یاسا، هەروەها ئەتوانێ چۆن مامەڵەبکات لەگەڵ ئەو کێشانەی دێتەڕێ ی بۆجێ بەجێ کردنی ئامانجێکی دیاری کراو لە کۆتایی دا ئەڵێم پەروەردگار هەیە و ڕاستە.

٣٨ ) **فیثاغورس:** خاوەنی تیۆرەکانی بیرکاری ئەڵێ:((ژمارە حوکمی گەردوون ئەکات نیشانەی بوونی دروست کەرێکی گەورەیە، کەپەروەردگارە، هەموو بەشەکانی ئەم جیهانەی بەستووە بەیەکەوە بەزانستێکی زۆر سەرکەوتوو، بەحسابێکی ووردەکاری، کەبەهاوکێشەو ژمارەو یاسا بۆمان دەرئەکەوێ.

٣٩ ) **فەیلەسوفی بەناوبانگ (أمرسن) ئەڵێ:** لەتوانای ئادەمیزادا هەیە پەروەردگار ببینێ لەقوولایی دڵیەوە، هەروەها ئەگەر بەویژدان گوێ بگرێ دەنگی پەروەردگار ئەبیسێ لەناخی دەروونی یەوە.

کتێبی (کیف نری الله) ل١٢٤ شاکر عبدالجبار

٤٠ ) **لۆرد کالڤن:** داهێنەری گەرمی پێوی (کالڤن) پلەی سفر لە گەرمی پێوی کالڤن دا/ ٢٧٣° پلەی سەدی یە لە ژێر سفرەوە ئەم زانایە ئەڵێ:

ئەگەر بەزانستیانە بیربکەینەوە زانست ڕامان ئەکێشێ بۆ باوەڕهێنان بەبوونی پەروەردگار.

لێرەدا کۆتایی ئەهێنین بەزاناکان چونکە ئەگەر باسی هەموو زاناکان بکەین پێویستمان بەچەند کتێبێك هەیە نەك تەنها ئەم کتێبە.

کەوابوو بۆمان دەرکەوت چۆن گەورە زانایانی جیهان بەهۆی زانستەوە باوەڕیان بەپەروەردگار هێناوە.

وەلەم ئایەتە پیرۆزانەدا سەرنج بدە پێش ١٤٠٠سالٌ زیاتر ئەم باسە ڕوون کراوەتەوە لەسەردەمی نەزانین دا

﴿وَيَرَى الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ الَّذِي أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ هُوَ الْحَقَّ وَيَهْدِي إِلَى صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ﴾ (سـبأ:٦)

واتە : ئەوانەی زانستیان هەیە ئەبینن و ئەزانن ئەوەی بۆ تۆهاتووە لەلایەن پەروەردگارەوە راستەو بە جێ یە و ڕێنومایی دەکا بۆ ڕێگای خوایەکی بە دەسەلاٌت و سوپاسکراو.

هەروەها پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿ وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَلِكَ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ﴾ (فاطر:٢٨)

واتە: لەناو بەندەکانی پەروەردگارا زاناکان ترسی خوایان لەدڵدایەو ئەزانن پەروەردگار چی یە و ئەیبینن.

کەوابوو بۆمان دەرکەوت پەروەردگارە دروست کەری هەموو گەردوون و بوون و بوونەوەر.

## (بوونی پەروەردگار - ڕاستییەکی تەواوە)

نووسینی: زانای سروشتی/ أندرو كونواى إيفى/ سەرۆكی بەشی زانستی كۆلیژی پزیشكی لە زانكۆی شیكاغو..

سەرەتا پرسیارێك ئەكات و ئەڵێ:

ئایا پەروەردگار هەیە؟ وەڵام ئەداتەوە:

بەڵێ من باوەڕم هەیە بەبوونی پەروەردگار، هەروەكوو چۆن باوەڕم بەشتێك هەیە هەستی پێ ئەكەم و دەستی لێ ئەدەم هەروەها هەروەكوو باوەڕم بەبوونی خۆم هەیە.

باوەڕكردن بەبوونی پەروەردگار تاكە هۆی ئەقڵی تەواوە كەمانایەك بۆئەم بوون و بوونەوەرە دابنێ و مانای بوونی ئادەمیزادیش كەتەنها لەشی لەماددەو ووزە پێك نەهاتووە بەڵكو ئەقڵ و هەست و بیرو ڕۆحیشی هەیە.

هەروەها باوەڕكردن بەبوونی پەروەردگار سەرچاوەی بڵاوبوونەوەی برایەتی و خۆشەویستی یە لەنێوان ئادەمیزاد بەهۆی ئەوەوە كەهەموویان پەروەردگاریان خۆش ئەوێ و سەرچاوەی هەست كردنیانەبەئەرك و ماف.

چونكە ئێمە ڕێك نابین تاكوو لەبەزەیی و خۆشەویستی و یەكسانیدا ڕێك نەبین.

هەروەها باوەڕكردن بەبوونی پەروەردگار ئەمان پارێزێ لەهەموو كردەوەیەكی خراپ.....

## ((ڕاستی - بوونی پەروەردگار ئەسەلمێنێ))

ئەتوانین ڕاستی بەكاربێنین بۆ سەلماندنی بوونی پەروەردگار.

ئەمەش بەهۆی بیركردنەوە لەئەقڵ ماندا، توماس ئەكوینی ئەم ڕێگەیەی گرتەبەر بۆ دۆزینەوەی پەروەردگار، دوای ئەمیش ملیۆنەها خەڵكی تر هەربەبیركردنەوەو لێك دانەوەی ئەقڵی بۆیان دەركەوت پەروەردگار: ڕاستی یەكە هەموو خاوەن بیروهۆشێك ئەیبینێ.

## (( خوانەناسین لەسەر بناغەی ڕاست نی یە ))

هیچ کەسێك نی یە بیسەلمێنیٚ، بوونی پەروەردگار (هەڵەیە) هەروەها ناتوانیٚ بڵیٚ پەروەردگار نی یە..

ئەتوانیٚ کوێرانەو لەسەر ڕایەکی دەمارتوندی خۆی بڵیٚ پەروەردگار نی یە ، بەلاٚم ناتوانیٚ بیسەلمێنیٚ بەبەڵگە. زۆرمان خوێندۆتەوە زۆرمان بیستووەو بەڵگەی زانستی زۆرمان لایە کەپەروەردگار هەیەو بوونی ڕاستە ، بەلاٚم هیچ زانستێك و هیچ بەڵگەیەك نی یە پێچەوانەی ئەم بوونە.

هەروەها شیرینی ئەو بیرەپاکەمان چەشتووە کەباوەڕە بەبوونی پەروەردگار، بیٚ باوەڕانیش تاڵی ئەوبیرەی خۆیان ئەچێژن کەکوفرو ئیلحادە.




**وێنەی ژمارە ( ٢ ) لەشی فیرعەون ڕەمسیسی دووەم**
**شوێنەواری چەوو لمی دەریای پێوەدیارەو لەناو توکەسەریدا**
**زیخ و چەو دۆزراوەتەوە**




**وێنەی ژمارە ( ٣ ) لەشی فرعەون بەشێك لە پێستەکەی کەڕووی هێنابوو، دەستەیەك لە پزیشکانی فەرەنسا بەهۆی تیشکەوە چاکیان کردەوە**

**خوانەناسەکان ئەڵێن:**

ئەگەر پەروەردگار وەکوو ئادەمیزادێك بووایە هەستمان پێ بکردایە ئەوکاتە باوەڕمان ئەهێنا بەبوونی.

کەوابوو ئەیانەوێ هەروەکوو زۆردارەکان لەسەر زەوی و ئەوانەی بێجگە لە زوڵم و فەساد هیچ چاکەیەکیان نەبوو، خەڵکیش لەترسا کڕنوشی بۆ ئەبردن ئەوەیان ئەوێ....

هەروەکوو فرعەونی میسر (رەمسیس ی دووەم) ئەیووت من خوام و کڕنوشم بۆبەرن، بەڵام باخوانەناسان زۆر چاك بزانن ئەوگەورانەی کەڕابوردن لەم جیهانەدا زۆر زۆر بچووك بوون و بێ هێزو بێ دەسەڵات بوون لەبەردەم دەسەڵاتی پەروەردگارا ، ئەوەتا دوای دووهەزارساڵ ئەوەی لەقورئانی پیرۆزدا پێش هەزارو چوارسەدساڵ باس کراوە هاتەدی کە فرعەونی میسر ئەیویست گەورەمان (موسی) (عليه السلام) لەگەڵ هاوڕێکانی بکوژێت... چۆن ئەمان ڕزگاریان بوو بەڵام فیرعەون و کۆمەڵەکەی لەئاوی دەریای سوور (البحر الأحمر)دا نقوم بوون.

پەروەردگار لەشی فیرعەونی هێشتەوە تاکوو نموونەبێت بۆئەوانەی دوای خۆی تەماشای وێنەی ژمارە / ٢ / و ژمارە / ٣ / بکە ئەوسا تێ ئەگەی دەسەڵاتی دەسەڵاتی پەرەوەردگارە نەك هی هیچ کەسێکی تر. هەروەکو لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە:

﴿ فَالْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ آيَةً وَإِنَّ كَثِيراً مِنَ النَّاسِ عَنْ آيَاتِنَا لَغَافِلُونَ﴾ (یونس:٩٢)

واتە: ئەمڕۆ لاشەکەت رزگارئەکەین بۆئەوەی نیشانەبێت بۆئەوانەی دوای خۆت، زۆربەی خەڵك لەنیشانەکانمان بێ ئاگان.

لەشی فرعەون دەرئەکەوێ کەشوێنەواری چەوولمی دەریای سووری پێوە دیارەو لەناو تووکەسەریدا زیخ و چەو دۆزراوەتەوە ، بەشێك لەپێستەکەی لەشی کەڕووی هێناوە، دەستەیەك لەپزیشکانی فەڕەنسا ئەمەیان راگەیاندوو ئەڵێن فرعەون (رەمسیسی دووەم) لەناو ئاودا خنکاوە، ئەم پزیشکانە بەهۆی (الأشعة) تیشکەوە

پێستەکەیان چاك کردووەتەوەو ئەبێ بمێنێ و ببێت بەئامۆژگاری بۆ هەموو ئەوانەی دوای خۆی دێن.کەوابوو ئەبێ پەندوەرگرین لەو زۆرداره ناپاکەی مێژوو.

**هەندێ لەبێ باوەڕان ئەڵێن:**

ئەوە دوعای گەورەمان موسی بوو فرعەون وای لێ هات: ئەی باشە بۆچی ئێمە دوعا ئەکەین سوودی نی یە؟ کەوابوو دوعای موسی ڕێکەوت بووە وەڵام دانەوەی پەروەردگار نەبووە؟

ئێمە ئەڵێین: گەورەمان موسی ڕابەرو نێرراوی پەروەردگاربووەو پەروەردگاریش یارمەتی دەری بووە.

ئەوەی ویستی پەروەردگاربناسێ ئەیناسێ بەبێ هیچ بەرامبەرێك چونکە پەروەردگار راستی یەکە روون و ئاشکرایە، پێویست ناکات لەبەر ، بەرژەوەندی تایبەتی خۆمان بیناسین یان بیپەرستین، بەڵام بەخواپەرستی و برایەتی و بەیەکیەتی و یارمەتی دان و هاوکاریکردنی یەکتری ئەتوانین یاساکانی سەرزەوی وەکوو یاساکانی ئاسمانی لێ بکەین و یەکسانی و دادوەری لەسەر زەوی پیادەبکەین.

((**پێویستە باوەڕو هیواو خۆشەویستی بەئەقڵ دابمەزرێت**))

باوەڕهێنانم بەبوونی پەروەردگار، کەدروست کەری هەموو گەردوون و بوون و بوونەوەرە، ئاگاداریم ئەکات و ئاگاداریت ئەکات.

لەسەربناغەی ئەقڵ دامەزراوە، ناتوانین بڵێین باوەڕمان هەیە تاکوو لەسەر ئەقڵ و هیواو خۆشەویستی دانەمەزرێت.

هیچ باوەڕدارێك ناتوانێ وازبێنێ لە ئەقڵ، چونکە هەرباوەڕێك بە ئەقڵ دانەمەزرێت ئەوە لاوازەو لەئەنجاما شکست دێنێ و لائەدات لە ڕێگەی ڕاست.

باوەڕهێنان بەپەروەردگار، هەربەوشێوەیەئەبێت، کەباوەڕمان هەیە بەماددەو گەشەکردنی و لەپاشەڕۆژا زانست پێش ئەکەوێ هەزاران سوودی تازە لەم ماددەیە ئەدۆزینەوە بۆ مرۆڤایەتی.

بەیانی ڕۆژ بوویەوە هەرکەسە ئەچێتە سەرکاری خۆی لەپێناوی ماددەدا، بەڵام ئەبێ بیری ئەوەی هەبێت کەباوەڕەکەی ڕێ ی فڕوفێڵ نادات لەکارەکەی دا، ئەگەر پەیڕەوی ئامۆژگاری پەروەردگاری کرد. ئەوکاتە ئەبێتە مرۆڤێکی سوودبەخش بۆ کۆمەڵ. بەڵام ئەگەر باوەڕی هیچ نەبوو، پەروەردگاری نەناسی و نەترسا، ئەوە مرۆڤێکی بێ ویژدان ئەبێت و ترسی لێ پرسینەوەی نی یە و کاری خراپ و چاك وەکوویەك وایە لەلای.

ئەوەتا زۆر بەڕوون و ئاشکرا، کاتێ (توماس جیفرسن) نامەی سەربەخۆیی ئەمەریکای خوێندەوە بەم جۆرەبوو:

(ئێمە ئەم ڕاستییانە ئەزانین و شکمان نی یە خەڵك هەمووی یەکسانن پەروەردگار هەندێ مافی سەرەکی پێ داون کە بریتی یە لەمافی ژیان، مافی سەربەستی و بەختیاری و یەکسانی، بۆپاراستنی ئەم مافانە حکومەت دروست ئەبێت و هێزی ئەم حکومەتەش لەخەڵکی خۆیەوە ئەبێت).

دیارە ئەبێ هەندێ هۆی نهێنی و ناوخۆیی (یان باوەڕ) پاڵی بە توماس جیفرسن وە نابێت ئەم ڕاستی یە بدرکێنێ و نەتوانێ بیشارێتەوە.

هەرشتێك بەڕاست بزانین ئەبێ زانیندمان هەبێت لەوبارەیەوە ئینجا بەڕاستی بزانین ، واتە باوەڕ پێویستی بەزانست هەیەو قورئانی پیرۆز سەرچاوەی گەورەترین و پێش کەوتووترین زانستە لەڕابردوو هەروەها ئێستاو لە پاشەڕۆژیش دا.

کەواتە دروست کراوەکانی پەروەردگار باشترین نیشانەو بەڵگەن بۆ باوەڕهێنان، هەروەها هیچ کارتێکردنێك نی یە بەبێ هۆیەکی کاریگەر، بەم شێوەیە بۆمان دەرئەکەوێ هەموو دروست کراوێك دروست کەرێکی هەیەو دروست کەری هەموو شتێك پەروەردگارە. پەروەردگاریش ئەزەلی یە.

((پەروەردگار کێ یەو شێوەی و ڕەوشتەکانی چۆنن))؟

پرسیارێکە زۆرجار ئاڕاستەی خواناسان ئەکرێت و پێویستە وەڵامی بدەینەوە:

یەکێك لەهاوڕێ کانم پێ ی ووتم: زۆربەی زاناکان کافرومولحدن ئایا ئەمەڕاستە؟ منیش ووتم ئەم قسەیە راست نی یە بەڵکو بەپێچەوانەوە لەئەنجامی خوێندنەوەی

زانست و رای زاناکان بۆم دەرکەوتووە زۆربەیان کافر نەبوون و باوەڕیان بەپەروەردگار هێناوە.

بەڵام زۆربەی خەڵك لە قسەکانیان تێ نەگەیشتوون.

کوفرو ئیلحادی ماددی پێچەوانەی زانست و زاناکانە، چونکە زاناکان ئەڵێن هیچ دروست کراوێك بێ دروستکەر نی یە هەروەها ئەقڵ بەکار ئەهێنن لە دۆزینەوەی راستی یەکان دا، زۆربەی زاناکان بەردەوام کاردەکەن لەخۆشەویستی پەروەردگارو زانین و خەڵك دا.

کاتێ زاناکان قسە ئەکەن دەربارەی لەشی ئادەمیزاد وەکوو دروست کراوێك تەماشای ئەکەن بەڵام باسەکەیان لەسەر بناغەی هۆکان و ئەنجامەکان ئەکەن.

هەروەها یەك پارچەیی گەردوون و یاساو ڕێك و پێکی یەکەی هەروەکو لەشی ئادەمیزاد بەدروست کراوێك تەماشای ئەکەن.

کاتێ ئیش و کاری هەرئەندامێك لەئەندامەکانی لەشی ئادەمیزاد باس ئەکەن ئەبینن هەرخانەیەك لەخانەکانی ئیش و کاری تایبەتی خۆی هەیە بۆ پاراستنی هەموولەش.

لە زانستی ئیش و کاری ئەندامەکان دا پەڕەکانی ملی ماسی ئەوە ئەگەیەنێ: ئاو لەپێش هەموو شتێکەوەیە بۆژیانی.

هەروەها باڵی باڵندەکان و سی یەکانی ئادەمیزاد ئەوە ئەگەیەنێ هەوا لەپێش ترە بۆ ژیانیان چاوی ئادەمیزاد ئەوە ئەگەیەنێ تیشك لەپێش ترە بۆ بینین هەروەها گەڕان بەشوێن زانست دا ئەوە ئەگەیەنێ راستی لە پێشترە بۆ ڕووداوەکان..

ژیانیش ئەوە ئەگەیەنێ یاسای سروشتی پێویستە بۆی لەپێش هەموو شتێکەوە کەوابوو:

بیرکردنەوەی قووڵ و خاوێن، ئازایەتی یەکی گەورە، ئەرکێکی بەرز، باوەڕێکی لەبن نەهاتوو، خۆشەویستی یەکی زۆر.... ئەوانە ناگەڕێنەوە بۆ شتێکی رابردوو بەڵێ ئەگەڕێنەوە بۆ ئەقڵێکی سەروو لەپێش هەموو شتەکانەوەیە، ئەویش پەروەردگارە، کە هەموو خاوەن ئەقڵەکان پەروەردگار بەگەورەترین و بەرزترین ئەقڵ ئەزانن.

هیچ کەس نی یە ئەم یاسایە هەڵەی لێ بگرێ چونکە بەبێ ئەم یاسایە هەرچی ژیان و زیندەوەر هەیە ئەفەوتێ. کەوابوو ئەم یاسایە بوونی راستەو تاقی کردنەوە باشترین هۆیە بۆ گەیشتن بە ئەنجام.

خوانەناسەکان گومانیان هەیە لەم ڕاستی یە، پەڵەیەکی کوێرکەر ( یان سڕکەر ) لەناو ئەقڵیان دا هەیە، کەئەم هەموو بوون و بوونەوەرە بە گیاندار و بێ گیانەوە لەخۆیانەوە دروست بوون و لەخۆیانەوە لەناو ئەچن.

**زانای بەرز ( ئەنیشتاین ) ئەڵێ:**

ئەوکەسەی ژیانی خۆی و ژیانی کەسانی تر بەبێ مانا بزانێ خۆی بێ مانایە و شایانی ژیان نی یە.

لێرەدا ڕووم کردە هاوڕێکەم ، ئایا لەپەروەردگار تێ گەیشتیت؟ کامەیە؟ ووتی بەڵێ ، بەڵام ئایا پەروەردگار چ جۆرێکە؟

منیش تێ گەیشتم کەزانست خوازەکان یەکەم پرسیاریان ئەڵێن:

(ئایا پەروەردگار هەیە؟ کام جۆرەو چۆنە؟ مەبەست لەژیان چی یە؟ ڕاست و هەڵە کامەیە؟

منیش وەڵامم دایەوەو پێم ووت:

ئەندازیارێك ئامێرێك دروست دەکات بە نەخشە دروستی ئەکات و کارێکی تایبەتی پێ ئەنجام ئەدات و دوای دروست کردنی وازی لێ ناهێنێ.... لەکاتی کارکردنیا پارێزگاری ئەکات و هەمیشە پاکی ئەکاتەوەو ڕێك و پێکی ئەکات بۆئیش کردن و بەرهەم هێنان ئایا پەروەردگارێك ئەم گەردوونە فراوانەی دروست کردووە، لەوکاتەوە ئاگاداری نەکردووە کە لەناو نەچێت؟ ئایا.... یاساو نەخشەیەکی بۆ دانەناوە بۆڕێك و پێکی و بەردەوام بوون؟

لە وەڵام دا هاوڕێ کەم گوتی: بەڵێ وایە.

ئەمە ئەگەر خەڵك لەدڵی خۆی دا جێگیری بکات، فێری ڕەووشت بەرزی و نیازپاکی و خۆشەویستی پەروەردگارو خۆشەویستی خۆیان و خەڵك ئەبن. هەرچەندە

لێرەدا ئەم گفت و گۆیە زۆرەو هەمووی تەواونابێت بەڵام پێویستە هەندێ خاڵی ڕوون بکەمەوە:

پەروەردگار ئەزەلی یە.... واتە کاتی دروست بوونی نی یە هەمیشە زیندوەو ماددی نی یە هەروەها ڕووداوێك نی یە.

ڤیرۆزە بە بەزەیی یە چاکەیە.

خراپە ئەزانێ بەڵام خراپ نی یە و خراپی ناوێ، ڕقی لەشتە مادی یەکان نی یە، ڕاستی یە ، زانایە ، خۆشەویستی یە ، سەرچاوەی هەموو چاکەکانە.

پەروەردگار لەقورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿ هُوَ اللَّهُ الَّذِي لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْمَلِكُ الْقُدُّوسُ السَّلامُ الْمُؤْمِنُ الْمُهَيْمِنُ الْعَزِيزُ الْجَبَّارُ الْمُتَكَبِّرُ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ (الحشر:٢٣)

نەوەدو نۆناوی لەم جۆرەی هەیە.

پەروەرگار ئەم ناوە پیرۆزو جوانانەی هەیە پێویستە لەناو دڵ و دەروونی هەموو موسڵمانان دا مانایان بچەسپێ چونکە ئەم ڕەووشتانە گونجاوو لەبارە بۆ هەموو نەتەوەکانی سەرزەوی.

**باوەڕهێنان بەبوونی پەروەردگار: سێ هۆی تایبەت هەیە ئەم باوەڕە لەدڵی هەرکەسێك‌دا چەسپا، لەناو ناچێت: ١) پەروەردەی چاك ٢) زانست ٣) باوەڕ**

**پەروەردەی چاك لەهەموو کاتێك دا لەسەرباوەڕ ئەچەسپێت و دائەمەزرێت.**

بەڵام ئەگەرياسای پەروەردە لەسەر فەلسەفەی سروشتی بێت و ئامانجی تەندروستی و رابواردن بێت.. ئەوە ناگونجێ لەگەڵ چاك بوونەوەی نەخۆشی یەکان دا بەتایبەتی نەخۆشی ، گورچیلە یەك کەخراپ بوو ئەتوانین بیبڕین و لای بەرین، ئێسقانێك خراپ بوو کەڵکی نەما ئەیبڕینەوە لای ئەبەین.

هەروەها هەندێ نەخۆشی تر بەدەرمان و دەرزی چاك ئەبنەوە، بەڵام نەخۆشی دەروونی بەهیچ جۆرێك بەفەلسەفەی سروشتی چاك نابێتەوە بۆنموونە:

دزی و دەست پیسی و داوێن پیسی و خیانەت کردن و دووزمانی و ڕەوشتە خراپەکانی تر ئەندامێك نین بیان بڕین و ڕزگارمان بێت لێ یان.

تەنها بەهۆی پەروەردەی ئاینی یەوە چارەسەری ئەم نەخۆشیانە ئەکرێت بەهۆی بیروباوەڕی چەسپاو لەدڵ و دەروون دا.

**لەبەرئەوە زانای سروشتی( ماکس بلانك )**

ئەڵێ: ئاین و زانستی سروشتی بەیەکەوە دژی دوودڵی و دواکەوتن و خوانەناسی، ئەجەنگێن و هاواری زانکۆ لەم جەنگەدا هەمیشە بۆ پەروەردگارە!!!

لویس پاستۆر: لە مرۆڤە زۆر پاکەکانە ئەڵێ:

ئەگەر پێم بڵێن ئەنجامی زانست کەڵ ی تێ گەیشتی ئایا پەنات بردە ئەوشتانەی هەستی پێ ناکرێ؟

لەوەلاّم دا دەڵێم: بەڵێ هەموو شتێکی دروست کراو دروست کەرێکی هەیەو لەناو دڵ و دەروونمدا کۆمەڵێك بیروبۆچوون هەبوو کە لەهەموو کاتێك دا بۆم نەئەسەلمێنرا، ئەمە ڕێگەی خۆمە بۆ تەماشاکردنم لەشتەکان.

کەوابوو ئەم زانایە پەنای بردوەتە بەر ئەوشتەی هەستی پێ ناکرێ. کەمادیەکان باوەڕیان پێ ی نی یە. بەهۆی زانستەوە ، ئێمەش خۆزگە ئەخوازین کە لەو ڕێگەیەوە فێری زانست ببین کە باوەڕهێنانە بەپەروەردگار.

پەروەردگار قسە لەگەڵ خاوەن ئەقڵەکان ئەکات ، لەقورئانی پیرۆزدا لەزۆربەی ئایەتەکان دا باسی زانست ئەکات:

پێش ١٤٠٠ هەزاروچوارسەد ساڵ کە نەزانین و نەفامی لە نیوە دورگەی عەرەب دا بلاّوبووبوویەوە بێ یاسایی و خراپەکاری پەرەی سەندبوو ئەم قورئانە پیرۆزە خەلاّتی پێغەمبەرمان محمد (د.خ)کرا.

لەوکاتەوە تاکوو ئێستا بەردەوام ماوەتەوەو لەدەرکەوتنی هەر زانستێکی نوێ و هەردۆزینەوەیەك، ئایەتێك ئەبینین پێش ١٤٠٠هەزارو چوارسەدساڵ لەمەوپێش ئاماژەی بۆکراوە لە قورئانی پیرۆزدا:

﴿ اللَّهُ الَّذِي يُرْسِلُ الرِّيَاحَ فَتُثِيرُ سَحَاباً فَيَبْسُطُهُ فِي السَّمَاءِ كَيْفَ يَشَاءُ وَيَجْعَلُهُ كِسَفاً فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلالِهِ فَإِذَا أَصَابَ بِهِ مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴾ (الروم:٤٨)

پەروەردگارە باکان ئەنێریٚ و هەورەکان ئەجوولێنیٚ و بلاّویان ئەکاتەوە بەئاسمان دا هەرچۆنێك بیەویٚ پاشان وایان لیٚ ئەکات بارانیان لیٚ بێتە دەرەوەو بیبارێنیٚ.

زانستی کەش و هەوا ئەمەی پەسەندکردووە کە ڕاستی یەکی تەواوە. هەروەها:

﴿ فَمَنْ يُرِدِ اللَّهُ أَنْ يَهْدِيَهُ يَشْرَحْ صَدْرَهُ لِلإِسْلامِ وَمَنْ يُرِدْ أَنْ يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقاً حَرَجاً كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاءِ كَذَلِكَ يَجْعَلُ اللَّهُ الرِّجْسَ عَلَى الَّذِينَ لا يُؤْمِنُونَ ﴾ (الأنعام:١٢٥)

واتە/ هەرکەسیٚ بیەویٚ پەروەردگار ڕێنومایی بکات سنگی بۆ وەرگرتنی ئیسلام ئەکاتەوە، هەرکەسێکیش بیەویٚ گومڕایی بکات سنگی زۆر تەنگ دەکات و بەجۆرێك وەك ئەوەوایە کە بە تەکان و پلەپلە بەرەو ئاسمان سەربکەویٚ.

لێرەدا زانست سەلماندوویەتی کەئەگەر بەرزبینەوە بەرەو ژوور تاماوەیەك ئەبینین تەنگە نەفەس ئەبین ئەگەر زیاتر بەرزبینەوە ئەخنکێین چونکە هەوا نامێنیٚ.

کەوابوو پێش ١٤٠٠هەزارو چوارسەد سالٚ ئەم ڕاستی یە بە پێغەمبەرمان (د.خ) گوتراوە لەقورئان دا لەلایەن پەروەردگارەوە. ئێستە لەم کاتەدا هەندێك زانست پێش کەوتووە ئەم ڕاستی یەیان بۆ دەرکەوتووە!!!!

هەروەها:

﴿ وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴾ (الذاريات:٤٧)

ماناکەی ئەوەیە: ئێمە ئاسمانمان بەدەستی خۆمان دروست کردو بەردەوامیش فراوانی ئەکەین.

ئەم ڕاستی یە دەمێکە لە قورئانی پیرۆزدا باس کراوە. بەلاّم زانای بەناوبانگ ئەنیشتاین بەزانست سەلماندی گەردوون بەردەوام لەفراوان بووندایە و ئەکشیٚ.

بەم جۆرە خوانەناسەکان بۆیان ڕوون ئەکەینەوە کە قورئان فەرموودەی پەروەردگارە بە(وەحی) نێرراوە بۆ پێغەمبەرمان محمد (د.خ).

هەروەها هەموو ڕاستی یە و هەندێکی زانست سەلماندوویەتی و هەندێکی هێشتا زانست نەگەیشتووەتە ئەو ڕادەیە لیٚ ی تیٚ بگا.

هەروەها خوانەناسان ئەلێن: کیٚ هەیە مردوو زیندووبکاتەوە بەتایبەتی کاتیٚ ئێسقانەکانی لەخاك دائەڕزێن و ئەبنەوە بەخاك؟

پەروەردگار لەقورئانی ڤیرۆزدا وەڵامیان ئەداتەوە:

﴿ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلاً وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَنْ يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنْشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴾ (يّـس: ٧٨، ٧٩).

پـەروەردگار فەرمووییـەتی: خوانەناسـەکان دروسـت بـوونی خۆیـان بیرچـۆتەوە بەڵگەمان بۆ ئەهێننەوە، کێ هەیە ئێسقانی ڕزیو زیندووبکاتەوە؟ پەروەردگار وەڵامیان ئەداتەوە بەپێغەمبەرمان محمد (د.خ) ئەفەرموێ بڵێ ئەوەی یەکەم جار دروستی کردن هەر ئەو زیندوویان ئەکاتەوەو هەرئەویشە لەهەموو دروست کاری خۆی شارەزایە.

بێ گومان ئەگەر مادەمان هەبێت شت دروست کردن ئاسانترە لەوەی کەمادەمان نەبێت، ئەگەر دارهەبێت دروست کردنی کورسی ئاسانەو ئەگەر کورسی یە شکاوێك هەبێت چاك کردنەوەی ئاسانترە لەوەی هیچ نەبێت. ئێمە ناتوانین لەهیچ شت دروست بکەین تەنها پەروەردگارە دروست کاری هەموو شتێك. بوونی لەنەبوون دروست کرد.

# ((ئاسمان و ئاسمانەكان))

**ئاسمان:** یەكەم جار باسی ئا سمان ئەكەین، چونكە شوێنی تەنە گەردوونی یەكانە لەوێوە دەست پیێ ئەكەین و هەرلەوێشەوە بەرەو ناكۆتایی ئەڕۆین.

هەندێ كەس وائەزانێ ئا سمان شوێنی تایبەتەو ڕەقەو حەوت شوێنە وەكوو زەوی ماددەیەو توندوتۆڵە. هەنێك ئەڵێن ئەم حەوت شوێنە، چین چینە، یەكێكیان ئاسنەو ئەوی تریان مسە و یەكێكی تریان زیوەو یەكێكی تریان ئاگرەو یەكێكی تریان زێڕی سوورە.....هتد

بەم جۆرە خەڵكی ناشارەزا لە قورئان و لەزانست ئەم جۆرە قسانە ئەكەن...

بەگوێرەی ئایەتە پیرۆزەكانی قورئان و بەگوێرەی زانستی نوێ و ڕاوبۆچوونی زاناكان ئا سمان بریتی یە لەبۆشایی!!!.

پەروەردگار لەقورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿أَنْزَلَ مِنَ الْسَّماءِ ماءً﴾ واتە لەبۆشایی ئاوی هێنایە خوارەوە بەڵگەش بۆئەم ڕاستی‌یە ئەوەیە لەسورەتی (ألْسَّبأ)داهاتووە... ﴿يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنْزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا وَهُوَ الْغَفُورُالرَّحِيمُ﴾ (سبأ:٢)

لەم ئایەتە پیرۆزەدا مانای ﴿وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا﴾ ئەوەئەگەیەنێ ئا سمان ماددەیەكی رەق نیەو ئەگەر رەق بوایە ئەی فەرموو ﴿وَمَا يَعْرُجُ إليهَا﴾ واتە هەتا سەركەوی هەرئا سمانە لەوشوێنەوە سەرئەكەوێ هەتا ئەو شوێنەی ئەڕۆی یان هەر شوێنێ ئەڕۆی هەر ئا سمانە......

هەروەها فەرموویەتی:

﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنْزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنْتُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ (الحديد:٤)

واتە: پەروەردگار ئەزانێ لەزەوی‌دا چی هەیە و چی دەرئەچێ و لەئا سمانەوە چی دێتە خوارەوەو چی بەرزئەبێتەوە...

هەروەها لەئایەتی ٤٨/ سورەتی الروم هەروەكو با سمان كرد ئەفەرموێ:

﴿ أللَّهُ الَّذِي يُرْسِلُ الرِّيَاحَ فَتُثِيرُ سَحَاباً فَيَبْسُطُهُ فِي السَّمَاءِ كَيْفَ يَشَاءُ وَيَجْعَلُهُ كِسَفاً فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلالِهِ فَإِذَا أَصَابَ بِهِ مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ﴾ (الروم:٤٨)

پەروەردگار ((باكان)) ئەنێری هەور ئەجوڵێنن لەشوێنێكی ئاسمان كۆی ئەكاتەوەو ئەبارێ هەرچۆن بیەوێ!!!. لێرەدا ئاسمان مانای بۆشایی یە ، ئەگەر مەبەستی لە ئاسمان شتێكی ڕەق بووایە یان مادده ئەیفەرموو ﴿فَيَبْسُطُهُ تَحتَ الْسَّماءْ یان فَوقَ الْسَّماءْ﴾ بەڵام زۆر ڕوون و ئاشكرایە پەروەردگار ئاسمانی بەبۆشایی ناوبردووە نەك بەماددەو شتی ڕەق هەروەكو هەندێ نەزان واتێ ئەگەن.

هەروەها لەسورەتی (الاسراء – ئایەتی ٩٣) ئەفەرموێ:

﴿ أَوْ يَكُونَ لَكَ بَيْتٌ مِنْ زُخْرُفٍ أَوْ تَرْقَى فِي السَّمَاءِ وَلَنْ نُؤْمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّى تُنَزِّلَ عَلَيْنَا كِتَاباً نَقْرَأُهُ قُلْ سُبْحَانَ رَبِّي هَلْ كُنْتُ إِلَّا بَشَراً رَسُولاً﴾ (الاسراء:٩٣)

لێرەدا دیسانەوە ئاسمان بەمانای بۆشایی هاتووە

﴿أَوْ تَرْقَى فِي السَّمَاءِ﴾ ئەگەر ئاسمان بەمادده و بەرەقی ناوبرایە ئەی فەرموو ﴿أَوْ تَرْقَى إلى السَّمَاءِ﴾.

كەواتە هەر ناوبردنێكی ئاسمان بە(مفرد) واتە ناوی بەك هاتبێ مانای بۆشایی یە نەك ماددەو ڕەقی ، بەڵام ئەگەر بەكۆ ناوبرا واتە(الجمع) وەكوو (السَّماوات) ئەوە مانایەكی تری هەیە باسی ئەكەین و ڕوونی ئەكەینەوە............ ئەمە باس كردنێك بوو دەربارەی السما و واتە ئاسمان ، ئێستا باسی السَّماوات واتە ئاسمانەكان دەكەین.

## ئاسمانەكان ((يان السَّماوات))

لەمەوپێش ووتمان هەرناوێكی ئاسمان بەتاك هاتبێ مانای بۆشایی یە.

ئەم بۆشایی یە بەتاڵ نی یە واتە خاڵی نی یە و هیچی تێدانەبێت.

هەروەكوو ناتوانین بڵێین جامێكی بەتاڵ بێنە (چونكە ئەوجامە ئەگەر شتی مادی رەقی یان شلی تێدانەبێت ئەوە پڕە لەهەوا ) هەوا لەچەند گازێك پێك هاتووە ، كەوابوو بۆشایی ئاسمان بەتاڵ نی یە و شتی زۆری تێدایە وەكوو چەند چینێكی گاز و ئەثیرو چەندەها تەنی مادی.

كەوابوو ئەگەر فەرموودەی پەروەردگار بەكۆمەڵ هات (السَّماوات) واتە ئاسمانەكان هەریەكێ لەم سێیانەی باسمان كردن ئەگرێتەوە زیاتریش ڕوونی ئەكەینەوە:

### ١) ئاسمانە گازەكان:

زانستی نوێ ئەڵێ: زەوی كاتی خۆی ((خورێك بووە))و گڕداربووە، هەموو تەنێكی گەرم و گڕدار چەند گازێكی لێ بەرزئەبێتەوە لەشێوەی دووكەڵ ، بەڵام كاتێ ژیانی كۆتایی هات و ڕووی ساردبوویەوەو پاشان تەقی یەوە بوو بە نۆپارچە، ئەم نۆپارچەیە، بەهێزی ڕاكێشان دەستیان كرد بەسووڕانەوە بەدەوری ئەم خۆرەی ئێستاداو هەر پارچەی بەگوێرەی كێش و قەبارەی خۆی دووری و نزیكی خۆی وەرگرت لەخۆرەوەو بەردەوام لەوكاتەوە ئەو تەقینەوەیە دروست بووە تاكوو ئێستا بەدەوری خۆردا ئەسوڕێنەوە،

یەكێك لەوپارچانە ئەرزخۆی بوەو هەندێ گەرمای ماوەتەوە تاكوو ئەمڕۆ لەناخی‌دا هەیەو بەردەوام چەند گازێكیشی لێ بەرز ئەبێتەوە لەبوركان و لەبیرە نەوتەكان دا ئەم گازانە دیارن.

كەوابوو لەتەقینەوەكەوە زەوی تاكو ئێستا چەند گازێكی لێ بەرزئەبێتەوەو ئەو گازانەش حەوت جۆرن لەبۆشایی دا لەچینەكانی سەرەوە جێگیربوون هەرگازێك لەپلەیەكی بەرزی تایبەت دا.

هەركامیان قورس بێت ئەوچینە نزمە، هەركامیان زۆر سووك بێت ئەوچینە بەرزترین ئاسمانە و ئاسمانێكی گازی‌یە!!!.

هـەروەها ئەسـتێرە گەڕۆکـەکانی تـریش بـەدەوری خـۆردا، ئـەوانیش ئەوحـەوت ئاسمانە گازی یەیان هەیە.

هەروەکو لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە:

﴿ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَمِنَ الْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ الْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْماً﴾ (الطلاق:١٢)

پـەروەردگار حـەوت ئاسمـانی دروسـت کـردووە و هـەمان شـێوەش حـەوت زەوی دروستکردووە.

فەرمانی پەروەردگار لەنێوانیان دا دێتە خوارەوە، تا ئەو زانیاریەتان بۆ دەر بکەویٚ کە خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیەو بەزانیاری خۆشی چواردەوری هەموو شتەکانی داوەو لە ژێر چاودێری ئەودایە ، لێرەدا هەندێ لە زانایان دەڵێن: حەوت ئاسمـانو حـەوت زەوی یـانی حـەوت ئاسمـانی ئەسـیریو حـەوت ئاسمـانی گـازیو هەروەها دەڵێن: حەوت ئاسمانە ئەثیری یەکان پێش دروست بوونی حەوت ئاسمانە گازی یەکانن ، زاناکـان ئـەڵێن ئاسمانە ئـەثیری یـەکان نابینرێن چونکە زۆر ناسكو ڕوونو بێ وێنـەو بـێ ڕەنگـنو هەسـتیان پـێ نـاکرێ تـەنها ڕۆحـەکان ئـەیانبینن و هەسـتیان پـێ ئەکـەن. بـەڵام ئاسمانـە گـازی یـەکان ئـادەمیزاد هەسـتیان پـێ ئـەکاتو ئەیانبینێو ئەو ڕەنگە شینەی لەسەرەوە ئەیبینین ئەوە ئاسمانە گازی یەکانن.

ئەم ئاسمانە گازیانە لەحەوت چینی گاز پێك هاتوون

کەلەهەوای سەر زەوی یەوە دەست پـێ ئەکـەنو لەبەرگـەبای زەویـش تـێ پەڕئەکـەن بەرەو سەرەوە.

## ــ چینەکانی هەوای زەوی ــ

**یان ( ئاسمانە گازی یەکان )**

زەوی چەند چینێکی گاز دەورەی داوە، زاناکان ئەڵێن ئەم چینە گازانە بەرزیان ٨٠٠ هەشت سەد کیلۆمەترە، دوای ئەم ماوەیە پیٚ ی ئەڵێن بۆشایی ئاسمان ، چینە گازییەکان ئەکرێن بەچەند بەشێکەوە بەم جۆرەی خوارەوە:

**١- چینی یەکەم ( التروبوسفیر ):**

ئەم چینە لەئاستی دەریاوە دەست پیٚ دەکات تاکوو ١٢کیلۆمەتر و پیٚ ی دەڵێن هەوای سەرزەوی ( لەم چینەدا هەورو ڕەشەبا دروست ئەبێت ) هەروەها لەم چینەدا هەتاکو سەرکەوین بەرەو ژوور پلەی گەرماو پاڵەپەستۆی هەوا کەم ئەبنەوە، لەبەرزی ١٢کیلۆمەتر پلەی گەرما نزم ئەبێتەوە بۆ ٥٦ پلەی سەدی لەژێر سفردا.

ئەم چینە هێمن نی یە بەڵکو گۆڕانکاری زۆری تێداڕوو ئەدات. نزیکەی ٧٥٪ گازەکانی بەرگەبا لەم چینەدایە، هەروەها چڕی ئەم چینە لەهەموو چینەکانی هەوای دەوری زیاترە ئەم چینە زەوی ئەپارێزیٚ لەوشتە زیان بەخشانە کەلەسەرەوە دێن بەرەو زەوی.

ئەم چینە تیشکی گەردوونی و تیشکی سەرووی وەنەوشەیی هەڵ ئەمژیٚ، ئەمە نەبووایە ژیان لەسەر زەوی مەترسی پەیدائەکرد.

لەم چینە بەدواوە چەند چینێکی تر هەیە تاکۆتایی بەرگەبا.

**٢- چینی دووەم ( الستراتوسفیر ):**

ئەم چینە ڕاستەوخۆ دوای چینی یەکەم دێت پلەی گەرمای نەگۆڕە نزیکەی ٦٠س° شەست پلەی سەدی لەژێر سفرە.

چینی یەکەم هیچ کارێك ناکاتە سەر ئەم چینە بۆیە فڕۆکەکان لە ١٢کیلۆمەتر زیاتر بەرزئەبنەوە ، هەروەها ئەم چینە دوو ڕووبار هەوای جووڵاوەی هەیە، کەبەدەوری زەویدا ئەڕۆن خێرایی ئەم دووبایە ئەگۆڕیٚ بەگوێرەی وەرزەکان.

**٣-چینی سیٚ هەم : ( الأوزون )**

ئەم چینە ئەکەوێتە سەرچینی دووهەم و هێمنەو جیاوازی لەنێوان پلەی گەرمای دا نی یە و گۆڕانکاری هەوایی تێدانی یە.

جۆرە گازێکی لەڕەگەزی ئۆکسجین تێدایە پێ ی دەوترێ (أوزون) ئەم چینە تیشکی سەرووی وەنەوشەیی هەڵئەمژێ کەزۆر زیانی هەیە ئەگەربگاتە سەرزەوی ، بەم جۆرە ژیان ئەپارێزێ لەسەر زەوی. بەهۆی هەڵمژینی ئەم تیشکەوە پلەی گەرمای ئەم چینە ۳۰س° سی پلەی سەدی لەژێر سفردایە.

**٤-چینی چوارەم: (الآیونو سفیر)**

لەدوای بەرزی ٥٠ پەنجا کیلۆمەترەوە دەست پێ ئەکات لێرەدا ماوەی گازەکان ئەگۆڕێ بۆ هێزی کارەبایی ساردو گەرم – ، + لەم چینەدا مەترسی تیشکی گەردوونی و تیشکی (سینی) (الأشعة الكونية والأشعة السينية) کوشندە (إکس) هەیە، هەروەها مەترسی ئەوپارچە ئەستێرانەی کەلەسەرەوە بەرەو زەوی دێن (النیازك) هەیە ئەمانە هەموو مەترسی یان بۆزەوی هەیەو بۆ ئادەمیزادیش و بۆ کەشتی‌یەئاسمانیەکانیش بەڵام ئەم چینە ئەومەترسی یە ناهێڵێ و کارەبایی یە، وەکوو ئاوێنە وایە ئەو شەپۆلە ڕادیۆیانەی لەئێستگەکانەوە بەرزئەبنەوە پێچەوانە ئەبنەوەو ئەگەڕێنەوە بۆزەوی. لەبەرزی ۸۰ هەشتا کیلۆمەتردا پلەی گەرما ئەگاتە ۹۰س° نەوەد پلەی سەدی ژێر سفر ، بەڵام لەم بەرزی یە بەولاوە پلەی گەرما بەرزئەبێتەوە لەچینەکانی سەرەوە تاکوو دەگاتە ٥٤٩س° پێنج سەدو چل و نۆ پلەی سەدی سەرەوەی سفر ، ئەمەش لەبەرزی ١٦٠ سەدوشەست کیلۆمەترەوە!!!.
ماشاءالله.

﴿ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ﴾ (القمر:٤٩)

واتە/ هەموو شتێکمان بەئەندازە دروست کرد!!!

لەسەرووی ئەم چوار چینەوە سێ چینی تری گازی هەیە، لەبەرزی ۳۲۰کیلۆمەترەوە دەست پێ ئەکەن تاکوو ۸۰۰هەشت سەد کیلۆمەتر، هێشتا زاناکان زانیاریان کەمە دەربارەی ئەم سێ چینە، کەوابوو ئەمە حەوت چینی گازی لەسەرووی زەوی یەوە واتە حەوت ئاسمانی گازی یەکە لەپێشەوە باسمان کرد.

هەروەها حەوت ئاسمانی ئەثیری هەن لەبەشەکانی تری ئەم کتێبەدا باسیان ئەکەین زۆر بەدرێژی بەتایبەتی لەبەشی ( رۆحی دا)

حەوت ئاسمانی مادی هەن ئەوانیش لەمەولا بەدرێژی باسیان ئەکەین. کەوابوو لەقورئانی پیرۆزدا پەروەردگار چەندجارێك فەرموویەتی ( سَبْعُ سَماواتِ ) راستی یەکە وێنەی نی یە و زانستی نویٚ سەلماندویەتی بەگازی حەوت ئاسمانن ( بەئەثیری) حەوت ئاسمانن بەمادی حەوت ئاسمانن.

﴿وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ إِنَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَفْعَلُونَ﴾ (النمل:٨٨)

﴿ ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعاً أَوْ كَرْهاً قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ﴾ (فصلت:١١)

لێرەدا: پەروەردگار فەرمانی داوە بەو دووکەڵەی کەلەزەوی بەرز بووەتەوەو لەحەوت گاز پێك هاتووە لەگەڵ زەوی هەردووکیان ئامادەبن هەردووکیان ئامادەبوون لەبەردەستی پەروەردگاردا پەروەردگاریش حەوت ئاسمانی گازی لەدووکەڵەکە دروست کردو هەرئاسمانێك کاری خۆی بۆدیاری کرد لەماوەی دووڕۆژدا.

هەر ڕۆژێك لەو کاتەدا ١٠٠٠هەزار ڕۆژی ئێستەی سەرزەوی بوو.

هەروەکو پەروەردگار لەقورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿ فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ وَأَوْحَى فِي كُلِّ سَمَاءٍ أَمْرَهَا وَزَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَحِفْظاً ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ﴾ (فصلت:١٢)

واتە/ لەماوەی دووڕۆژدا ئەوحەوت ئاسمانەی دروست کرد، دووهەزار ڕۆژی سەرزەوی ئێستا ئەکات بۆئەم ڕاستی یەش دیسانەوە پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿ هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعاً ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾ (البقرة:٢٩)

واتە: پەروەردگار هەموو شتێکی بۆ دروست کردن لەزەوی دا پاشان ئاسمانەکانی

دروست کردوحەوت ئاسمان بوون، هەرئەو بەهەموو شتێك ئەزانێ، لەو دووکەڵە لەزەوی بەرزبوویەوە حەوت ئاسمانی گازی دروست کرد...

پەروەردگار ئاسمانە ئەثیری یەکان لەقورئانی پیرۆزدا بەسێ جۆر باس ئەکات:

١-ئاسمانە ئەثیری یەکان لە قورئانی پیرۆزدا پەروەردگار باسیان ئەکات لەگەڵ زەوی بەمەرجێك لەنێوانیان دا حەرفی (عطف) (و) واو هەیە

﴿ تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالْأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَكِنْ لا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ إِنَّهُ كَانَ حَلِيماً غَفُوراً﴾ (الاسراء:٤٤)

لێرەدا پێش ناوی زەوی حەوت ئاسمانە ئەثیری یەکان ناویان هاتووە چونکە ئەو ئاسمانە ئەثیری‌یانە بەڕای هەندێ لە زانایان زۆر زۆر لەپێش دروست کردنی زەوی‌یەوە دروست کراون. هەروەها ئاوەدانن وەکوو زەوی چۆن ئاوەدانە.

٢-﴿ قُلْ مَنْ رَبُّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ ﴾ (المؤمنون:٨٦)

لێرەدا ((السّماوات)) ئاسمانەکان

بەو ئاسمانە ئەثیری یانە ئەڵێ پێش زەوی پەروەردگار دروستی کردوون چونکە ناوی زەوی نەهاتووە لەگەڵیان بەڵکو ناوی عەرش هاتووە وئەم ئاسمانە ئەثیری یانە عەرشیان لەسەرە.

٣-دیسانەوە پەروەردگار ئەفەرمێ:

﴿ وَكَمْ مِنْ مَلَكٍ فِي السَّمَاوَاتِ لا تُغْنِي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئاً إِلَّا مِنْ بَعْدِ أَنْ يَأْذَنَ اللَّهُ لِمَنْ يَشَاءُ وَيَرْضَى﴾ (لنجم:٢٦)

لێرەدا دیسانەوە (السّماوات)

مانای ئاسمانە ئەثیری یەکان ئەگرێتەوە ناوی زەوی لەگەڵیان نەهاتووە بەڵام ناوی مەلائکەیان لەگەڵ هاتووە.

لەبەشەکانی تری ئەم کتێبەدا بەدرێژی باسی ئەثیر و ئەوئاسمانە ئەثیری یانە ئەکەین.

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە

ئایا ئاسمانە گازییەکانی سەرووی زەوی کەسیٚ هەمیان گازی (ئۆزۆن)ە، ئینجا گازەکانی تریش هەریەکەیان چینێکی گازی دروست کردووە تاکوو بوون بەحەوت ئاسمانی گازی ، بۆچی گازەکانی سەرزەوی ئەوانیش هەریەکە بەجیا جیا ئاسمانێکی گازی لەسەرزەوی دروست ناکەن؟

وەلامی ئەم پرسیارە ئەوەیە: لەسەرزەوی تاکوو کۆتایی بەرگەبا ، هەوا هەیە ئەوگازانەی سەرزەوی ئەجووڵێنیٚ و ناوەستن تاکوو هەریەکەیان بەجیا ئاسمانێکی گازی دروست بکات.

بەلام دەرەوەی بەرگەبا هەوا نی یە لەبەرئەوە گازەکان هەریەکەیان بەجیا ماوە و چینێکی دروست کردووە هەروەکو گازی ئۆزۆن سیٚ یەم ئاسمانی گازی یە و زەوی ئەپاریٚزیٚ ئەم ئاسمانە گازی یە نەبووایە ژیان لەسەر زەوی نەئەما چونکە تیشکە ژەهراوی یەکان ئەیاندا لەزەوی و ژیانی تیٚدانەئەما!!!.

هەروەها پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنْفَعُ النَّاسَ وَمَا أَنْزَلَ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ مِنْ مَاءٍ فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِنْ كُلِّ دَابَّةٍ وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ وَالسَّحَابِ الْمُسَخَّرِ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ (البقرة:١٦٤)

لێرەدا پەروەردگار شوێنی هەوری دیاری کردووە لەنێوان ئاسمان و زەوی دا کە هەوا ئەیجووڵێنیٚ لەلایەکەوە ئەیبات بۆلایەکی تر.

واتە: ئاسمان لەسەرووی هەورەوەیەو هەوا لە خوارووی هەورەوە.... هەوا لەسەر زەوی یە نەوەکو لە ئاسمان

## ـ ئاسمانە ئەثیری یە کان ـ

## ئەثیر:

زانایانی ئەم سەردەمە  ئەم گازە نهێنی یەیان بۆ ئاشکرا بووە بەڵام لەبەرئەوەی زۆر زۆر ڕوون و بێ کێش و بێ وێنەیە نابینرێت و هەستی پیێ ناکرێت تەنها بەڵگەو نیشانە ئاشکرای ئەکەن.

ئەم گازە لە بۆشایی هەموو گەردوون دا هەیە. تەنە گەردوونی یەکانی هەڵگرتووەو ئەوتەنانە ئەسووڕێنەوە بەگشتی لەناو ئەثیردا مەلەئەکەن ئەگەر ئەثیر نەبێت تەنە گەردوونیەکان تەنها بەهێزی ڕاکێشان بەندنابن و تێك ئەچن. پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿ لا الشَّمْسُ يَنْبَغِي لَهَا أَنْ تُدْرِكَ الْقَمَرَ وَلا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾ (يّـس:٤٠)

واتە/ هەریەکێك لەمانگ و ئەستێرە و خۆرەکان لەمەداری خۆی دا مەلەئەکەن.... لێرەدا دیارە لەئەثیردا مەلەئەکەن.

ئەم گازە ئەوەندە ڕوون و سووکە  بوونەوەرە مادییەکان هەستی پیێ ناکەن و نای بینن بەڵام ڕۆحەکان و لەشە ئەثیری یەکان هەستی پیێ ئەکەن و ئەی بیینن.

هەندێ لەزانایان ئەڵێن: ئەم ئەثیرە: ئەچێتە ناو هەموو تەنە ماددیەکان و هەروەکو پەیکەری ئەوان پەیکەرێکی ئەثیری دروست ئەکات بەوێنەی خۆیان لەماوەی ٤٠چل ڕۆژدا ئەگەر پەیکەرە ماددیەکان بشکێن یان بمرن پەیکەرە ئەثیرییەکە ناشکێ و نامرێ و ناسووتێ و نافەوتێ هەرگیز و ئەمێنێتەوە.

هەروەکوو زانست ئەڵێ هیچ دەنگێك لەهەوادا نافەوتێ ئەمێنێتەوە تەنە ماددی یەکان بۆشایی زۆر ووردیان تێدایە ئەو گازە ئەثیری یە ئەچێتە ناویانەوە هەروەکوو خۆیان پەیکەری ئەثیری یان ئەمێنێ:

پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿ أُولَئِكَ لَهُمْ جَنَّاتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهِمُ الْأَنْهَارُ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِنْ ذَهَبٍ وَيَلْبَسُونَ ثِيَاباً خُضْراً مِنْ سُنْدُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُتَّكِئِينَ فِيهَا عَلَى الْأَرَائِكِ نِعْمَ الثَّوَابُ وَحَسُنَتْ مُرْتَفَقاً ﴾ (الكهف:٣١)

لەم ئایەتە پیرۆزەدا بۆمان دەرئەکەوێ ئەو ملوانکەو بازنگە زێڕینانە و ئەوجلە سەوزە ئاوریشمانە هەموویان پەیکەری ئەثیری ئەوشتە زێڕین و جوانانەی سەرزەوی یان سەر هەرجیهانێکی تربن کەژیانی ماددی تێدابێت. لێرەدا ئەگەر پەروەردگار مەبەستی لەبازنگی ئاڵتونی بوایە ئەیفەرموو:

﴿يُحَلَّوْنَ فِيهَا أَسَاوِرَ ذَهَبِيةً﴾

هەروەها کەفەرموویەتی:

﴿وَيَلْبَسُونَ ثِيَاباً خُضْراً مِنْ سُنْدُسٍ﴾ (الكهف:٣١)

واتە: جل وبەرگی ئەثیری یە کەوێنەو پەیکەری لەجل و بەرگی سەوزی سوندوسی وەرگرتووە.

هەروەها پەروەردگار لەسورتی الواقعە ئایەتی: ٥١،٥٢دا فەرموویەتی:

﴿ ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا الضَّالُّونَ الْمُكَذِّبُونَ لَآكِلُونَ مِنْ شَجَرٍ مِنْ زَقُّومٍ ﴾ (الواقعة: ٥٢، ٥١)

لێرەدا دیسانەوە دیارە مانای (زَقّوم) دارێکی ئەثیری یە کەوەکوو داری (زَقّوم) وایە لە جیهانی ماددی دا کەجۆرە دڕکێکی زۆرخراپە.

شێوە ئەثیری یەکەی دەرخواردی خراپەکاران ئەدرێت بەتایبەتی گومڕاکان و درۆزنەکان.

ئەم ئاسمانە ئەثیری یانە ژمارەیان حەوتن، هەروەکوو پەروەردگار فەرموویەتی لەسورەتی (الاسراء) ئایەتی ٤٤

﴿ تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالْأَرْضُ وَمَنْ فِيهِنَّ وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَكِنْ لا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ إِنَّهُ كَانَ حَلِيماً غَفُوراً﴾ (الاسراء:٤٤)

لێرەدا دیسانەوە پەروەردگار لەسورەتی المؤمنون( ئایەتی ) ٨٦ فەرموویەتی:

﴿قُلْ مَنْ رَبُّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ﴾ (المؤمنون:٨٦)

لەم ئایەتە پیرۆزەیش دا مەبەست لەحەوت ئاسمانە ئەثیری یەکانە و لەسەرەوویانەوە(عەرش)ی پەروەردگارە.

کەوابوو ئەم حەوت ئاسمانە ئەثیری یانە دوای عەرش دروست کراون لەلایەن پەروەردگارەوە چونکە (عەرش) وابەسەر ئەم ئاسمانە ئەثیری یانەوە ، پاشان زەوی دروست کردووەو لەسەرووی زەوی یەوە حەوت ئاسمانی گازی دروست کردووە.

ئەمە دووجۆرە لەئاسمانەکان کەپەروەردگار دروستی کردوون هەرجۆرێکیان حەوت ئاسمانن. جۆری سیّ یەمیش ئاسمانە ماددی یەکانن ئەوانیش حەوتن لە بەشەکانی تری ئەم کتێبەدا باسیان ئەکەین.

دیسانەوە پەروەردگار لە (الزبور المَزمور /٦٨) بۆ گەورەمان داوود (د. خ) ئەفەرمویّ:

﴿یَا مَمالِكَ الأرضِ غَنّوا رَنّموا لِلسیّد ، سلاه الراكِب عَلى سماءِ السَّماواتِ القَديمة﴾

لێرەدا: (السَّماوات القديمه) ئاسمانە ئەثیری یەکانن کەپێش زەوی و ئاسمانە گازی یەکان دروست کراون و (سماء السَّماوات القديمة) مانای (عرش) ئەگرێتەوە.

لەئینجیل ی مەتی دا ئیصحاحی پێنجەم دا هاتووە:

گەورەمان (عیسی) فەرموویەتی بەقوتابی‌یەکانی:

﴿فَأني أَقولُ لَكُمْ إنَّكُمْ إنْ لَمْ يَزِدّ برَّكُمْ عَلى الْكَتَبةِ وَالْفريسيّن لَن تَدخُلوا مَلكوت الْسَّمَاواتِ﴾ لەنوسخەی عەرەبی یەوە، وەرگیراوە

لێرەدا دیسانەوە (مَلَكوت السَّماوات)

مەبەستی ئاسمانە ئەثیری‌یەکانە

پەروەردگار لەقورئانی ثیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿يَتنَزَّلُ الأمرُ بَينَهُنَّ﴾....

**الأمر:** مانای بوونەوەرە رۆحانی یەکانە لەعربی دا پیّ ی دەوتریّ (كِناية) ئەو بوونەوەرە رۆحانی یانە خۆیان ئەثیرین لە: مەلائکەو رۆحی ئادەمیزادەکان و جنۆکەکان. کەوابوو ئاسمانە ئەثیری یەکان ئەو بەهەشتانەیە رۆحە پاکەکان جێنشینیانن تاکوو رۆژی هەستانەوەو لیّ پرسینەوە (يوم القيامة) نیشتەجیّ بوونی رۆحەکان لەجیهانە ئەثیری یەکان دا یان ئاسمانە ئەثیری یەکان دا لەئاینی ئیسلام دا بەجیهانی (بەرزەخ) ناوبراون واتە ئەوماوەیە ئەگرێتەوە لەنێوان قەبر تاکوو قیامەت.

ئەم جیهانە ئەثیری یانە تاکوو ئێستا نەزانراوە چەندیان رۆحی ئادەمیزادی تێدایەو چەندیان مەلائکەو چەندیان جنۆکەی تێدایە هەروەها جیهانی ئەثیری رۆحە خراپەکانیش هەیە. کەزۆر بەخراپی ماوەی قەبر تاکوو قیامەت ئەبەنە سەر.

(( عەرش ))

ئاسمانێكی ئەثیری گەورەیەو لەئاسمانە ئەثیری یەكانی تر گەورەترە حەوت ئاسمانە ئەثیری یەكان هەڵگری عەرشن.

پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا لەسورەتی: الحاقە دا فەرموویەتی:

﴿ وَالْمَلَكُ عَلَى أَرْجَائِهَا وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَانِيَةٌ ﴾ (الحاقە:١٧)

واتە: ڕۆژی حەشر عەرشی پەروەردگار هەشت ئاسمانی ئەثیری هەڵی ئەگرن چونكە بە لەناو چوونی زەوی ئاسمانی ئەثیری هەشتەم دروست ئەبێت بۆ رۆحەكان.

دیسانەوە پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿وَتَرَى الْمَلائِكَةَ حَافِّينَ مِنْ حَوْلِ الْعَرْشِ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَقُضِيَ بَيْنَهُمْ بِالْحَقِّ وَقِيلَ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾ (الزمر:٧٥)

واتە: مەلائیكەكان ئەبینی بەدەوری عەرش دا ئەڵقەیان داوەو سوپاسی پەروەردگاری خۆیان ئەكەن.

لێرەدا بۆمان دەرئەكەوێ هەڵگری عەرش حەوت ئاسمانی ئەثیری یە و بەكۆتایی بوونی تەمەنی زەوی ئەبن بەهەشت ئاسمانی ئەثیری عەرش لەسەریانە كەوابوو مەلائكە هەڵگری عەرش نین.

عەرشی یەكەم ئاسمانی ئەثیری بووە پێش ئەوەی ئاسمانەكانی ئەثیریو گازیو ماددی دروست بكرێن. ئەم ئاسمانە ئەثیری یە دێرینە كەعەرشی پەروەردگار بوو لەسەر هەڵمی ئاوبووە پاشان ئاسمانە ئەثیری یەكان راگیریان كردووە لەم ئایەتە پیرۆزەدا پەروەردگار نیشانەی كردووە:

﴿وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً وَلَئِنْ قُلْتَ إِنَّكُمْ مَبْعُوثُونَ مِنْ بَعْدِ الْمَوْتِ لَيَقُولَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ هَذَا إِلَّا سِحْرٌ مُبِينٌ﴾ (هود:٧)

واتە: پەروەردگار ئەو خوایەیە كە ئاسمانەكانو زەوی لەشەش ڕۆژدا خولقاندووەو ویستی خواش لەسەر ئەوەوەیە، ئەم بونەشی بۆ ئەوە خولقاندووە تا ئێوە تاقیبكاتەوە كامتان لەهەمووان كاری چاكە دەكەن، خۆ ئەگەر پێ یان بڵێ ی :

"ئاگاداربن" پاش مردن زیندوو دەکرێنەوە بەدڵنیاییەوە، بێباوەڕن دەڵێن: ئەمە سیحرو جادوویەکی ئاشکرایە.

کەوابوو پەروەردگار ئاسمانە ئەثیری یەکان و زەوی و ئاسمانە گازیەکانی لەماوەی شەش ڕۆژی گەردوونی دا دروست کردووە کە ئەکاتە ٦٠٠٠ شەش هەزارساڵی سەرزەوی وەکوو پێش تر باسمان کرد یەك ساڵی گەردوونی ١٠٠٠هەزار ساڵی سەرزەوی یە بەگوێرەی ئایەت.

کەوابوو: یەکەم کۆمەڵەی خۆر کە تەقیوەتەوە یەکەم ئاسمانی ئەثیری فراوان دروست بووەو بووە بەعەرشی پەروەردگار پاشان کۆمەڵەی خۆری دووەمی دروست کردوەو تەقیوەتەوە ئاسمانی ئەثیری دووەم تاکوو حەوت کۆمەڵەی خۆر دروست بوون و تەقیونەتەوە و لەناوچوون حەوت ئاسمانی ئەثیری دروست بوون ئینجا ئێستا کۆمەڵەی خۆری ئێمە ماوە کە تەقی یەوەو لەناوچوو ئاسمانی ئەثیری هەشتەم دروست ئەبێت و ڕۆژی حەشر ، عەرشی پەروەردگار لەسەر ئەم هەشت ئاسمانە ئەثیری یە یە.

هەروەکو باسمان کرد بەئایەتی (١٧) سورەتی الحاقە.

﴿وَالْمَلَكُ عَلَى أَرْجَائِهَا وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَانِيَةٌ﴾ (الحاقة:١٧)

لەڕۆژی قیامەتدا فریشتەکانی خوا لەقەراغی ئاسمانەکاندا دەبن و هەشت (فریشتە) یان هەشت خولقاوی خوا عەرشی خوا هەڵدەگرن[1] .

---

[1] زەمەخشەری موفەسیر دەڵێ: هەشت فریشتە یان هەشت ڕۆح یان هەشت خولقاوی گەورە عەرشی خوا هەڵدەگرن..

# ئاسمانە ماددی یەکان

تاکوو ئێستا زانست توانیویەتی حەوت ئاسمانی ماددی بدۆزێتەوە هەرچەندە زاناکان پێ یان ناڵێن ئاسمان بەڵکوو بەم جۆرە ناویان ئەبەن:

١)گەلە ئەستێرە (مجرە)

٢)کۆمەڵەی گەلە ئەستێرە(مجموعە مجرات)

٣)هێشووە ئەستێرەکان (عناقید النجوم)

٤)سەدیمەکان یان هەورەنەوەوی یەکان. (السُّدُم)

٥)کۆزاراکان

٦)ئەشکەوتە ڕەشەکان

٧)ئەشکەوتە سپی یەکان

ئەم حەوت ئاسمانە بەدرێژی باسیان ئەکەین لەبەشەکانی تری ئەم کتێبەدا:

ئەمانە هەموو ژمارەیەکی زۆر زۆرن لەئەستێرەو جیهانی ماددی لەسەرووی زەوی یەوەن هەرچی لەسەرووی زەوی یەوەبوو پێ ی ئەڵێن ئاسمان یان (السَّماءْ) راستی پەروەردگارو قورئان ڕوون و ئاشکرایە هەرچۆنێك بگەڕێین بۆ ئاسمانەکان حەوت ئاسمانن لەهەرسێ جۆرە ئاسمانەکان دا (گازی – ئەثیری – ماددی) هەروەکوو لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە (سَبْعُ سَماواتْ)

# زەوی و سوڕانەوەی زەوی

## چۆن زەوی دروست کرا؟

﴿قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانْظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ ثُمَّ اللَّهُ يُنْشِئُ النَّشْأَةَ الْآخِرَةَ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (العنكبوت:٢٠)

لەم ئایەتە پیرۆزەدا کە پەروەردگار فەرموویەتی : بەناو زەوی دا بڕۆن، تەماشابکەن (دروست بوون) چۆن دەستی پێکردو چۆن کۆتایشی پێ ئەهێنین !!!

**لابلاس:**

یەکێکە لە زانا هەرە بەناوبانگەکانی بیرکاری و گەردوون ئەڵێ:(یاسای جولآنەوەی ئەستێرەکانی کۆمەڵەی خۆر ، ئەوە ئەگەیەنێ کە ڕێکەوت بە هیچ جۆرێك نەبووە لەم دروست کردنەدا، پێویستە ناو نەبرێت. هەروەها ڕێکەوت لە زمانی زانست دا نیە ، ئەو هێزەی کۆمەڵەی خۆری بەم جۆرەی ئێستا دروست کرد، لە قەبارەو کێش و تەوژم وتیرەو خولگەو ماوەی سوڕانەوە یان بە دەوری خۆرداو بەدەوری خۆیاندا ، یاسایەکی بەردەوامی ڕێك و پێکە هەرگیز بە ڕێکەوت نابێت .

﴿وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ إِنَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَفْعَلُونَ﴾ (النمل:٨٨)

**زاناکانی ئەمڕۆ ئەڵێن :**

گەردوون: کاتی خۆی گازێك بووە لە بۆشایی دا و جولآوەتەوەو تەقیوەتەوە هەزاران گەلە ئەستێرە (مجرە)و کۆمەڵەی گەلە ئەستێرەو سەدیمەکان دروست بوون ، بێ گومان بە فەرمانی پەروەردگار .

یەکێك لەو سەدیمانە ، کۆمەڵەی خۆری ئێمە بووە کە خۆرێکی زۆر گەورە بووە تەقیوەتەوە ئەم مانگ و خۆرو ئەستێرە گەڕۆکانەی لێ دروست بووە بەم شێوە ڕێك و پێکەی ئێستا، زاناکان بۆیان دەرکەوتووە بە تەماشا کردن و شی کردنەوەی تیشکی خۆر ، ئەو ڕەگەزانەی لە خۆردا هەیە ، هەمان ڕەگەزن لە زەوی دا هەن.

ئێمەی موسڵمانیش ئەڵێین : پەروەردگارمان : پێش چوارده سەده لەمەو پێش لە قورئانی ثیرۆزدا بۆی باس کردووین ، واتە زۆر زۆر لە پێش ئێوەوە ئەی زانایانی سەدەی بیست و بیست و یەکەم .

﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقاً فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلا يُؤْمِنُونَ﴾ (الانبياء:٣٠)

لەم دوایی یەدا زانای بەناوبانگ (لابلاس) راستی ئەم ئایەتە پیرۆزەی سەلماند، دانی نا بەم ڕاستیەداو زۆر پەسەند بوو بە لایەوە، دەقی ئەم ئایەتەی بە زمانی ئینگلیزی نووسی یەوە، هەروەکو لە لاپەڕەی / ٣٩ /ی ئەم کتێبەدا نووسیومانەتەوە

**زانایانی شارەزای چینەکانی زەوی ئەڵێن :**

تویێکڵی زەوی لە دوو جۆرە بەرد دروست بووە ، جۆری یەکەمیان بە ساردبوونەوەی مادە تواوەکان دروست بووە .

جۆری دووەمیان: بە نیشتن دروست بووە ، واتە بە توانەوەی ماددەکان لە ئاوەکان داو نیشتنی ئەم مادانەو ڕەق بوونیان لە بەردی شاخەکاندا.

دوای جیابوونەوەی زەوی لە خۆر ، زەوی ساردبووەتەوە ، ئەو هەڵمی ئاوەی لەسەری بووە ، بووە بە هەورو دوایی بووە بە باران ، ئەم بارانە مێرگەکانی دروست کردووەو بەردی شاخەکانی توانەوەو گردەکان دروست بوون ، بەلاَم هۆی باران بارین لەسەر زەوی ئەگەڕێتەوە بۆ هێزی ڕاکێشان ی زەوی ، چوونکە بەهێزترە لە هێزی بەرزبوونەوەی هەڵمی ئاوەکان ، بەم جۆرە ئاوی زەوی لە هێزی ڕاکێشان (الجاذبية) ، ناتوانێ ڕزگاری بێت و بەرز ئەبێتەوەو نەگەڕێتەوە بۆ سەر زەوی .

ئەگەر هێزی ڕاکێشانی زەوی کەمتر بوایە ، ئەم هەڵمی ئاوە بەرز ئەبوویەوە بۆ سەرەوەو نەئەگەڕایەوە بۆ سەر زەویو ئاو نەئەماو ژیان نەئەما !!! پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿وَأَنْزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً بِقَدَرٍ فَأَسْكَنَّاهُ فِي الْأَرْضِ وَإِنَّا عَلَى ذَهَابٍ بِهِ لَقَادِرُونَ﴾ (المؤمنون:١٨)

واته:لە ئاسمانەوە بە ئەندازەیەك ئاومان هێنایە خوارەوە، زەویمان پێ ئاوەدان کردەوە، ئەو ئاوەمان نیشتەجێی زەوی کرد ، هەروەها ئەتوانین ئەو ئاوە بەرینەوە بۆ سەرەوە !!!

بێ گومان ئەگەر پەروەردگار هێزی ڕاکێشان (قوة الجاذبیة) کەم بکاتەوە ئاوەکە لەو هێزە ڕزگاری ئەبێت و بەرز ئەبێتەوەو ناگەڕێتەوە بۆ سەر زەوی .

**دیسانەوە زاناکان ، تاقی کردنەوەی زۆریان کردووە و ئەڵێن :**

ئاو توانای هەیە لە زەوی یەوە بڕوات و نەگەڕێتەوە ئەگەر هێزی ڕاکێشان نەبێت بەلاّم تەماشای ئەم تەرازووە ڕێك و پێکە بکەین کە زاناکان ئەڵێن : هەموو شتێك ئاوی تێدایە لە شێوەی شێ دا (الرطوبة) هەتاکو بەردیش بەقەدەری پێویستی خۆی ئاوی تێدایە .

ئاوی دەریاو ئۆقیانوسەکان سوێرە بۆ خواردنەوە دەست نادات چوونکە خوێی تێدایە پەروەردگار لەبەر ئەوە بە سوێری دروستی کردووە بۆگەن نەکات و خراپ نەبێت بەلاّم بە تیشکی خۆر ئەیکات بە هەڵم، پاشان هەورو باران، کانی و جۆگەو ڕووبارەکان دروست ئەبن ئەم ئاوە پاك ئەبێتەوە لە خوێ، بۆ خواردنەوە دەست ئەدات و زیندەوەر هەمووی سوودی لێ وەرئەگرێ بۆ ژیان .

**زانای جوگرافیا : ( مستر ج - س بیکوك ) لە کتێبەکەیدا :**

**( جوگرافیای گشتی ) ئەڵێ :**

ئەگەر گردەکانی جیهان هەموویان لە تەنیشت ئۆقیانووسی سەروو، و دەورو بەری بوونایە ، لووتکەکانیان خوار ئەبوونەوە بەرەبەرە، بەرەو ئۆقیانووسی هندی و هادی، بەم جۆرە ژیان نەئەما !!!

لەبەر سەرما لە ناوچەی بەستەڵەکی سەروو ، لەبەر زۆربوونی بەرزایی لە لایەکەوە، لەبەر دووری هێڵی کەمەرەی زەوی (خط الاستواء) لە لایەکی ترەوە . هەروەها لەبەر هەڵکردنی ڕەشەبای بەهێزو سارد لەسەر ئەم گردانەوە بارودۆخی زەوی یەکانی ناوەندی سەروو تێك ئەچوو ژیانی تێدا نەئەما چوونکە هەمووی ئەبوو بەبەفر . ئەم زانایە دیسانەوە ئەڵێ :

زۆربوونی بەرزایی وگردوو شاخەكان لە شوێنە ئیستیوایەكانەوە ئەبوو بەهۆی گۆڕینی ئاوهەوای هەرێمەكانی ناوەڕاست ، ئەمەش لە كارە گرنگەكانی پەروەردگارە!!

﴿وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِلْمُوقِنِينَ﴾ (الذاريات:٢٠) .

واتە: لە دروست بوونی زەوی دا نیشانە هەیە بۆ بیر تیژان و بیرپاكان .

## (دابەش بوونی ئاوو - ووشكانی لەسەر زەوی)

بەیاسایەكی سەرسوڕهێنەر ، ووردەكاریەكی ڕێك وپێك ، نەخشەیەكی بێ هاوتا (پەروەردگار) ئاو و ووشكانی دروست كردووە :

٧٢٪ ی ڕووی زەوی بە ئاوی ڕووبارو دەریاو ئۆقیانووسەكان داپۆشراوە.

٢٨٪ ی ڕووی زەوی ووشكانی یە و كەرتەكانی جیهانی لێ دروست كراوە .

كەوابوو نزیكەی سێ بەشی زەوی ئاوەو بەشێكی ووشكانی یە تەنها ئۆقیانووسی هادی (هێمن) لەهەموو ووشكانی زەوی فراوانترە !!!

لێرەدا بۆمان دەرئەكەوێ ئەگەر ووشكانی زەوی زۆرتر بوایە لە ئاو زۆربەی زەوی ئەبوو بە بیابانێكی ووشك و چۆڵ و بێ ڕووەك ، نەمیوە و نەخۆراك و نە لەوەڕگا و نە دارو درەخت نە ڕووبارو ئاوی پاك بەم جۆرەی ئێستا نەئەبوون ، ژیان زۆر سەخت ئەبوو .

ئاوو ووشكانی زەوی بەم جۆرەیە:

١- زۆربەی ووشكانی ئەكەوێتە نیوەی سەرووی گۆی زەوی و زۆربەی ئاو لە نیوەی خواروی گۆی زەوی یەوەیە.

٢- كەرتەكانی جیهان ئەكەونە سەرووی گۆی زەوی و شۆڕ ئەبنەوە بەرەو نیوەی خوارو ، سەرەكانیان وەكو سێ گۆشەیەك بنكەكانیان نزیك ئەبنەوە لە یەك ، خەریكە لەگەڵ یەك بەیەكەوە ببەسترێنەوە !!!

٣- سەرەكانی خوارویان لەیەكتر دوورئەكەونەوە بەهۆی ئۆقیانووسە فراوانەكانەوە

هەروەها هەریەکە لە کەرتەکان بەرامبەریان دەریاو ئۆقیانووس هەیە ، ئەمەیە ئەندازەی ئەو ئەندازیارەی بەم شێوە ڕێك و پێکە زەوی دروست کرد تاکو لەبار بێت بۆ ژیان .

دکتۆر تۆماس دافید بارکس زانای کیمیا ( بڕوانامەی دکتۆرای هەیە لەبەشی کیمیا ) لە کتێبی (الله یتجلی فی عصر العلم) دا ئەڵێ:

ئاو : بێجگە لەم تایبەتی یە ، هەندێ تایبەتکاری تری تێدایە زۆر گرنگن ئەگەر ئادەمیزاد تەماشا بکات زۆر بە ڕێك و پێکی نیشانەی ڕێکخستنی سەرسوڕهێنەرن .

وەکوو: داپۆشینی سێ بەشی زەوی بە ئاو بوەتە هۆی هەوای لەبارو گەرمای لەبار بۆ ژیان لەسەر زەوی ، ئەگەر هەندێ خاسیەتی ئاو کەم بکات گۆڕانکاریەك ئەبێت لە پلەی گەرمادا کە ئەبێتە ڕوودانی کارەساتی ناهەموار و مەترسی ئەخاتە سەر ژیان .

هەروەها ئاو بە شلی ئەمێنێتەوە ماوەیەکی زۆرو ئەبێتە هۆی مانەوەی گەرما لە ڕادەی پلەیەکی گەرمی نەگۆڕو زەوی ئەپارێزێ لە هەڵگەڕانەوەی زۆر بەهێز .

ئەگەر وانەبوایە زەوی لەبار نەئەبوو بۆ ژیان

**دیسانەوە زانای ناوبراو ئەڵێ:**

من بەش بە حاڵی خۆم ئەڵێم ئەم یاسا ڕێك و پێکەو ئەم ئەندازە سەرسوڕهێنەرە دروست کراوی دەستی پەروەردگاری سەرەوەیە ، هەروەها ئەڵێ من پەروەردگارم زۆر خۆش ئەوێ چونکە زۆر بایەخی داوە بەسازدانی هەل ومەرجێکی لەبار لەسەر زەوی بۆ ژیانی ئادەمیزاد .

**منیش ئەڵێم :**

گەردوون هەمووی نەوەك تەنها زەوی ڕێكخراوەو بەیاسیەكی ڕێك وپێك بەڕێوە ئەچێت ، ڕێكخراویش ڕێكخەری هەیە، بەڕێوەچوونیش بەڕێوەبەری هەیە !!!

( **نووسەر** )

## (**شێوەی زەوی**)

زەوی شێوەی وەكو هێلكەیە و لە بۆشایدا ئەسوڕێتەوە لە هەندێ وولاتی عەرەب دا بە هێلكە ئەڵێن (**الدحیة**) پەروەردگار

لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی :

﴿**وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَلِكَ دَحَاهَا ، أَخْرَجَ مِنْهَا مَاءَهَا وَمَرْعَاهَا**﴾(**النازعات:٣١،٣٠**)

واتە :زەوی دوای دروست كردنی شێوەی هێلكەی وەرگرت پاشان ئاوو لەوەڕگاكانی لێ هاتە دەرو شاخەكان ڕاوەستان لە سەری .

**زانایانو زانستی نوێ دەڵێن :**

تیرەی زەوی لە نێوان هەردوو بەستەڵەكدا ،واتە لە نێوان بەستەڵەكی باكورو بەستەڵەكی باشوردا /٧٩٠٠/حەوت هەزارو نۆ سەد میلە بەلاَم درێژی هێڵی كەمەرەی زەوی (**خط الاستواء** ) ٧٩٢٦ میل حەوت هەزارو نۆ سەدو بیست وشەش میل ئەبێت، واتە ٢٦ بیست وشەش میل درێژترە لە هێڵی نێوان هەردوو بەستەڵەكەكان هەروەها گۆی زەوی خوارە بە گۆشەیەكی ٢٣/٥ پلە ئەم خوارییە زۆر گرنگە ، چوونكە ئەگەر ئەم خواری یە نەبووایە بەستەڵەكەكان (قوطبە كان ) هەمیشە تاریك ئەبوون . كەوابوو پەروەردگار زۆر بە ووردی هەموو دروست كراوەكانی دروست كردووە !!

**<u>شوێنی زەوی</u>**

ئەگەر لە سەر مانگەوە تەماشای زەوی بكەین ، ئەبینین زەوی وەكوو مانگ لە ناوەڕاستی ئاسمان دا دیارە ، هەروەها ڕووەكانی هەروەكوو رووەكانی مانگ دەرئەكەوێ لە كاتی سووڕانەوەدا بەلاَم بەشێوەیەكی گەورەتر ، ئەگەر لە شێوەی مانگی چواردە شەوە زەوی دەرەكەوێ ، لە سەر ڕووی مانگەوە تەماشای بكەین ئەبینین زەوی چوار ئەوەندەی مانگی چواردە شەوە گەورەیەو دیارە ،

هـەروەها تیـشكی ڕووناكی زەوی (٦٠)شەست جـار لـە تیـشكی ڕووناكی مـانگ زیاترە .

واتـە زەوی وەكـوو ئاوێنەیـەكی تیـشك دەرەوەی پێـچەوانەی گەورەیـە كـەوابوو پێویستە :

لێرەدا خوانەناسان بیرێك بكەنەوەو تێ بگەن ئەمانە لـە خۆیانـەوە دروست نـەبوون و دروست كراوی پەروەردگارن نەك ڕێكەوتی كوێرانە .

**قەبارەی گۆی زەوی**

قەبارەی زەوی ١/١ ملیۆن كیلۆ مەتر سێ جایە بەڵام قەبارەی هەموو ئاوەكانی سـەر زەوی یەك هەزار كیلۆ مەتر سێ جایە !!!

**كێشی زەوی**

زەوی شـەش هـەزار بلیـۆن بلیـۆن كیلۆیـە ٦٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠ ئەمـە ڕای زاناكانە، بە زانستی نوێ بۆیان دەركەوتووە.

**چڕی زەوی (الكثافة)**: ٥/٥ غم بۆ ١سم$^{3}$ ئەم چڕی یە لەچڕی ئەستێرە گەڕۆكـەكانیتر زیاترە .

ڕووبەری زەوی لە ٥٠٠ پێنج سەد ملیۆن كیلۆ مەتر زیاترە.

**چێوەی زەوی (محیط)**: ٤٠٠٠٠ چل هەزار كیلۆ مەترە .

هەروەها تەمەنی زەوی بە گوێرەی ڕای زاناكان و زانستی نـوێ پێـنج بلیـۆن سـاڵە ، واتـە پێـنج هـەزار ملیـۆن سـاڵە ٥٠٠٠٠٠٠٠٠٠ خـۆر یـەك ملیـۆن و دوو سـەد وپـەنجا هـەزار جـار ١٢٥٠٠٠٠ لـە زەوی گـەورەترە . لـە بەرئـەوە بەشـێكی زۆر كـەم لـە تیـشكی خۆر بەر زەوی ئەكەوێ چوونكە زەوی لە چاو خۆردا تەنێكی زۆر بچوكە.

ئەگـەر تیشكی خـۆر دوو هـەزار ملیـۆن ٢٠٠٠٠٠٠٠٠٠ بـەش بێـت تـەنها بەشـێكی ئەكەوێتە سەر زەوی !!!

## خێرایی زەوی

زەوی بە دەوری خۆی دا ئەسورێتەوە بە خێرایی ۱۰۰۰ هەزار میل لە یەك كات ژمێردا لە هێڵی كەمەرەی زەویدا واتە (خط الاستواء) بەلاّم ئەم خێرایییە كەم ئەكات تاكوو بەرەو بەستەڵەكەكانی باكورو باشور بڕۆین تا دەگاتە سفر ئەمە بۆ پێك هاتنی شەو وڕۆژە .

بەلاّم خێرایی سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆردا ٦۰۰۰۰ شەست هەزار میلە لە یەك كات ژمێردا ئەمەش بۆ پێك هاتنی چوار وەرزەكەیە ئەم سوڕانەوەیە پێچەوانەیە لەڕۆژئاواوە بۆ ڕۆژهەلاّتە .

یەك جار سوڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆردا چوار وەرزێك ئەهێنێ لەیەك ساڵ دا ۵۸۰ پێنج سەدو هەشتا ملیۆن میل ئەبڕێ

بەلاّم دووری زەوی لە خۆرەوە ۱۵۰ سەدو پەنجا ملیۆن كیلۆ مەترە ئەم ماوەیە زاناكان پێی ئەڵێن یەكەی گەردوونی (الوحدة الكونية )یان (الوحدة الفلكية)

## تویکڵی زەوی

تویکڵی زەوی ڕەقەو ساردە ئەستوورایی ٥٠ پەنجا کیلۆ مەترە بە دەوری ناوکی زەویدایە ناوکی زەوی ئاگرێکە لە تواوەی بەردو ئاسن و کانزاکانی تر پێك هاتووە ، پلەی گەرمایی یەکەی ١٢٠٠ هەزارو دووسەد پلەی سەدی تاکوو ١٨٠٠ هەزارو هەشت سەد پلەی سەدیی ە .

زاناکان پلەی ئەم گەرمیەی ناوکی زەوی یان پێوانە کردووە بە هۆی ئەو تواوەیەی کەلە بورکانەکانەوە دێتە دەرەوە .

## هەوای زەوی

زاناکان ئەڵێن : هەوای زەوی لە ڕەگەزی زۆر پێك هاتووە گرنگەکانیان چوار گازی سەرەکین(نیترۆجین، ئۆکسجین، ئەرگۆن، دووەم ئۆکسیدی کاربۆن) ئەم گازانە هەموویان تێکەڵن لە هەوادا .

بەڵام گیراوە نین ، واتە لەگەڵ یەکتر یەك ناگرن بێجگە لەوەی لەگەڵ هەندێ مادەی تر لە تویکڵی زەوی و لە هەندێ زیندەوەردا یەکیان گرتووە . تەماشای گەورەیی پەروەردگار بکە بزانە ئەم گازانە بە تێکەڵیێ لە هەوادان بەڵام وا تێکەڵ نەبوون وەکوو گیراوەیان لێ بێت .

ئەگەر بەم شێوەیە نەبووایە ئەم گازانە یەکیان بگرتایە ژیان نەئەما لە سەر زەوی .

**بۆ نموونە :**

گازی نیترۆجین بە ئاسانی یەك ناگرێ لەگەڵ گازێکی تردا ، ئەگەر یەکی گرت لە هەل ومەرجێکی تایبەت دا کە بۆی بڕەخسێنین وەکوو لەگەڵ ئۆکسجین دا: ترشەڵۆکی نەتریك (حامض النتريك) یان ئازۆتیك دروست دەکەن ، ئەمەش پیێی ئەووترێ ئاوی زیو ، بەهێز ترین ترشەڵۆکەو مەترسی لە هەموو ترشەڵۆکەکان زیاترە ، ئەگەر نیترۆجین و ئۆکسجین لە هەوادا تێکەڵ ببونایە بارانێکی ترشەڵۆکی کوشندە کە لە ئاگر پێك هاتووە ئەباری ، زیندەوەرو ئاژەڵ و ڕووەك و خاك و بەردو هەموو شتێکی لە سەر زەوی ئەسووتاند .

بێجگە لەمە، نایترۆجین کاریگەری یەکی زۆری هەیە لە سروشتی هەوای زەوی و پاڵە پەستۆو تەوژمی هەوایی و خواربوونەوەی تیشکی خۆر لە کاتی هاتنیدا بەناو بەرگەبادا ، بێجگە لەمانە گرنگترین کارو سوودی نایترۆجین پارێزگاری زەوی ئەکات بەگشتی ، ئەو پارچە ئاگرانەی لە بۆشایی ئاسمانەوە بەرەو زەوی دێن نیترۆجین پارچە پارچەیان ئەکات پێش ئەوەی بکەونە سەر زەوی ، ئەوەندە وردیان ئەکات وەکوو خۆڵ لە هەوادا ئەمێنێتەوە ، پارچە ئاگرە بچووکەکان ئۆکسجین ئەیان سووتێنێ‌و گەورەکان نیترۆجین وردیان ئەکات .

ئەگەر وانەبووایە ژیان لەسەر زەوی نەئەبوو ، هەروەکوو لە سەر مانگ ژیان نیە چوونکە هەوا نیە .

**ئایا کێ ئەم دەستوورو یاسا رێك و پێکەی دروست کرد ؟**

بێ گومان پەروەردگارە . لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

**﴿الذی خَلَقَ فَسَوَّی، والذی قدر فهدی﴾(الاعلی ٢،٣)**

ئەوەی کە دروستی کردو ڕێك و پێکی کرد، ئەوەی ئەندازەی گرت و ڕانومایی کرد ئەم گەردوونە بێ پایانە ئەوە پەروەردگارە دروست کەرو بەڕێوەبەری گەردوون و بوونەوەرە !!!

زانای ئەمریکایی (کریسن موریسون) سەرۆکی ئەکادیمی زانستی لە نیویورك ئەڵێ:

هەرچەندە ئەو گازانەی لە زەوی بەرز ئەبنەوە بە درێژایی زەمان زۆربەیان ژەهراوین لەگەڵ ئەوەشا هەوا بە پاکی ئەمێنێتەوەو پیس نابێت و هیچ پێویستیەکی ژیانی ئادەمیزاد تێك نادات.

لێرەدا پرسیار ئەکەین : کێ ئەم تەرازووەی ڕاگرتووە ؟

کێ ئەم گازانەی کردووە بەبەرگە با بەدەوری زەوی دا بەیەکەوە بێ ئەوەی تێکەڵ بن و هەریەکەیان ئەرکی خۆی بەجێ ئەهێنێ بۆ پارێزگاری ژیان و زەوی ... ئەوە پەروەردگارە پەروەردگار !!!

﴿الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَداً وَلَمْ يَكُنْ لَهُ شَرِيكٌ فِي الْمُلْكِ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيراً﴾ (الفرقان:٢)

هەروەها فەرموویەتی :

﴿وَالْأَرْضَ مَدَدْنَاهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْبَتْنَا فِيهَا مِنْ كُلِّ شَيْءٍ مَوْزُونٍ﴾ (الحجر:١٩)

ئەگەر تەماشای $CO_2$ دووەم ئۆکسیدی کاربۆن بکەین ئەبینین تیشکی خۆر ئەدات لە ڕووەکەکان و ئەم گازە هەڵئەمژن و ئەیکەن بە دوو ڕەگەزی سەرەکی :

١–کاربۆن بۆ خۆراکی خۆیان

٢–ئۆکسجین : ئەیدەنەوە بە هەوا ئەگەر ڕەگەزی کاربۆن زۆر بوو لە هەوادا لەم ڕێژەیەی ئێستا زیاتر، ئەوە گەرما زۆر بەرز ئەبێتەوە بەفری بەستەڵەکەکان هەمووی ئەتوێتەوەو ئەبێ بە هۆی خنکاندنی زیندەوەرەکان !!!. ئەگەر کاربۆن لەم ڕێژەیەی ئێستای کەم بوویەوە : ئەوسا تیشك دارە زیان بەخشەکان زیانێکی زۆر لە زیندەوەر و ئادەمیزاد و ئاژەڵ و ڕووەك ئەدەن .

**سووڕانەوەی زەوی**

ئەم زەوی یەی ئەمڕۆ لەسەری ئەژین وەکو ووشکانی یەکی وەستاو ئەیبینین هەزاران ملیۆن ساڵ لەمەو پێش شل بووە هەروەکو هەویر ، لە خۆر جیابۆتەوە و ئەسوڕێتەوە ، ئەم زەوی یە ئێستا هەروەك کەشتی یەکی گەورە وایە، بەناو بۆشایی ئاسماندا ئەمانبات و ئەمانخولێنێتەوە بەبێ ئەوەی هەست بکەین نە بە سوڕانەوەی نەبەڕۆیشتنی .

زەوی زیاتر لە (دە) سوڕانەوەی هەیە : بەڵام دوو سوڕانەوەی سەرەکی هەیە :

١) سوڕانەوە بەدەوری خۆیدا لە ماوەی ٢٤ کات ژمێردا شەوو ڕۆژ پێك دەهێنێ .

سوڕانەوەی دووەمی بەدەوری خۆردایە کە چوار وەرز پێك ئەهێنێ لە ماوەی یەك ساڵدا .

کاتێ زەوی بەدەوری خۆیدا ئەسوڕێتەوە هەموو بەشەکانی ئەسوڕێتەوە ئیتر بەشەکانی ناوەوە بێت یان دەرەوە ووشکانی بێت یان ئاوی بێت ، بەڵام خێرایی هەر بەشێك لەگەڵ بەشێکی تر جیاوازە بەگوێرەی شوێنی لە میحوەری زەوی یەوە

لە ناوچەی هێڵی کەمەرەی زەوی یەوە (خط الاستواء) خێرایی سوڕانەوە ١٦٧٠ کیلۆمەترە لە کاتژمێرێکدا ، ئەم خێرایی یە کەم ئەبێتەوە هەتاکو بەرەو قوطبەکان بڕۆین تا دەگاتە سفر .

ئەگەر هێزی ڕاکێشانی زەوی خۆی نەبوایە ، هەرچی لەسەر زەوی دایە لە هەواو لە ووشکانی و لە ئاوو هەموو بوونەوەرێك پارچە پارچە ئەبوو بڵاو ئەبوویەوە لە بۆشایی ئاسماندا !!!

کەوابوو هێزی ڕاکێشان لە هەردوو جەمسەری زەوی دا ، زۆرترە لە هێڵی کەمەرەی زەوی ، بەڵام هێزی پاڵپێوەنان لە هێڵی ئیستیوادا زیاترە لە جەمسەرەکان (قطبەکان) بەم جۆرە هێزی پاڵ پێوەنان و هێزی ڕاکێشان یەکسان ئەبن ئەگەر بەم جۆرە نەبێت ئاوی دەریاو ئۆقیانووسەکان لە جەمسەرەکانەوە بەرەو هێڵی کەمەرەی زەوی ئەڕۆن هەروەها بە پێچەوانەوە.

بەڵام دابەش کردنی ئاو ووشکانی لەسەر زەوی بەجۆرێك دروست کراوە کە هیچ کامیان دەست درێژی ناکەنە سەر هیچ کامیان !!!

ئەگەر سووڕانەوەی زەوی خێرایی کەمتر بوایە ، درێژی شەوو ڕۆژ زیاتر ئەبوو بە ١٢٠ کات ژمێر شەو و ١٢٠ کات ژمێر ڕۆژ .

بەم جۆرە گەرمای ڕۆژ ڕوەکی ئەسوتاند بەڕۆژدا و هەرچیەکیش بمایە شەو ئەیبەست !!

پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی :

﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ جَعَلَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ اللَّيْلَ سَرْمَداً إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَنْ إِلَهٌ غَيْرُ اللَّهِ يَأْتِيكُمْ بِضِيَاءٍ أَفَلا تَسْمَعُونَ ، قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ جَعَلَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ النَّهَارَ سَرْمَداً إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَنْ إِلَهٌ غَيْرُ اللَّهِ يَأْتِيكُمْ بِلَيْلٍ تَسْكُنُونَ فِيهِ أَفَلا تُبْصِرُونَ﴾ (القصص:٧٢،٧١)

کەوابوو پەروەردگار پێش ١٤٢٥هەزارو چوارسەدو بیست وپێنج ساڵ ئەم فەرموودەیەی ناردووە بۆ پێغەمبەرمان محمد (د.خ) کە ئێستا زانست باسی ئەکات هەروەها بەپێچەوانەوە ئەگەر خێرایی سوڕانەوەی زەوی لە ئێستا خێراتر بوایە هەرچی شارو دێهات و شاخ و دارستان و ئاو هەبوو لەسەر زەوی هەمووی ئەڕووخاو پارچە پارچە ئەبوو لە بۆشایی ئاسماندا بڵاو ئەبوویەوە بەڵام ئەو خێرایی یەی پەروەردگار بۆی دیاری کردووە زۆر لەبارە بۆ ژیانی ئادەمیزاد بە ئاسودەیی .

٢-سوڕانەوەی دووەمی زەوی بەدەوری خۆردا لە ماوەی یەك ساڵدا بە خێرایی ٣٠ سی کیلۆمەتر لە یەك چرکەدا چوار وەرز پێك ئەهێنێ .

٣-سووڕانەوەی گەردوونی کۆمەڵەی خۆر واتە: زەوی ومانگ و خۆرو هەموو ئەستێرە گەڕۆکەکانی هاوڕێ یان بەدەوری چەقی مەجەرەکەمان (ڕێگای کاکێشان) ئەسوڕێنەوە تەنها یەك خولی ئەم سووڕانەوەیە (٢٢٥) دووسەدو بیست وپێنج ملێون ساڵ ئەخایەنێ ، بە خێرایی ٢٥٠ دووسەدو پەنجا کیلۆمەتر لەیەك چرکەدا.

٤-سووڕانەوەی گەردوونی هەموو مەجەرەکەمان بە کۆمەڵەی خۆریشەوە واتە ڕێگای کاکێشان کە ١٥٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠ سەدو پەنجا هەزار ملیۆن ئەستێرەیە بەدەوری چەقی کۆمەڵەی مەجەرە خۆجێ یەکان دا کە ژمارەیان ٣٠ مەجەرەیە بە خێرایی ٣٣٠ سێ سەدو سی کیلۆمەتر لەیەك چرکەدا .

٥-سووڕانەوەی گەردوونی گەورە ئەم ٣٠ مەجەرەیەو مەجەرەی کاکێشان ئەسوڕێنەوە بەدەوری چەقی گەردووندا – تاکو ئێستا خێرایی ئەم سوڕانەوەیە نەدۆزراوەتەوە .زاناکان هیچی لێ نازانن !!!

کەوابوو! ئەی خوانەناسان ئەمە هاوارێکە بۆ ئێوە ، کە ووریا ببنەوە ، بێنەوە هۆشی خۆتان، تەنها سەیارەیەك ئەتوانن دەستی بەسەرا بگرن و نەهێڵن لە ڕۆیشتن وکارکردن دا هیچ هەڵەیەك بکات ؟ بێ گومان نەخێر .

تەماشای کاری پەروەردگار بکەن هەزاران هەزار گەلە ئەستێرە و ملیۆن ملیۆن کۆمەڵەی گەلە ئەستێرە کە هەریەکەیان لە ملیار ملیار ئەستێرە لە زەوی گەورەتر پێك هاتوون بەردەوام بەدەوری یەکتردا ئەسوڕێنەوە زۆر بە خێرایی بەبێ ئەوەی بچووکترین هەڵە ڕووبدات !!!

چونکە ئەگەر هەر هەڵەیەك ڕووبدات هەرچەندە کەمیش بێت هەموو گەردوون کاول ئەبێت و تێك ئەچێت و نامێنێ .

ئایا ئەمەش کاری ڕێکەوت و دروست بوونی کوێرانەیە ؟؟

ئێمە هەتاکو بیربکەینەوە لە دروست بوونی گەردوون ئەبینین هەست بە لاوازی ئەکەین سەبارەت بەم دروست بوونە و بەڕێوەبردنی، هەتاکو بیربکەینەوە هەست بەکەمی ئەقڵمان و زانستمان ئەکەین و هەست بە گەورەیی دەسەڵاتی پەروەردگار ئەکەین ، لەگەڵ ئەوەشدا ئادەمیزاد پلەوپایەیەکی گەورەی پێ دراوە لەلایەن پەروەردگارەوە ..ئادەمیزاد بەرهەمی ئەم گەردوونەیە .. ئەم گەردوونە دیاری پەروەردگارە بۆ ئادەمیزاد، ئادەمیزاد نەبوایە پەروەردگار ئەم گەردوونەی دروست نەئەکرد چونکە ئادەمیزاد خەلیفەی پەروەردگارە لەسەر زەوی ..

هەندێ کەس ئەم ڕاستی یە بە تەسلیم بوون ئەزانن بەلاّم تەسلیم بوون بە پەروەردگار دڵنیایی و خۆشی و شادی یە بۆ ئادەمیزاد و خۆی بە میوانی پەروەردگار ئەزانێ لەسەر ئەم زەوی یە، دڵنیایە کە بوکەشووشەیەك نیە بەدەست ڕێکەوتی کوێرانەوە ،ئەگەر ئەم نیشانانەش نەبوایە ئەبوایە ئادەمیزاد خۆی پەروەردگار بدۆزێتەوە بە ئەقڵ ،چونکە بینینی پەروەردگار مایەی دڵنیایی یە بۆ ئادەمیزادی چاك و پاك .

## ئەو زیندەوەرانەی لەسەر زەوی ئەژین

زەوی وەكو مێروولەیەكە لە دارستانەكانی جیهاندا لەچاو تەنها گەلە ئەستێرەی (كاكێشان) دا كە ١٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠سەد هەزار ملیۆن ئەستێرەیە و زۆربەی زۆریان بە ملیۆنەها جار لە زەوی گەورەترن كەوابوو زەوی ئەستێرەیەكی زۆر زۆر بچووكە لەناو (١٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) سەد هەزار ملیۆن ئەستێرەدا .دیسانەوە ئەبێ ئەوەش بزانین گەلە ئەستێرەی كاكێشان بەهەموو ئەستێرەكانیەوە كەسەد هەزار ملیۆن ئەستێرەیە هەمووی وەكو مێروولەیەك وایە لەچاو گەردووندا !!!

لەناو ئەم هەموو دروست كراوانەی خۆیدا ،پەروەردگار بایەخێكی تایبەتی داوە بە زەوی ئەو هەموو خەیرو خۆشیانەی لە زەوی دا دروست كردووە بۆ بەختیاری وژیانی ئادەمیزاد ئەم هەل ومەرجە سەرسوڕهێنەرانەی پێ بەخشیوین لەسەر ئەم كەشتیەیە كەلە بۆشایی ئاسماندا ئەڕوا بە ڕێوە هەروەكو یانەیەكی میوانداری یە بۆ ئێمە(دار الضیافة) بووین بە میوانێكی خۆشەویستی پەروەردگار لەم كەشتی یەدا !!! هەروەكو فەرموویەتی :

﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ﴾ (الاسراء:٧٠)

واتە : بەدڵنیاییەوە ئێمە ڕێزمان لە ئادەمیزاد ناوە .

ئەگەر تەماشای دروست بوونی ڕوەكە هەمەجۆرەكان بكەین لە دارو درەختی بەردارو میوەی هەمەجۆرو سەوزەو گژوگیا بۆ لەوەڕی ئاژەڵ، هەروەها هەندێكیشیان بۆ دروست كردنی دەرمان دژی چەندین نەخۆشی خراپ ، ئەگەر بە درێژی باسی سوودی تەنها ڕووەك بكەین پێویستە دەیان كتێبی لەسەر بنووسین .

هەروەها ئاژەڵەكان لە ووشكانی و زیندەوارانی دەریا لە زیان بەخش و سوود بەخش ئەگەر باسیان بكەین پێویستمان بە دەیان كتێب هەیە بنووسین ، ئەمانە هەمووی لەبەر خاتری ئادەمیزاد پەروەردگار دروستی كردوون .

دواجار ئەگەر تەماشای چۆنیەتی دروست بوونی خۆمان بكەین ئەوسا ئەزانین چ ووردەكاریەك لە دروست بوونی هەر ئەندامێك لە ئەندامەكانی لەشماندا هەیە تەنانەت لە دروست كردنی یەك خانەدا هەمان ووردەكاری سەرسوڕهێنەر ئەبینین.

پەروەردگار فەرموویەتی :

﴿وفي انفُسِكُم اَفَلا تُبصِرون﴾(الذاريات ٣)

واتە: تەماشای خۆتان بکەن ئایا نابینن .

مادده: ڕۆحی تێدانیە ، کە ڕۆحی نەبوو ، بێ گیانە ، بێ گیانیش ، بێ دەسەلاتە . کەوابوو (ڕێکەوت و کوێرانە دروست بوونی گەردوون) درۆکەی ئاشکرا بوو، بەڕێوەبردنی گەردوون دەسەلات و ئەقڵی ئەوێ .

**زانای فەرەنسی ( باستۆر ) سەلماندویەتی کە :**

زیندەوەرەکان لە مادەوە دروست نابن، لە خۆیانەوە دروست نابن بەڵکو لە هێلکەی زۆر وورد یان لە زیندەوەری زۆر بچووك کە بە میکرۆسکۆب نەبێت نابینرێ ..

دیسانەوە دەرکەوت هەرچی زانای بەناوبانگ لەکاتی خۆیدا (داروین) ووتویەتی دەربارەی ژیان هیچی ڕاست نەبوو !!!

ئەم زانایە لە کۆتایی تەمەنیا دانی نا بە هەڵەکانیداو باوەڕی هێنا بە پەروەردگار!!!

داروین: بە درێژایی تەمەنی ئەیووت هەموو زیندەوەرەکان لەیەك خانە دروست بوون و زۆربوون ، زۆر بچووك بوون پاشان گەورەبوون و پەرەیان سەندووەو جۆرەکانیان بەرەو باشتر ڕۆیشتووە (واتە گەشەیان کردووە) تاکو باشترینیان بووە بە ئادەمیزاد ..

بەلام لەپشکنینەکانی ژێر زەوی دا شوێنەواری هەندێ گیاندار دۆزراوەتەوە کەنزیکەی سێ سەد ملیۆن ساڵ لەمەو پێش ژیاون و زۆر گەورە بوون !!!

هەروەها ئادەمیزادی کۆن زۆر لە مرۆڤی ئێستا گەورەتر بووە، بەهێزتر بووە بەلام ئێستاو لەمەو دوایش مرۆڤ گەورەو بەهێز نابێت بەڵکو بە پێچەوانەوە بچووك و بێهێز ئەبێت بەهۆی پێش کەوتنی زانستەوە ئاسان بوونی کاروباری ژیان .

ئەگەر داروین ڕاستی بکردایە ئەبوایە مێرووله‌یەك بە گەشە کردن (تطور) ببوایە بە فیلێك ، ئیتر ئەوە هەر مەپرسە ئادەمیزاد ئەبوو بە چی!!!

تەنها پەروەردگارە سنووری بۆ هەموو شتێك داناوە ، ئەگەر سنووری بۆ زەردەواڵە یان هەر مێروویەکی تر دانەنایە گەورە ئەبوون زۆریش بۆ نموونە ئەگەر زەردەواڵەیەك وەکو گایەکی لێ بهاتایە ئەبوایە چیمان بکردایە !!!

زانای رووسی بەناوبانگ (اوبریان) سەرۆکی پەیمانگای (کیمیای ژیان) ئەڵێ:

(ژیان لە نەبوونەوە دەست پێ ناکات ، ژیانی ووردەکاری مرۆڤ و ئاژەڵ و ڕووەك گومانی تێدا نی یە لە ژیانەوە دەستی پێ کردووە ، واتە ژیان دروست نابێت بە بێ ژیان، شتی زیندوو لە شتی مردوو دروست نابێت !!!

ئایا هەرگیز بەردەکان ئەبن بە گیانلەبەر أوبریان کتێبی (الله والعلم الحدیث ل-١٦٤)

بەم جۆرە بۆمان دەرکەوت ژیان لە نەبوونەوە دەست پێ ناکات هەروەها لە مادەی بێ گیانەوە دەست پێ ناکات ، بەڵکو ژیان دروست بووە لە زیندووەکاندا بە دەسەلاتی پەروەردگار ، واتە (خولقاوە) هەروەکو فەرموویەتی:

﴿ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ فَاعْبُدُوهُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ﴾ (الأنعام:١٠٢)

هەروەها فەرموویەتی :

﴿مَا أَشْهَدْتُهُمْ خَلْقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلا خَلْقَ أَنْفُسِهِمْ وَمَا كُنْتُ مُتَّخِذَ الْمُضِلِّينَ عَضُداً﴾ (الكهف:٥١)

کەوابوو ژیان لە زیندەوەرەکاندا لەلایەن پەروەردگارەوە دروست کراوە کە ئەزەلیە و (الحی القیوم)ە لەم گەردوونەدا .

دیسانەوە فەرموویەتی :

﴿فَلْيَنْظُرِ الْأِنْسَانُ مِمَّ خُلِقَ﴾ (الطارق:٥)

واتە : ئادەمیزاد تەماشا بکات تاکو بزانێ چۆن دروست کراو لەچی دروست کرا باشە با بزانین چۆن دروست کراوین :

باشتر وایە هەر لە خانەیەکەوە دەست پێ بکەین :

خانە: ئەوەنـدە بچووکە بـە چـاو نـابینریٚ ، بـەرگێکی تـەنکی هەیـە وێنـەی دیـاری ئـەکا و ئـەیپاریٚزیٚ، لـەناو ئـەم بەرگـەدا ، مادەیـەکی هلامـی زینـدوو هەیـە پیٚـی ئـەڵێن (سایتۆپلازم)لەناو ئەم مادەیەدا چەند بەشێکی ووردو جۆراوجـۆر هەیـە ئیش وکـاری نـاوخۆیی خانـە ئەبـەن بەرێوە هـەروەها ئێزگـەی هێزی (مایتۆکۆنـدریا)ی تێدایـە !!! شـەکر ئەسـوتێنیٚ ئـەیکات بە ئـاوو دووەم ئۆکسیدی کاربۆن وەهەنـدیٚ ووزەیـش بـۆ جیٚبەجیٚکردنی ئیشی ئامێرەکانی خانە .

خانـە: هـەروەها چـاپخانەی تێدایـە ، پرۆتیناتەکـەی چـاپ ئـەکا !!! ترشـەڵۆکی ئەمینی بەکار ئەهێنیٚ لەم کارەداو ژمارەیـان بیـست جـۆرە هەریەکە لەگـەڵ ئـەوی‌تریان جووت ئەگریٚو پێك هاتوویەك دروست ئەکەن لـە دوو ترشـەڵۆك یـان سـیان بـەم جـۆرە بەردەوام ئـەبێت تـاکو پێك هـاتووی بچووك وناوەنـدی و گـەورەو زۆر گـەورە دروست ئەکـەن و پێیـان ئـەڵێن پرۆتینـات کەلـە زنجـیرەی درێـژ پێـك هـاتوون لـە ترشـەڵۆکە ئەمینیەکان .

ئایا چۆن گەردیلەی ئەم بەشانە لەگەڵ یەکتردا ڕادێن ؟

بیٚگومان بە ڕێگەیەکی تایبەت :کەلە کتێبی( الله یتجلی فی عصر العلم).

(زانای ئینگلیزی ج–ب–لیپیز )(J.B. Leathes)ئەڵیٚ:

(پرۆتینات هەندیٚ مادەی کیمیاوی بیٚ گیانـە ، ژیانیـان تێدا نـی یـە تـاکو ڕۆحیـان تیٚ ئەکریٚ و ئەوشتە سەرسوڕهێنەرەیە کە هێشتا هیچی لیٚ نازانین ، ئـەویش ئـەقڵی بیٚ کۆتایی یـە کـە تـەنها پـەروەردگارە ئـەتوانیٚ ئـەو بەشـە بچووکە پرۆتینـە ژیـانی تـیٚ کات وێنەی بۆ بکات و نهێنی ژیانی پیٚ ببەخشیٚ )

کـەوابوو بـاس کردنـی نهێنـی ژیـان لەسـەر ئـەم زەوی یـە زۆرمـان مـاوە تـیٚ بگـەین ،پـەروەردگار خـۆی بـاش ئـەزانیٚ لـە ئـادەمیزادەوە دەست پـیٚ ئـەکات ، واتـە لـە زادەی پێغەمبەری خواوە (ئادەم)(د.خ)کە لە قورئانی پیرۆزدا باسی ئەکات .

زانستیش کە پەرەی سەندو پێش کەوت ، ئەو ڕاستیانەی هەموو بۆ ئاشکرا ئـەبێت بـە تایبـەتی جیـایی ڕۆح لەلـەش چـونکە ڕۆح نهێنـی یەکـە لەلایـەن پـەروەردگارەوە ئەکرێتە لەشە فیزیاوی یەکانەوە !!!

کەوابوو پەروەردگار ئادەمیزادی کردوەتە بەرهەمی ئەم گەردوونە فراوانە ، مەبەست لە ئادەمیزادە لەسەرەتــــاوە تاکۆتایی !!

دروستی کرد لەسەر جوانترین شێوە ، کردی بە جێگەدار لەسەر زەوی ، نرخێکی تایبەتی بەرزی پێبەخشی ، لەبەر ئەوە ئادەمیزاد بەرپرسیارە بەرامبەر کردەوەکانی خۆی لە ڕۆژی دوایدا ، چوونکە بەبێ مەبەست ئادەمیزاد دروست نەکراوە :

هەروەکو پەروەردگار فەرموویەتی :

﴿أَفَحسِبتم أنما خلقْناكُم عبثاً وأنكُم إلينا لا ترجعونَ﴾ (ا ؤمنون:١١٥)

پەروەردگار ئەقڵێکی ڕاستی پێ بەخشی لەگەڵ بیرێکی پێگەیشتوو ، لە ڕێگەی ئەقڵەوە فێری ئەوەی کرد کە نەی ئەزانی ﴿واتە: زانست﴾ ئەم ئادەمیزادە هیچی لای خۆیەوە نەهێناوە بەڵکو سوودی لەو نهێنییانە وەرگرتووە کە پەروەردگار لە خۆیداو لە دەوروبەریدا بۆی ئامادە کردووە . هەتاکو بیریان لێ بکاتەوە زانیاری زیاتر فێر ئەبێت و ئەو شتانە ئەزانێت تاکو ئێستا نەی زانیوە .

هەروەها فەرموویەتی :

﴿ويخلُق ما لا تعلمونَ﴾ (النحل:٨)

واتە: (شتێکیش دروست ئەکات ئێوە نایزانن ) بێ گومان لەم گەردوونەدا زۆر شت ئەمێنێتەوە بە نهێنی کە ئادەمیزادو زانست و بوونەوەرەکانی تریش هیچی لێ نازانن تا کۆتایی گەردوون .

لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە:

﴿ويسألونك عنِ الروحِ قُلِ الروح من أمر ربي وما أُوتيتم من العِلْمِ إلا قليلاً﴾ (الاسراء:٨٥)

واتە : پرسیارت لێ ئەکەن دەربارەی ڕۆح ، بڵێ ئەوە فەرمانی پەروەردگارە ،ئێمە هیچ زانستێکی وامان پێ نەداون شایەنی باس بێت ، کەمێك نەبێت .

ئێستا ئەگەڕێینەوە سەر باسی (خانە) و ئەو ترشەڵۆکە ئامینیانەی کە تێیدایە تاکو ئەو شتە سەرسوڕهێنەرانە ببینین کە لە ٢٠ بیست ترشەڵۆکی ئامینی ئاڵۆزاو لەیەکتر بەهەزاران ملیۆن بەشە پڕۆتینی تێدایەو هەربەشە پڕۆتینێك کاری تایبەتی

**خۆی هەیە، نامەیەکی تایبەتی پێ یە ، تاکوو بزانین پەروەردگار چی دروست کردووە زۆر بە ووردی و ڕێك و پێکی.**

**چاپخانەی هەر خانەیەك لە خانەکان ژمارەیەکی زۆر (ڕایبۆسۆمات)ی Ribosomatتێدایە کە هیچیان ناتوانن یەك پیت چاپ بکەن تاکو فەرمانی چاپ کردنیان نەدرێتێ !!!**

**خانە شێوەیەکی بچووك کراوەی گەردوونە ، ئایا ئەو فەرماندەیە لە کوێیە کە ئەو فرمانە دەرئەکات ، گومانی تێدا نی یە ناوکی خانەیە ، کەوەکو مێشك وایە ، مێشك لەناو سەردایەو کاسەی سەر دەوری داوە ئەیپارێزێ . ناوکی خانە بەهەمان شێوە توێکڵی تەنکی خانە دەوری داوەو ئەیپارێزێ لەو یەکگرتنە کیمیاوی‌یانەی دەوروبەری کە شەوو ڕۆژ ڕووئەدات ، ئەم توێکڵە نەوەویە زۆر تەنکە بەلاّم توولەڕێی زۆر باریك و ووردی بۆ ئەڕوات تاکوو لە ڕێگەیانەوە فەرمانەکانی بەشە زۆر ووردەکان بەرێتە ژوورەوەو بیان هێنێتە دەرەوە ، واتە پەیوەندی بەردەوام هەبێت لەگەڵ فەرمانڕەوایی خانە ، ئەویش (ناوك)ە .**




**وێنەی ژمارە ( ٤ ) خانەیەکی گەورەکراو**

**خانەیەك بە چاو نابینرێ ، تەماشای وردەکاری لەدروست کراوەکانی پەروەردگار بکە.**

**لێرەدا پێویستە تەماشای ناوکی خانە بکەین کە زۆربەی نهێنیەکانی تێدایە هەروەکو ئەو نهێنیانەی لە مێشك دایە ، واتە (ناوك) مێشکی خانەیە.**

ئەم ناوكە هەرچەندە زۆر زۆر بچووكە ، بەلاّم هەروەكو نووسینگەیەكی زۆر گەورەو فراوان وایە كە چەندەها بەشی بەڕێوەبردنی تێدا بێت هەربەشێكی بەڕێوەبردن بریتیە لەیەك (كرۆمۆسۆم)!!! لە ناوكی یەك خانەدا ٤٤ چل و چوار كرۆمۆسۆم هەیە واتە ٢٢ جووت كە هەر جووتێك وێنەیەكی ڕاستی ئەوی تریانە.

ئەمە بێجگە لە دوو كرۆمۆسۆمی تر ڕەگەزی ئادەمیزاد دیاری ئەكەن هێمای پیتی وای $Y$ بۆ ڕەگەزی نێرەو هێمای پیتی $X$ بۆ ڕەگەزی مێ یە ، هەروەكو باسمان كرد هەر جووتە كرۆمۆسۆمێك بە وێنەی ئەوی تریانە بەهەموو جۆرێك ، واتە هەردووكیان لەیەك ئەچن !!! ئەمە بۆچی وایە ؟ سبحان الله !!!ئەم جووتە یەكێكیان سپێرە واتە احتیاط نەوەكوو یەكێكیان ناتەواو بێت یان كەڵكی نەمێنێ بەهۆی نەخۆشی یەكەوە ئەوی تریان جێی ئەگرێتەوە !!! ماشا و الله لە كاری پەروەردگار لێرەدا با بزانین گرنگی ئەم كرۆمۆسۆمانە چی یە ؟ واتە ئەم ٢٢ بەڕێوەبەرێتی یە بۆچی دروست كراون؟ زانست ئەڵێ :

ئەمانە هەروەكو تۆمارگەو ئەرشیفی كیمیاوین ، ئەو زانیاریانەی دەربارەی ڕەگەزەوە لەهەر جووتە كرۆمۆسۆمێك دا تۆمار كراوە لەوانی تردا نی یە !!تەنها كرۆمۆسۆمێك دەیان هەزار مەلەفەی لەسەرە ، كەهەریەكەیان پێ ی ئەوترێ (جینە) تەنها یەك (جینە) پلانێكی ڕەگەزایەتی تێدایە ، كەوابوو ! ژیان پلانەكانی ڕەگەزی تۆمار كردووە لەسەر شریتی جینەكان لە كرۆمۆسۆمەكاندا ئەمانیش لە ناوك دان ، ناوكیش لە خانەدایە ، لە گۆڕەپانی سایتۆپلازمدا ئەسوڕێتەوە كە هەزاران كرداری كیمیاوی بەدەوردا ڕووئەدات بەشەوو بەڕۆژ .

ئەگەر بە مایكرۆسكۆب تەماشای جینات بكەین

هەروەكو دەنكە تەسبیح ڕیز بوون لەسەر پەتێك كە كرۆمۆسۆمێكە




**وێنەی ژمارە (٥) جینەکان لەسەر کرۆمۆسۆمەکان بەڕیز دانراون**

ئـەبینین جینــەکان لەســەر کرۆمۆســۆمەکان ڕیزکـراون ، ئــەو دەنکانــە هەریــەك جینەیەکن لەهەر جینەیەکدا پڕۆگرامی ڕەگەزی دیاریکراو هەیە !!!

ئەگەر ئەم شریتانە دەربێنین و بیکەینـەوە ئەبینین هـەر شریتێك نزیکـەی ١٧٥ سم درێژە ، بـەڵام ئەسـتوورایی زۆر کەمـە وە بەشـێکە لـە نیـو ملیـۆن بەشـی ملیمـەترێك !!! ماشاء الله لە دروست کراوەکانی پەروەردگار لەگەڵ ئەم تەنکیـەش دا ئـەم نووسـینگەیە هەشـت هـەزار ٨,٠٠٠ ملیـۆن شـفرەی کیمیـاوی تێدایـە ئەمـە تـازەترین دۆزینـەوەی زانستی یە ، کەوابوو ئەم دروست کراوە سەرسوڕهێنەرانە لەیەك خانـەدا کـە بەچاو نابینرێ زانسـتێکی زۆر کۆنـەو ووردەکـاری یەکـە هـەزاران ملیـۆن سـاڵە پـەروەردگار لەیەکەم خانەی بوونەوەردا بەم شێوە ڕێك و پێکە نەخشەی کێشاوە !!!

هەندێ لە زاناکان تەنها بە بینینی ئەم خانەیەو شتە سەرسوڕهێنەرەکانی باوەڕیان بە پەروەردگار هێناوە ، هەروەکو خۆی فەرموویەتی :

﴿وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلا تُبْصِرُونَ﴾ (الذريات:٢١)

واتە: تەماشای خۆتان بکەن ئایا نابینن ؟

ئەمە تەنها نهێنی یەك خانە بوو ، لەش لە ملیۆنەها خانە پێك هاتووە !!!

خواناسان دڵنیا بن گەورەیی پەروەردگارو دەسەڵاتی لە خانەیەك دا دەرئەکەوێ ئەوەندە بچووکە بەچاو نابینرێ خوانەناسان بیربکەنەوە بزانن پرسیار بکەن لە زاناکان زانست وەرگرن، باوەڕ بێنن بە پەروەردگار دروست کەری ئەم گەردوونەیە بەهەموو بوون و بوونەوەرەوە !!! پاشان هەموومان بە دڵ ئەڵێین: (أشهدُ أنَ لا اله الا الله وأشهدُ اَنَ محمداً رسولَ الله)

چوونکە ئەو شێوە ڕێك و پێکە بەو هەموو ووردەکاریە سەرسوڕهێنەرەوە ، هەرگیز بە ڕێکەوتی کوێرانە دروست نەبووە هەروەها هەرگیز لە خۆیەوە کاروباری خۆی ناتوانێ بەرێت بە ڕێوە بە ڕێك و پێکی ڕەگەزی ملیۆنەها ساڵ تاکو ئێستا لە ناو فایل دا بە پێچراوەیی بە پاك و خاوێنی بێ دەست کاری ناتوانێ بپارێزێ جیل لە دوای جیل بە ئەمانەت، بەردەوام بیگوێزێتەوە !!! (الله اكبر ولله الحمد)

ئەمە باسی تەنها یەك خانە بوو کە بە چاو نابینرێ لەبەر بچووکی ، لەش لە سەدان ملیۆن خانەی لەم جۆرە دروست بووە بێجگە لە خڕۆکە سوورەکانی خوێن کە ژمارەیەکی زۆرن لە خانەکان لە خانەی یەکەمی جووت بوونەوە جیابوونەتەوە کە بووە بە دوو بەشەوە دوایی چوار دواتر هەشت پاشان شانزە هەروەها بەردەوام دووقات زۆربوون تاکوو خانەکان بوون بەسەدان هەزاران ملیۆنەها دەیان ملیۆنەها هەزاران ملیۆنەها لەگەڵ ئەوەشدا ئەم هەموو خانانە لە شێوەو قەبارەو لە ئیش و کاردا جیاوازن !!

بۆ نموونە : خانەکانی هەرس کردن تەنها ئیش و کاری هەرس و مژین و ڕشتنی مادە لەلوولەکاندا ئەکەن بۆ لەش هیچ ئیشێکی تر ناکەن واتە ناتوانن ئەو کارانە ئەنجام بدەن کە خانەکانی مێشك ئەنجامی ئەدەن یان خانەکانی دڵ ئەنجامی ئەدەن

یان خانەکانی سی یەکان یان چاوەکان یان هەر ئەندامێکی تری لەش تایبەتن بە ئیش و کاری خۆیان نەك ئەوانی ترکەوابوو ژیان لە خانەیەکی زیندووەوە دەست پێ ئەکات کە بە میکرۆسکۆب نەبێت نابینرێ ، ئەم خانە زۆر بچووکە مادەیەکی لینجی تێدایە پێ ی ئەڵێن (پرۆتۆپلازم) کاری ژیانی تێدایە ، ئەم مادەیە لە هەوادا ئەجوڵێتەوە دووەم ئۆکسیدی کاربۆن وەرئەگرێ لە کاتێکدا خۆر هەبێت هیدرۆجین لە ئاو جیائەکاتەوە بەم جۆرە :

پێك هاتووی کیمیاوی دروست ئەکات، ئەبێت بە خۆراك بۆ خانە، گەشە ئەکات، جیا ئەبێتەوە، دووجار دووجار خانەکان زۆر ئەبن لە یەك خانەوە تاکو ملیۆنەها خانە.

زاناکان زۆر لە مێژەوە تاکوو ئێستا هەوڵیان داوە کە مادەی (پرۆتۆپلازم) دروست بکەن ، هەزاران تاقی کردنەوەیان کردووە بەهەزاران جۆرە مادەی کیمیاوی تاکو ئێستاش نەیانتوانیوە ئەم مادەیە دروست بکەن ، ئەم مادەیە نهێنی ژیانی تێدایە تەنها دروست کەری ڕاستەقینەی کە هەزاران ملیۆن ساڵ لەمەو پێش دروستی کردووە ئەویش پەروەردگارە .

هەرلەبەر ئەوەیە زۆربەی زاناکانی جیهان باوەڕیان بە پەروەردگار هێناوە و ئەڵێن :

(هیچ دروستکراوێك ناتوانێ خۆی دروست بکاتەوە) ، ئەمەیە دروست کراوی پەروەردگارو کاری ئەوە لە خانەیەکی بچووکی وادا کە بە چاو نابینرێ و نهێنی ژیان لە مادەیەك دایە کە هەموو زانست وزاناکان لێ ی سەرسام و سەرگەردانن بە هیچ شێوەیەك پرۆتۆپلازمیان بۆ دروست ناکرێ !!!

هەروەکو لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی :

 هذَا خلْق الله فَأرونِي ماذَا خلَق الذين من دونِه بل الظالمونَ في ضلالٍ مبِينٍ  (لقمان:١١)

واتە: ئەمەیە دروست کراوی پەروەردگار پیشانمان بدەن بزانین خوانەناسان چیان دروست کردووەو لە تاریکی دا ئەژین .

## گەرد -الذرة

شوێنەواری دەستی بەزەیی پەروەردگار لە هەموو شتێك دا دیارە ، لە بچووكترین بەشی مادە كە پێ ی دەوترێ (گەرد – اَلْذَّرَّة)ئەگەر تەماشای بكەین ئەزانین چۆن بە ووردی و بە ڕێك و پێكی دروست كراوە ، زانایانی ئەم چەرخە ، شارەزایانی گەرد ، باسمان بۆ ئەكەن ، ئەم گەردە بچووكە چۆن دروست بووە ؟

## تیرەی گەرد:

درێژی تیرەی گەردێك یەك بەشە لە سەد ملیۆن بەش ١٠٠,٠٠٠,٠٠٠ لەیەك سنتیمتر ، واتە یەك سنتیمتر بكەین بەسەد ملیۆن بەشەوە ، درێژی تیرەی گەردێك یەك بەشە لەو سەد ملیۆن بەشە!!!

ئەمەیە ووردەكاری كارەكانی پەروەردگار. زاناكان زۆر سەرسامن لەم ووردەكاری‌یە!!!.

**ناوكی گەرد:** لەوەی باسمان كرد ووردەكاری ترو جێ ی سەرسوڕمان زیاتر ئەوەیە گەرد ناوكی هەیە، ئەم ناوكە یەك بەشە لەسەدهەزار بەشی گەردەكە ١/١٠٠,٠٠٠ واتە ئەگەر گەردەكە بكەین بەسەدهەزار بەشەوە ناوكەكەی بەقەدەر بەشێكیەتی.

دروست بوونی گەردێك هەروەكوو دروست بوونی كۆمەڵەی خۆرە

واتە: خۆر ناوكەو مانگ و زەوی و ئەستێرە گەڕۆكەكانی تریش ئەوبەشە ووردانەن كەبەدەورەی ناوكەكەدا ئەسووڕێنەوە!!!.

لەناو ناوكەدا ئەمانەهەیە ١-پڕۆتۆن: هەڵگری بارگەی كارەبایی گەرمە ((+)) . ٢-ئەلەكترۆن: هەڵگری بارگەی كارەبایی ساردە ((−)) لەدەرەوەی ناوكەدا. ٣-نیوترۆن: بێلایەنە: یارمەتی یەككگرتن و پەیوەست بوون ئەدات لەناو ناوكی گەردا، هەروەها ناهێڵی پڕۆتۆنەكان لەیەكتر دووربكەونەوە!!.

گەردی هیدرۆجین لەیەك پڕۆتۆن لەناوكی‌داو یەك ئەلەكترۆن بەدەوری‌دا پێك هاتووە بەڵام گەردەكانی‌تر ژمارەی ئەلەكترۆن و پڕۆتۆنەكانیان و نیۆترۆنەكانیان زۆرترە.

**كتێبی/ شهادە الكون/ عبدالودود رشید محمد**

**گەردیلە/** گەردیلەکان لەگەردەکان دروست ئەبن، گەردیلەی گازی هیدرۆجین لەدووگەرد پێك هاتووە /H2/

هەروەها گەردیلەی ئاو لەدووگەردی هیدرۆجین و یەك گەردی ئۆکسجین پێك هاتووە ($H_2O$).

گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن لەیەك گەردی کاربۆن و دووگەردی ئۆکسجین پێك هاتووە($CO_2$) .

## ((ڕێکخستنی ئەلەکترۆنەکان بەدەوری ناوکی گەردێکدا))

ئەلەکترۆن هەرلەخۆیەوە لەخولگەیەکدا ناسوڕێتەوە بەدەوری ناوکدا بەشێوەیەکی کوێرانە، بەڵکو لەخولگەیەکدا ئەسووڕێتەوە کەلەگەڵ ووزەی ئەلەکترۆنەکەدا بگونجێ، واتە بەگوێرەی ئەو ووزەیەی کەلەناو ئەلەکترۆنەکە خۆی دا هەیە شوێنی خۆی ئەگرێ و لەخولگەیەکدا بەدەوری ناوکدا ئەسووڕێتەوە.

ئەم خولگانە پێ یان دەووترێ ((رادەکانی ووزە)).

ئەگەر ئەلەکترۆن ووزەکەی زیاتربوو لەناوکدا دوورئەکەوێتەوە واتە لەخولگەیەکی دووردا ئەسووڕێتەوە.

ئەگەر ووزەکەی کەم بوو لەخولگەیەکی نزیك ناوکە ئەسووڕێتەوە لەدەرەوەی ناوکدا.

<u>**ووزە:**</u> بریتی یە لەبەشێکی بچووك لەشەپۆلی کهرۆموگناتیسی لەسەر شێوەی (فۆتۆنات).

لێرەدا ئەبێ ئەوەبزانین گەرد فوتوناتی تایبەتی خۆی وەرئەگرێ نەوەك هەمووجۆرێك.

بەم شێوەیە درێژە بەژیان ئەدات بەهۆی یەکگرتنە کیمیاوی و بیولوجی یەکانەوە.

کەوابوو گەرد: ئەو فۆتۆناتە وەرئەگرێ کە درێژی شەپۆلەکانیان دیاریکراوە، هەروەکوو چۆن گۆشت دەرخواردی مەڕێك بدەین نایخوات. بەوجۆرە گەرد ئەگەر شەپۆلی فوتونەکان دیاریکراونەبێت کەبگونجێ وەری ناگرێ

ئەگەر ئەم یاسا ڕێك و پێكە نەبووایە تەنها گەردیلەیەك دروست نەئەبوو لەهیچ مادەیەك.

تەماشاكە خاوەن باوەڕ تەماشاكە بیٚ باوەڕ: گەردێك بەشێكە لەسەدهەزار بەشی سنتیمترێك بزانە لەم بەشە زۆر زۆر بچووكەدا چۆن یاسایەك و چۆن ڕێك و پێكی و بەڕێوەبردنێك هەیە

ئایا ئەم كردارانە دیسانەوە ڕێكەوتی كوێرانەیەو لەخۆیانەوە دروست بوون؟

## ((ئەوهێزانەی پارێزگاری هاوسەنگی ئەكەن))

ئێستا پێویستە باسی ئەوهێزانە بكەین كەپارێزگاری گەردئەكەن لەناوەوە، ناهێڵن گەرد بتەقێتەوە بەڵكو ئەبێتەهۆی پەیوەندی بەستن لەگەڵ دراوسێكانیدا.

بەهۆی ئەوهێزانەوە كەهاوسەنگی ئەكەن زۆر بەووردی و ڕێك و پێكی گەردوون هەیەو ئێمەش هەین.

(( **ئەو هێزانەش كەحوكمی مادەئەكەن و كارئەكەنەسەر یەكتری ئەمانەن** ))

١–هێزی راكێشان.

٢–هێزی لاواز.

٣–هێزی كهروموگناتیسی.

٤–هێزی ئەتۆمی.

١–<u>هێزی راكێشان:</u> ئەم هێزە لەهێزەكانی تر لاوازترە، هەرچەندە لاوازە بەڵام هێزێكی تایبەت و جیاوازە لەهێزەكانی تر.

تەوژمی ئەم هێزە زۆرئەبێت بەكۆبوونەوەی گەردەكان و گەردیلەكان تاكوو لەكۆتاییدا ئەگاتە پلەیەك زاڵ ئەبیٚ بەسەر هێزەكانی تردا.

ئەم هێزی راكێشانە هەرچەندە كەمە لەچاو هێزەكانی تر، بەڵام تاكە لەناویان دا كەكاریگەرە بۆ شوێنە زۆر دوورەكان لەناوەڕۆكی گەردوون دا، هەرئەم هێزەیە مانگی راگرتووە بەدەوری زەوی دا، زەوی راگرتووە بەدەوری خۆردا، هەروەها ئەستێرەكان

بەشـێوەی گەلـە ئەسـتێرەو گەلـە ئەسـتێرەکان بەشـێوەی کۆمەڵـەی گەلەئەسـتێرە رای گرتوون هێزی راکێشان لەناو گەرد زۆرکەمە.

بـەڵام ئەگـەر گـەردو گەردیلـەکان زۆر بـبن و یـەك بگـرن، گـەورەترین هێـز دروسـت ئەکـەن، هـەروەکوو هێـزی ئەشـکەوتە رەشـەکانی ئاسمـان کەئـەتوانن گـەورەترین ئەستێرەقووت بدەن و رای کێشن بۆلای خۆیان.

٢-**هێزی لاواز:** ئەمە دووەم هێزە لەلاوازیدا دوای هێزی راکێشان، بەهێزی(ئەتۆمی لاوان) هەندێجار ناوئەبرێ ئەمەش لەئەنجامی گۆڕانی نیوترۆن ئەبێت بۆ پرۆتـۆن و ئەلـەکترۆن و نیۆترینـۆ کـەپێی ئـەوترێ (گـۆڕانی بیتـا) هەنـدێجار ئەمـە رووئـەدات لەئەنجامی هەندێ کرداری تیشك دانـەوە هـەروەها کاریگـەری هێزی لاواز لەسـنووری ناوکی گەرد بەدەرنیە.

بـوونی نیـوترۆن لـەناوکی هـەموو گـەردێك لەتوخمەکانـدا (بێجگـە لەهیـدرۆجین) فەرمانی بەسـتنەوەی پرۆتۆنـە هـەڵگرەکانی بارگـەی کارەبایی گەرم + لەناوکدا پـێ ی سپێرراوە و ناهێڵێ جیاببنەوەو لەیەکتر دووربکەونەوە.

ئەم فرمانە نهێنیەکە لەم شوێنە ووردوو نهێنی کەدا بەچاو نابینرێ کـێ دەریکرد تاکوو لێرەدا زۆربەرێك و پێکی جێ بەجێ بکرێ؟؟ بێ گومان فەرمانی پەروەردگارە یـەك نیـوترۆن بـەس نـی یـە بۆیـەك پرۆتـۆن، بـەڵکو هـەتاکو نـاوکی گـەرد گـەورەبێت ژمارەی نیۆترۆنەکانی زیاترئـەبن لـەژمارەی پرۆتۆنـەکانی ئەمـەش تاڕادەیـەك، چـونکە ئەگـەر جیـاوازی ژمارەکـان زۆربـوو لەڕادەبـەدەر، ئەوەتیـشك دانـەوە دروسـت ئـەبێت، بۆئەوەی تیشك دانەوە دروست نەبێت رادەی ژمارەی نیـۆترۆن و ئەلـەکترۆن بـەم شـێوە ئاسایی یـە: ٤٠ پرۆتـۆن پێویـستی بـە ٥٠ نیوترۆنـە بۆئـەوەی نـاوك ئـارام بێـت. ٧٠ پرۆتۆن بۆ ١٠٠ نیوترۆن بەم رێژەیە ناوك ئارام ئـەبێت، ئەگـەر ئـەم رێژەیـە تێك بـچێت ئەوە ناوك ئارام نابێت و تیشك دانەوە دروست ئەبێت.

## ٣ -هێزی كهرۆموگناتیسی:

ئەم هێزە پلەی سێ هەمی هەیە لەهێزەکانی پارێزگاری هاوسەنگیدا بەرزترین پلەی ئەم هێزە: هەزاران هەزار، ملیۆن ملیۆن جار لەهێزی راکێشان بەهێزترە،زاناکان ئەڵێن: ئەم هێزە فەرمانی ئەوەیە گەردوو گەردیلەکان ببەستێ بەیەکەوە واتە کاری گەریان لەسەر ئەوانەیە کەهەڵگری بارگەی کارەباین.

هەروەها ئەم هێزە ئەلەکترۆنەکان رێك ئەخات لەسەر خولگەکانیان بەدەوری ناوك دا.

کەواتە: ئەم هێزە، گەردو گەردیلەکان ئەبەستێ بەیەکەوە، لەگەڵ یەکتریەك ئەگرن و ئەوبەشە بچووکانەی ئەم هێزە کاریان تێ ئەکات پرۆتۆن و ئەلەکترۆنە، بەڵام نیوترۆن بێلایەنەو هەڵگری هیچ جۆرە بارگەیەکی کارەبایی نیە، هێزی کهرۆموگناتیسی دووجەمسەری هەیە: گەرم + و سارد –، جەمسەرە وەك یەکەکان جیائەبنەوەو دوور ئەکەونەوە لەیەکتر بەڵام جەمسەرە جیاوازەکان نزیك ئەبنەوە لەیەکترو یەك ئەگرن.

بارگە کارەبایی یەکان لەئەلەکترۆن و پرۆتۆنەکانی دا بەقەدەر یەکن، واتە یەکسانن بەشێوەیەکی زۆر ووردو رێك و پێك.

کەوابوو بارگەیەکی کارەبایی لەپرۆتۆنێك دا زۆربەتەواوی رێکی بارگەیەکی کارەبایی یە لەئەلەکترۆنێك دا. لەم هێزەدا هێزی (کهرۆموگناتیسی) هەرچەندە بارستایی‌یان جیاوازە. بارگەی کارەبایی تایبەتێك نی یە لەتایبەتەکانی مادە بارستایی ئەلەکترۆن = ١ لەچاو بارستایی پرۆتۆن = ١٨٣٦ یان نیوترۆن ، هەتاکو ئێستا سروشتی بارگەی کارەبایی نهێنیە و زاناکان سەریان سوڕماوەو سەرگەردانن.

دیسانەوە ئەمەیە کاری پەروەردگار﴿وما أوتيتم من العلم إلا قليلاً﴾ 

هەروەها ئەفەرمووێ: ﴿الله نور السماوات والأرض﴾ 

کەوابوو جیاوازی بارستایی لەنێوان ئەلەکترۆن و پرۆتۆن دا هیچ کاریگەری یەکی نی یە، بەیەکسانی دووبارگەی کارەبایی لەدووجەمسەری جیاوازو وەك یەك دا یەکسانی گەرد تەواوئەبێت لەکارەبادا.

هێزی راکێشان لەنێوان جەمسەرە جیاوازەکان دا کەهێزی کهرۆموگناتیسی پیشان ئـەدات ئەلەکترۆنـەکان ئەبەسـتێ بەیەکـەوە کەبارگـەی کارەبـایی سـاردیان لەسـەرە بەدەوری ناوك دا، ناوکیش پرۆتۆنەکانی تێدایەو بارگەی کارەبایی گەرمیان لەسەرە.

ماوەو گورەپانی کاریگەری هێزی کهرۆموگناتیسی ئەگاتە شوێنی زۆر دوور ئەم هێزەش بەپلەی دووەم دێت لەدوای هێزی چوارەم.

٤-**هێزی نەوەوی**: (**یان ئەتۆمی**) بەهۆی هێزی موگناتیسی یەوە ناوکی گەرد ئەتوانێ پارێزگاری سووڕانەوەی ئەلەکترۆنـەکان بکـات لەخولگـەکانیان دا، هەرچەندە تیرەی خولگەکان فراوان ترە نزیکەی ١٠٠,٠٠٠ سەد هەزارجار لەتیرەی ناوکی گەرد.

ماشاء الله و سبحان الله لەکاری پەروەردگار

 **وترى الْجِبالَ تحسبها جامدةً وهي تمر مر السحابِ صنع الله الذي أتقَن كُل شيءٍ إنـه خبِ بِما تفْعلُونَ﴾ (النمل:٨٨)**

## ((روودانـی بـچووکترین هەڵـە لەیاسـاکانی گـەردوون دا ئەبێتـە هـۆی هەڵگەڕانەوەو کاول بوونی هەموو گەردوونو نەمانی بوون و بوونەوەر))

ئەگەر تەماشای گەورەیی و دەسەڵاتی پەروەردگار بکەین ئەبینین:

لەهەموو گەردوون دا هێزی کهرۆموگناتیسی بەرامبەرە لەنێوان هەردوو جەمسەری جیاوازدا.

واتە: ژمارەی هەموو جەمسەرە گەرمەکان لەگەردوون دا یەکسانە لەگەڵ ژمارەی هەموو جەمسەرە ساردەکان لەهەموو گەردوون دا. ئەگەر تەنها جەمسەری یەکێکیان بچێتەسەر ئەوی‌تریان واتە یەك جەمسەر جیاوازی یان هەبێ لەزۆرو کەمی دا، لەماوەی چەند چرکەیەکدا هەموو گەردوون و بوون و بوونەوەر لەناوئەچن .

﴿ إنا كُل شيءٍ خلقْناه بِقَدر ﴾ (القمر:٤٩)

سوپاس بۆ پەروەردگار ئەم ڕێکخستنە سەرسوڕهێنەرە بەڕێوەئەبات ئایا ئیتر بەحاڵەتی کەساسی یەوە خوانەناسەکان چی ئەڵێن؟

ئایا ئێستاش هەرئەڵێن بەڕێکەوتی کوێرانە گەردوون دروست بووەو خۆی لەخۆیەوە ئەچێت بەڕێوە؟.

لەبەرئەوەی باسی هێزی کهرۆموگناتیسی مان کرد، کەمێك باسی تیشکی خۆرئەکەین یان تیشکی کهرۆموگناتیسی:

زانای بەناوبانگ(إسحاق نیوتن) سەلماندی کەتیشکی خۆر لەچەند ڕەنگێکی جیاوازپێك هاتووە، هەروەها شەپۆل و لەرینەوەی جیاوازی هەیە....

ئەم زانایە لەتیشکی خۆردا ئەم ڕەنگانەی دۆزی‌یەوە:

١-سوور ٢-پڕتەقاڵی ٣-زەرد ٤-سەوز ٥-شین ٦-وەنەوشەیی

هەروەها زانی شەپۆلە کهرۆموگناتیسی‌یەکان خاسیەتی جیاوازیان هەیە، بەڵام خۆیان جیاوازنین....

بۆ نموونە: ئەوشەپۆلانەی دێنەبەرچاومان و ئەو شەپۆلانەی دێنەبەرگوێمان لەڕادیۆوە، وەکوو یەك وان، هەرچەندە لەخاسیەتەکانیان دا جیاوازی هەیە، هەروەها هەڵگری هێزی پەروەردگارن ئەوهێزەی لەشتێك هەموو شتێك دروست ئەکات.

**تیشکی کهرۆموگناتیسی: لەم تیشکانە پێك هاتووە:**

١-تیشکی ((گاما)) ٢-تیشکی سینی یان ئێکس X ٣-تیشکی وەنەوشەیی ٤-تیشکی بینراو ٥-تیشکی ژێرەوەی سوور. لەگەڵ شەپۆلی ((مایکرۆویف)) و شەپۆلە رادیۆوی یەکان.

ئەو خاسیەتە جیاوازانەی لەم شەپۆلانەدا هەیە ئەگەڕێتەوە بۆ درێژایی یان، ئەم جیاوازی درێژی‌یە ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو بڕە ووزەیەی کەلە فوتۆنەکانیان دا هەیە (فۆتۆن بارستەی نیە، هەڵگری شەپۆلی کهرۆموگناتیسی یە).

هەتاكو ووزە زۆربێت لەفۆتۆن دا درێژی شەپۆل كەم ئەبێتەوەو لەرینەوە زۆرئەبێت.

درێژی شەپۆل بریتی یە لەماوەی نێوان دوولووتكەی دراوسێ لەشەپۆلەكان دا.

لەرینەوە بریتی یە لەبڕی ئەوشەپۆلانەی لەچركەیەك دا ئەڕۆن بەخاڵێكی دیاریكراودا.

بۆ نموونە: لەرینەوەی تیشكی (گاما) گەورەترەلە لەرینەوەی تیشكی بینراو بەڵام شەپۆلەكانی كورتە.

هەروەها فۆتۆنی تیشكی (كاما) ووزەی زۆرتری تێدایە لەفۆتۆنی تیشكی بینراو واتە: هەتاكو ووزە كەم بكات درێژی شەپۆل زیاد دەكات.

بەم جۆرە فۆتۆن ئەبێت بەگوێزەرەوەی (ناقل) تیشكە شەپۆل درێژەكان لەتیشكی كهرۆموگناتیسی دا.

## ((كرداری تیشك دانەوە))

ئەم كردارە بریتی یە لەگۆڕانی ناوكی گەرد لەحاڵەتێكی نائارامی یەوە بۆ حاڵەتێكی ئارام.

بەڵام لەحاڵەتی هێزی راكێشان دا گۆڕینەوە رووئەدات لەڕێگەی شتێكی زۆر بچووكەوە پێی ئەڵێن (گراڤیتۆن) **Graviton**.

زاناكان لایان وایە هەروەكوو فۆتۆن بارستایی نەبێت و بەخێرایی تیشك بڕوات. بەڵام ئەو ووزەیەی لەسەریەتی زۆركەمە بەشێوەیەك زاناكان بەهەموو ئامێرەپێش كەوتووەكانیانەوە بەهەموو تاقیكردنەوەكانیانەوە چاودێری ئەكەن ناتوانن ئەو ووزەیەی دیاری بكەن، لەبەرئەوەی زۆر زۆر بچووكە بەڵام زانا تایبەتەكانی ئەم بوارە ئەڵێن: ووزەی فۆتۆن = $١٠^{٣٩}$ دەتوان سی ونۆ ، دوو ئەوەندەی ووزەی گراڤیتۆنە.

## ((دروست بوونی شەپۆلە كهرۆموگناتیسی یەكان))

ئەم شەپۆلانە بریتین لەو شەپۆلانەی كەدروست بوون لەماوەیەكی كارەبایی و ماوەیەكی موگناتیسی، بەمەرجێك هێڵەكانی ماوەی كارەبایی هەمیشە ستوونیە

لەسەر هێڵەکانی ماوەی موگناتیسی، هەروەها خێرایی یەکەیان خێرایی رووناکی یە لەبۆشایی دا ۳۰۰,۰۰۰سێ سەد هەزار کیلۆمەترە لەچرکەیەکدا.

لێرەدا بۆمان دەرئەکەوێ خێرایی دەنگ زۆر کەمترە لەخێرایی رووناکی هەروەها دەنگ لەبۆشایی گەردوون دا ناڕوات واتە ئەگەردووکەس قسەبکەن لەسەرمانگ دەنگی یەکتر نابیسن بەڵام چۆن قسەئەکەن؟ ئەوقسانە ئەخەنەسەر شەپۆلی کهرۆموگناتیسی بەهۆی ئامێری تایبەتەوە قسە لەگەڵ یەکترئەکەن.

درێژی شەپۆلە کهرۆموگناتیسی یەکان جیاوازی یەکی زۆریان هەیە لەبەشێکی میلیمەترەوە تاکوو دەیان کیلۆمەتر.

## ((لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە))

چۆن پڕۆتۆنەکان بارگەی کارەبایی گەرمیان لەسەرە بەیەکەوەن لەناوك دا؟ لەکاتێك دا هێزێکی دوورکەوتنەوەی گەورە هەیە لەنێوان جەمسەرە لەیەك چووەکان؟؟

وەڵام: ئەگەر لەناوك دا تەنها ئەم هێزە ببوایە، واتە هێزی کهرۆموگناتیسی هەرگیز دووپڕۆتۆن لەجێگەیەك دا کۆنە ئەبوونەوە، لەبەرئەوە پێویستە هێزێکی تری زۆرتر لەو بەهەزارجار ببێ بۆ کۆکردنەوەی پڕۆتۆنەکان لەشوێنێکدا. بەم جۆرە ئەبینین هێزێکی‌تر دەرئەکەوێ بۆ کۆکردنەوەی پڕۆتۆن و نیۆترۆن لەناوك دا بەیەکەوە، ئەم هێزەش هێزی چوارەمە کەپێ ی ئەڵێن: هێزی ئەتۆمی (یان نەوەوی) هێزەکەی دووهەزارجار لەهێزی کهرۆموگناتیسی بەهێزترە.

بەڵام ماوەی کاریگەری‌یەکەی لەناوکی گەرد تێپەڕناکات ئیشی ئەوەیە پڕتۆنەکان و نیوترۆنەکانی ناوك ئەبەستێ بەیەکەوە ئەم هێزە لەئەنجامی گۆڕانی بەشێك لەبارستایی ناوکەکان (پڕۆتۆن و نیۆترۆن) بۆ ووزە دروست ئەبێت.

کەوابوو فەرمانی پارێزگاری مانەوەی ناوك بەیەك بارستایی ئەکەوێتەسەر هێزی نەوەوی، واتە هێزی نەوەوی ئەرکی پارێزگاری مانەوەی ناوکی بەیەك بارستایی لەسەر شانە، لێرەدا لەهێزی لاوازئەچێت کەکاریگەری لەناوك تێپەڕ ناکات.

برای ئادەمیزادی بەڕێزم...تەماشاکە

هەروا دەركەوتنی گەردو دروست بوونی ئاسان نی یە.

هەروا دروست بوونی هەموو گەردوون لەم گەردانە ئاسان نی یە.

بەڵكو حسابێكی زۆر ووردی هەیە ڕێكی ووردی هەموو گەردەكانی گەردوون

ئەم ووردەكاری یەی پەروەردگارە هاوكێشەیی لەگەردوون ئەپارێزێ گەردوونێك سەدان ملیار ساڵی رووناكی فراوانە، هەربەم ووردەكاری یە ئەو چوار هێزەو ئەوتەنانەی ناوكی گەرد باسمان كرد كاری خۆیان بەرێك و پێكی ئەبەن بەڕێوە بەفەرمانی پەروەردگارو دەسەڵاتی بەهێزی خۆی.

ئایا ئەگەر ئەوچوار هێزەی باسمان كردن یەكێكیان نەمێنێ چی ڕووئەدات؟؟

وەڵام:

١-ئەگەر هێزی نەوەوی (ئەتۆمی) نەبێت گەرد ناوكی نابێت.

٢-ئەگەر هێزی لاوازنەبێت ئەلەكترۆن نابێت.

٣-ئەگەر هێزی كهرۆموگناتیسی نەبێت گەردنابێت.

٤-ئەگەر هێزی راكێشان نەبێت ، خۆرو زەوی نەئەبوون و هەروەها ئێمەو هەموو بوونەوەران نەئەبووین...

كەوابوو ئەگەر هێزێك لەم چوارهێزە نەمێنێ یان هەڵەیەك رووبدات لەیەكێكیان دا بەڵكو لەئەلەكترۆنێك زیادوكەمدا كەبچووك ترین هەڵەیە گومانی تێدا نی یە لەماوەی چەند چركەیەكدا هەموو گەردوون كاول ئەبێت و نامێنێ.. ئەوەیە كاری پەروەردگار ئەی ئەوانەی خوانەناسن. دڵنیابن ڕێگەی خواناسین راستی یەكی تەواوە.

ئایا ئەوڕێكەوتە و ئەو سروشتی‌یە كامەیە خوانەناسان ئەڵێن گەردوون سروشتی یە و بەڕێكەوت دروست بووە؟

ئەوەتا زانست سەلماندوویەتی گەردوون پەروەردگار دروستی كردووە بەتواناو دەسەڵاتی خۆی كەكۆتایی نایەت.

گوێ بگرە لەزانای بیركاری سویسری ( تشارلز یۆجین ) هەروەكوو پەروەردگار لەقورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

 **وما أرسلْنا من قَبلك إلا رجالاً نوحي إليهم فَاسألوا أَهلَ الـ ذكْر إنْ كُنـ تم لا تعلمـ ونَ﴾ (النحل:٤٣)**

گویْ بگرن لەخاوەن زانستەکان ئەگەر خۆتان نازانن کەوابوو باگویْبگرین لەزانای بیرکاری ناوبراو (تشارلز یۆجین) ئەم زانا سویسری‌یە ئەڵێ :

هەرگیز بە ڕێکەوت گەردیلەیەك پرۆتین دروست نابێت تەنها بە ڕێژەی یەك بۆ × $١٠^{١٦٠}$ دە توان سەدو شەست ، ئەمەش ژمارەیەکە هەرگیز ناتوانین ناوی لێ بنێین لەبەر زۆریەکەی ، واتە ئەوەندە جار ڕێکەوت دروست بکەین ، ڕەنگە تەنها یەك جار گەردیلەیەك پرۆتین دروست بکەین .بەڵام پێویستمان بە هەزاران هەزار ملیار ساڵ هەیە بۆ دروست بوونی ئەم ڕێکەوتە کە ژمارەی ساڵەکان ئەم زانایە داینـاوە بە $١٠^{٢٤٣}$ دە توان دووسەدو چل و سێ ، لێرەدا کۆتایی بە ووتەکەی ئەهێنێ و باوەڕی تەواوی بە پەروەردگار هێناوە کە دروست کەری گەردوونە .

هەروەها زانای ئینگلیزی (ج–ب–لیپن) حسابی کردووە بەلایەنی زۆر زۆر کەمەوە $١٠^{٤٨}$ دە توان چل و هەشت ڕێکەوت دروست بکەین ئینجا گەردیلەیەك پرۆتین دروست ئەبێت، هەرگیز ئەقڵ ڕێ نادات ئەوەندە ڕێکەوت دروست ببن، ئەنجامەکەشیان تەنها گەردیلەیەك پرۆتین بێت، لەماوەی ملیار ملیار ساڵ دا !!!

ئەی خوانەناسان گەردی هەموو گەردوون، پرۆتینی هەموو گەردوون، بوون و بوونەوەرو تەنەکان و مادەکانی هەموو گەردوون کێ دروستی کردن ئیتر لێرەدا مەجالی ڕێکەوت نەما چوونکە زاناکان سەلماندوویانە ڕێکەوت و سروشتی کوێرانە دەوری نی یە بەڵکو ئەقڵی گەورەو دەسەڵاتی گەورەی پەروەردگارە لە دروست بوون و بەڕێوەبردنی هەموو شتێکی گەردوون دا.

کەوابوو ئادەمیزاد تاکەی بیرناکاتەوە لە کارەکانی پەروەردگار ، ئەو ئادەمیزادانەی کوێرانە شوێنی درۆی پڕوپووچی شەیتانی کەوتوون بەڵێ پەروەردگارێك کە توانای ئەوەی هەبووە هەموو گەردوون بە بوون و بوونەوەرەوە لە بناغەدا لەیەك شت دروستی کردوون ئەویش (گەردە) .کتێبی شهادە الکون ص ٦٦ .

هەروەها هاوسەنگی و هاوکێشەی بۆ هەموو گەردوون داناوە بەهۆی چوار هێزەوە هەروەکو فەرموویەتی :

﴿إنا كُل شيءٍ خلَقْناه بِقَدر﴾ (القمر:٤٩)

ئایا ئیتر خاوەن ئەقڵەکان هیچ گومانێکیان هەیە لە بوون و دەسەڵاتی پەروەردگار ئایا ئیتر بە ئەقڵ و بە دڵ پەروەردگار نابینن ؟؟

**ڕەخنەی گەوجەکان**

هەندێ لە نەزانەکان تەماشا ئەکەن لە گەردوون یان لەسەر زەوی چەند کارەسات و ڕووداوێك ئەبێت ، وا ئەزانن ئەم ڕووداوانە لە دەسەڵاتی پەروەردگاردا نی یە و دوو دڵ ئەبن هەرچەندە خۆیان بە زانا ئەزانن ئەمانە ئەڵێن :

ئەگەر پەروەردگار هەیە و ، بە بەزەییەو بە توانایە، دروست کەری هەموو گەردوونە، بەڕێوەبەری هەموو بوون و بوونەوەرە لەم گەردووونەدا بۆچی ولەبەر چی ئەو کارەساتە دڵ تەزێن و وێرانکاری یانە ڕوودەدات هەروەکوو ، بومەلەرزەو تەقینەوەی بورکان ولافاوو ڕەشەبای بەهێزو زیان بەخش ، هەزاران بەڵکو هەزاران هەزار لە گەنج و پیرو منالْ، سەرگەردان ئەبن یان ئەمرن وەیان کەم ئەندام ئەبن ؟

بێجگە لە زیانی بەروبوم و ئاژەڵ وکانزا ، وێران بوونی چەندین شار یان دێهات ، هەروەها بۆچی ئەو میکرۆبە زیان بەخشانە هەزاران نەخۆشی کوشندە بلاۆ ئەکەنەوە؟

هەروەها ئەو جەنگە گەورانە بۆچی ڕوودەدات کە ئەبێتە هۆی وێران کاری و قات وقڕی وکوشتن وبڕین وسوتاندنی تەڕو ووشك بەیەکەوە ؟هەروەها بۆچی پەروەردگار دەسەڵاتی داوە بە زۆردارەکان زوڵم لەبێ دەسەڵاتەکان ئەکەن ؟..هتد

کەوابوو ئەبوایە پەروەردگار ئەمانەی دروست نەکردایە چونکە هەموویان زیان لە مرۆڤایەتی ئەدەن ..ئەم پرسیارانەو پرسیاری زۆرتریش ئەکەن ، پێویستە وەلاٚمیان بدەینەوە :

**فەیلەسوفی ناسراو( برجسون ) ئەڵێ :**

هەموو گەردوون لە گەردێکەوە کە بەچاو نابینرێ تاکو مانگ و زەوی و خۆرو ئەستێرەکان وە گەلە ئەستێرەو کۆمەڵەی گەلە ئەستێرەو کۆزاراکان و ئەشکەوتە ڕەشەکان وسەدیمەکان وە ئەشکەوتە سپی یەکان هەموویان وەك یەك لەش وان، یەك گیانیان هەیەو هەموو بەشەکانی بەیەکەوە بەستووە، بەیەك ئەگەن ویارمەتی یەکتر ئەدەن کە لە دەروونماندا زانینێك دروست ئەکەن، ئەزانین دروست کەری ئەم گەردوونە پەروەردگارە (کتێبی رۆیە علمیە للایمان-ص٦٤)

هەروەها ئێمە تاکو ئەمڕۆ نازانین چۆن تەماشای ڕاستی شتەکان بکەین ، هەروەها نازانین بە زیندوویی تەماشایان بکەین.

چوونکە ئێمە ڕاستی بەش بەش ئەکەین تاکوو بیبینین!!!.

واتە: ئەقڵمان وێنەی گەردوون بەش بەش ئەبینێ بەبێ ئەوەی پەیوەندی گەردوون وسووڕانەوەکەی پێ بزانێ!!.

ڕاستی بەتەماشاکردنێکی فراوان دەرئەکەوێ تاکوو بەتەواوی بیزانین.

ئەمە هەروەکوو فلیمێك، ئەگەر بەش بەش تەماشای بکەین لەکاتێکدا بێ دەنگ وەستاو بێت وێنەکان ئەبینین ناجووڵێنەوە ژیان پیشان نادەن بەڵام ئەگەر جووڵانەوە کەوتە وێنەکان هەموویان، ئەبینین ڕاستی ژیان لەکۆمەڵێ لەوێنەکان دەرئەکەوێ ئەو کاتە مانای چیرۆکی فلیمەکە تێ ئەگەین.

**هەروەها هێنری بوانکاریە پرسیار ئەکات:**

ئایا مافی ئەوەمان هەیە باسی هۆی ڕووداوێك لەڕووداوەکانی گەردوون بکەین کە هەموو بەشێك لە بەشەکانی بەستراون بەیەکەوە بەستنێکی یارمەتی دان، هەر ڕووداوێك لەڕووداوەکان ئەنجامی تاقە هۆیەك نیە، بەڵکو ئەنجامی ژمارەیەك زۆر زۆر هۆیە. هەر ڕووداوێك هەر چۆنێك بێت ئەنجامی حاڵی گەردوون هەموویەتی لەچرکەیەك دا کەڕابوردووە.

بەم جۆرە ئەگەر تەنها تەماشای ڕووداوە دڵ تەزێن وزیان بەخشەکانی گەردوون بکەین، هەروەکوو تەماشای وێنە وەستاوەکان بکەین لەفلیمەکەدا وایە.

لەوانەیە ئەو بەشە سزادانێك بێت بەشەكانی تری لەپێشەوە یان دواتر دێن كەئێستا نایان بینین!!!. تاكوو بزانین ئەو سزادانە ڕەوایە یان نا؟.

كەوابوو شتێكی باشە، ئەگەر ناڕەوایە، لەوانەیە دواتر تۆڵەی هەبێت وبەجوولاندنی هەموو وێنەكان ئینجا بۆمان دەرئەكەوێ.

پەروەردگار گەردوونی دروست كردووە، هەموو شتێكی چاكی دروست كردووە بۆ ئادەمیزاد.

هەروەها ئەو شتانەی ئێمە بەخراپیان ئەزانین، ئێمە تەماشای هەموو گەردوونمان بۆ ناكرێ لەوكاتەوە دروست كراوە لەلایەن پەروەردگارەوە تاكوو ئێستاو تاكوو كۆتایی هاتنی..... لەبەر ئەوە ڕووداوەكان بەش بەش ئەبینین وسەرەتاو كۆتاییان نازانین، بەڵام پەروەردگار خۆی چاك ئەزانێ لەڕابردوو ئێستاو پاشە ڕۆژوو لەهەموو نهێنیەكانی گەردوون وئادەمیزادو ژیان. بەم جۆرە ئەبینین تەماشاكردنی پەروەردگار بۆ دروست كراوەكانی خۆی تەماشاكردنێكی سەرتاسەریو درێژخایەنە.

پەروەردگار هەموو شتەكان ئەزانێ چوونكە هەموو گەردوون ئەبینێو ئەزانێ بەهەموو نهێنیەكانی...بەڵام ئادەمیزاد بەش بەش ڕووداوەكان ودروست كراوەكان ئەبینێ لەبەر ئەوە لەزوربەیان تێ ناگا و نازانێ.

هەرچەندە ئادەمیزاد هەموو بەشەكانی گەردوون تێ ناگا و لەهەموو كارەسات ودروست كراوەكان وڕووداوەكان نازانێ بەڵام هەندێكیان بەئاسانی بەئەقڵ لێ یان تێ ئەگا، بۆ نموونە:

ئەگەر لەشوێنێكی سەر زەمین دا كوفرو فەساد و إلحاد بڵاوبوویەوە دیارە ئەو شوێنە تووشی كارەساتی ناهەموار و خراپ ئەبێت.

ئەگەر پەروەردگار مێرووە زیان بەخشەكانی دروست نەكردایە چۆن زۆربەی نەخۆشی یەكانی ئادەمیزاد چارەسەر ئەكران بەئاوی ناو لەشی ئەوان هەروەكو و ژاری مار چەندەها دەرمانی لێ دروست ئەكرێ سوود بەخشە بۆ مرۆڤایەتی..

ئەگەر ئەو مەل ومێروولانە نەبن، چۆن گەردی ڕووەكە نێرەكان ئەگوێزرێتەوە بۆ ڕووەكە مێ یەكان وكرداری جووت بوونیان (یان پیتاندن) دروست ئەبێ و بەر ئەگرن.

هەروەها مێروویەکی وەکوو هەنگ ئەزانن چی دروست ئەکات وبۆچی باشەو زانست سەرگەردانە لە ئیش وکاری ئەم مێرووە بچووکە چەند بەتوانایە، چەن زیرەکە، چەند سوود بەخشە، لەگەڵ ئەوەشدا چزووی هەیە بۆ پێوەدان بەکاری ئەهێنێ لەکاتی خۆی دا!!!!.

تەنها پەروەردگار خۆی ئەزانێ بوومەلەرزەو لافاوو بورکان وڕەشەبای بۆچی دروست کردووە... زۆربەی نەوەکانی سەرزەمین لەزۆر کۆنەوە..وەکوو نەوەی عادو ثمود و لوط و هود و نوح .. هتد.

پەروەردگار بەتووڕەیی یەوە بەبوومە لەرزە یان لافاو یان ڕەشەباو بەرد باران لەناوی بردوون. واتە ئەوانیش پێویستن.

لێرەدا باسی زەوی و ئاسمانە گازی یەکانی کۆتایی پێ ئەهێنین بەکورتی باسمان کردن.

ئێستا پێویستە باسی خۆرو ئەستێرە گەڕۆکەکانی بکەین هەریەکە بەجیا تاکوو گەورەیی و دەسەڵاتی پەروەردگار بزانین وهەروەها لەوانیشەوە بەرەو ڕێگەی کاکێشان وپاشان سەدیمەکان وئەشکەوتە ڕەشەکان وکۆزاراکان وئەشکەوتە سپی یەکان بڕۆین ویەکەیەکە باسیان بکەین....

## (( کۆمەڵەی خۆر ))

پێش ئەوەی باسی ئاسمان وبۆشایی ئاسمانەکانی سەرەوە بکەین ( السّماوات ألعُلی) هەروەها پێش ئەوەی باسی گەلە ئەستێرەی کاکێشان وئەستێرە دوورەکان و سەدیمەکان وکۆزاراکان وئەشکەوتە ڕەشەکان و ئەشکەوتە سپی یەکان بکەین پێویستە دوای باس کردنی زەوی باسی خۆرو کۆمەڵەکەی بکەین کە زەوی یەکێك بوو لەو کۆمەڵەیەی باسمان کرد.

## - خۆر-

نـزیكترین ئەسـتێرەیە لـە زەوی یـەوە، تـەنها ١٥٠ سـەدو پـەنجا ملیـۆن كیلۆمـەتر دووره لە زەوی یـەوە، ئەم ماوەیـە زاناكان پـێ ی ئـەڵێن: ((یەكەی گـەردوونی)) واتـە هەموو دووری یەك لەبۆشایی ئاسمانەكان دا ١٥٠سەدو پەنجا ملیۆن كیلۆمەتر بوو ئەوە یەكەیەكی گەردوونیە ئەگەر دووری‌یەك ٣٠٠ ملیۆن كیلۆ مەتر بوو ئەوە دوو یەكـەی گەردوونیــە...هــەروەها....كــەوابوو خــۆر تــەنها یەكەیــەكی گــەردوونی لەزەوی‌یەوە دووره:!! .

تیرەی خۆر (١٠٩) سـەدو نۆجار لـەتیرەی زەوی گەورەترە، تـیرەی زەوی (٧٩٠٠) حەوت هەزارو نۆسەد میلە.

## قەبارەی خۆر:

خۆر یەك ملیۆن و دووسەدو پەنجا هەزار جار (١/٢٥٠/٠٠٠) لە زەوی گەورەترە !!!.

**كێشی خۆر:**

(٣٣٠) سێ سەدو سی هـەزار جار لە زەوی قورس ترە، بەلاّم چڕی خـۆر ٤/١ی چڕی زەوی یە.

گازی هیدرۆجین وهیلیۆم ٩٦-٩٩٪ بارستایی خۆر پێك ئەهێنن بەشەكەی تری لەڕەگەزەكانی ترە.

٨٠٪ ی كێشی خۆر هیدرۆجینـە، هەموو ڕەگـەزەكانی زەوی لـەخۆردا هـەن، بـەلاّم بەشێوەی گاز.

بۆیـە پـەروەدگار لـەقورئانی پـیرۆزا فەرموویـەتی مـانگ وخـۆرو ئەسـتێرەكانیان پارچـەیەك بـوو تەقاندمانـەوە كۆمەڵـەی خـۆر دروسـت بـوو.هـەروەها زاناكـان ئـەڵێن كۆمەڵەی خۆر یەك ئەستێرەی گەورەبووە تەقیوەتـەوە ئـەم مـانگ وئەسـتێرەو خـۆرو زەوی یە یان لێ دروست بووە !!!.

چڕی گازەكان لەخۆردا یەكسان نی یە، تاكوو بەرەو ناوەندی بڕۆین ئەم چڕی‌یە زۆر ئەبێت وتاكوو بۆ دەرەوەی خۆر بڕۆین ئەم چڕی یە كـەم ئەكات...گازەكانی خـۆر لەچڕیە زۆرەكان دا لـەناو قـورس تـرن بەپێچەوانەی زەوی‌یـەوە ناو لەهـەموو گازەكان

قورس تره. پاڵە پەستۆ لە ناوەندی خۆردا ئەگاتە، یەك ملیۆن تەن، لەسەر یەك (سنتیمتر).

## ((دڵی خۆر یان ناوەندی خۆر))

ئەم شوێنە سەرچاوەی ووزەیەو ناوەڕاستی خۆرەو بریتی یە لە جووڵانەوەی گەرمایی نەوەوی گەورەو هەمیشە جووڵاوەیەو ئەوەی لەم شوێنەدا ڕوو ئەدات، چوار گەرد هیدرۆجین یەك ئەگرێ‌و لەئەنجام دا گەردێك هیلیۆم دروست ئەبێت، لێرەدا هیدرۆجین سووتەمەنیەو هیلیۆم خۆڵەمێشە پلەی گەرمای ناوەڕاستی خۆر (٢٠/٠٠٠/٠٠٠°م) بیست ملیۆن پلەی سەدی یە بەڵام لەسەر ڕووی خۆر پلەی گەرما ٦/٠٠٠°م شەش هەزار پلەی سەدی یە. ئەم خۆرە لەناوەوەی دا لەهەموو چرکەیەکدا هەزاران بۆمبی هیدرۆجین ئەتەقێتەوە، لەگەڵ ئەوەشا یەك بۆمبی هیدرۆجین بەهێز ترە لە دوو هەزار بۆمبی گەردی (القنبلە الذریة) لەوانەی کە هەردوو شاری (هیرۆشیماو ناکازاکی ) یان پێ وێران کردن لە جەنگی جیهانی دووەمدا .

## هەوای خۆر

خۆر وەکو گۆیەکی خڕی گڕدارە ، هەوای لە سێ چین پێك هاتووە :

١- **چینی الفوتوسفیر** : ئەمە ڕووی خۆرەو چینی ڕووناکە ، هەندێ پەڵەی تاریکی تێدایە کە بریتین لە هەڵچوونی ئاگری زۆر بەتین کە لە خۆرەوە هەڵ ئەقوڵێن وەکو بورکان بەرز ئەبنەوە نزیکەی یەك ملیۆن کیلۆمەترو لە شێوەی کەوانەدان .

**بڕوانە وێنەی ژمارە ( ٧ )**

٢- **چینی کرۆمۆسفیر** : واتە چینی ڕەنگەکان .ئەم چینە ڕاستەوخۆ لەسەر ڕووی خۆرە، ڕەنگەکان لێرەدا دروست ئەبن .

٣- **چینی تەوقە گوڵ** : ئەمە چینی دەرەوەی خۆرە، چەندەها ملیۆن کیلۆمەتر بەدەوری خۆردا بڵاوبوەتەوە .

**بڕی ئەو ووزەیەی کە خۆر ئەیدات لە چرکەیەکدا**

لە هەموو چرکەیەکدا خۆر زیاتر لە چوار ملیۆن تەن لە مادەی خۆی کەم ئەکات ، واتە ئەوەندە ووزە ئەدات لە گەرماو ڕووناکی و تیشك ، ئەم کردارە لە خۆردا نزیکەی ۱۰۰۰,۰۰۰,۰۰۰ هەزار ملیۆن ساڵە بەردەوامە .لەگەڵ ئەوەشا هێشتا خۆر بەهێزەو لە تەمەنی لاویدایە لە چاو خۆرەکانی ئاسمانەکانی تردا– تەمەنی ئەم خۆرە نزیکەی ۵۰۰۰,۰۰۰,۰۰۰ پێنج هەزار ملیۆن ساڵە دروست بووە ، زاناکان ئەڵێن خۆر بەم جۆرەی ئێستای ئەمێنێتەوە تاکوو ۵۰,۰۰۰,۰۰۰,۰۰۰ پەنجا هەزار ملیۆن ساڵی تر بەش ئەکات ئەگەر بمانەوێ گەرمای خۆر بە ڕاستی بزانین تەماشای ئەم نموونەیە بکە :

قاڵبێك سەهۆڵ پانیەکەی ۳۰۰۰ سێ هەزار مەترو ئەستوورایی ۱۵۰۰ مەتر بێت، درێژیەکەی ۱۵۰,۰۰۰,۰۰۰ سەدو پەنجا ملیۆن کیلۆمەتر بێت ، ئەم قاڵبە زۆر گەورەیە بخەینە ناو خۆرەوە لە ماوەی یەك چرکەدا ئەبێت بە هەڵم !!! ماشاء الله لە دروست کراوی پەروەردگار ئەبێ ئەوەش بزانین ئەم خۆرەی ئێمە لەچاو خۆرەکانی تری ئاسمانەکان ووزەی زۆر کارناکات، دەستی پێوە ئەگرێ ، یەك کیلۆ ووزەی ئەم خۆرەمان هێزی بەقەدەر ۲۲,۰۰۰,۰۰۰,۰۰۰ بیست و دوو هەزار ملیۆن تەن T.N.T ئەبێت ، یان ئەم کیلۆ ووزەیە لە ئۆتۆمبیلێك دا بەکاری بێنین ٤۰۰,۰۰۰ چوارسەد هەزار جار بەدەوری گۆی زەوی دا ئەسووڕێتەوە کە ١٦ ملیۆن کیلۆمەترە ، ئەگەر بە خێرایی ۱۰۰ کیلۆمەتر بڕوات لە سەعاتێکدا ماوەی ١٦,۰۰۰ شانزە هەزار ساڵ ئەسووڕێتەوە بەبێ وەستان ...

سوپاس بۆ پەروەردگار، کە بۆ بەردەوامی ژیانی ئادەمیزاد لەسەر زەوی ئەم خۆرەی دروست کرد ..

## فراوانی کۆمەڵەی خۆر

تیرەی کۆمەڵـەی خـۆر ١٢,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠ دوانـزە هـەزار ملیـۆن کیلۆمـەترە کـە ١١ یانزە سەعاتی رووناکی ئـەکات تیـشکی خـۆر بـە ٨ هەشـت خولـەك ئەگاتـە سـەر زەوی واتە ١٥٠ ملیۆن کیلۆمەتر ئەبڕێ بە هەشت دەقیقە.



وێنەی ژمارە (٧) خۆرو ئاگرە کەوانەییەکان

## خێرایی ڕووناکی

زاناکان ئەڵێن ڕووناکی لە هەموو شتێ خێراترە، لە چرکەیەکدا خێراییەکەی ۳۰۰,۰۰۰سێ سەد هەزار کیلۆمەترە هەرچەندە هەندێ لە زاناکان ئەڵێن گەردیلەی تر لە گەردوون دا هەن لە ڕووناکی خێراترن، هەندێکیان ئەڵێن گازی ئەثیر لە ڕووناکی خێراترە ، هەندێ زانایانی تریش ئەڵێن گەردیلەی کۆزاراکان لە ڕووناکی خێراترە ئەمەش بەهۆی ئەو شەپۆلە ڕادیۆ یانەوە پێوانەیان کردووە کە لە ڕووناکی خێراترن، لێرەدا کۆتایی بە باسی خۆر ئەهێنین، باسی ئەندامێکی تری کۆمەڵەی خۆر ئەکەین ئەویش (مانگە) .

## مانگ

زەوی تەنها ئەم مانگەی هەیە ، بەدەوری‌دا ئەسوڕێتەوە ، هەرچەندە هەندێ لە زاناکان ئەڵێن زەوی سێ مانگی هەبووە بە دەوریدا سووڕاونەتەوە بەڵام دوانیان تیاچوون ، لە زۆر مێژەوە ئادەمیزاد بە چاو تەماشای مانگی ئەکرد پاشان بەهۆی تەلەسکۆبە سادەکانەوە دواتریش بەهۆی تەلەسکۆبی پێشکەوتووەوە دوای ئەمانە مرۆڤ کەشتی ئاسمانی بەکارهێنا بۆ دۆزینەوەی نهێنی یەکانی مانگ.

نهێنی یەکانی مانگ: مانگ لەهەموو ئەستێرەکانی تری کۆمەڵەی خۆرو هەموو ئاسمانەکان نزیك ترە لە زەوی یەوە .لە ساڵی ۱۹٦۹ کەشتی ئاسمانی ئەپۆلۆ چووە سەر مانگ، بۆ یەکەم جار یەکەم ئادەمیزاد دابەزی لەسەر ڕووی مانگ .

چیرۆکی چوونە سەر مانگ و دابەزینی یەکەم ئادەمیزاد لەسەر ڕووی مانگ ٤۰۰,۰۰۰ چوارسەد هەزار کیلۆمەتر لە زەوی یەوە دوورە ئەم ماوەیە کەشتی ئاسمانی ئەپۆلۆ (۱۱) لەماوەی ۷٦ حەفتاو شەش کات ژمێردا واتە لەماوەی ۳ سێ شەوو ڕۆژ و چوار سەعات دا بڕی، توانی لەسەر زەوی یەوە بگاتە سەر مانگ .

زیاتر لە ۲۰,۰۰۰ بیست هەزار کارگەی زانستی بەشداریان کردووە لە دروست کردنی ئەپۆلۆی (۱۱) دا ، هەروەها ۳۰۰,۰۰۰ سێ سەد هەزار مرۆڤ لە زاناو

ئەنـدازیارو کرێکـار و هونەرمەنـد بەشـداریان کـردووە . ٢٥,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠ بیـست وپێنج هەزار ملیۆن دۆلاری تێ چووە لە ساڵی ١٩٦٩ دا .

درێـژی ئـەپۆلۆ: ١١١سـەد و یـانزە مـەتربوو ، کێـشی ٣٣٩٣ تـەن بـوو پێـنج فرۆکـەی بـەهێز ئـەم کەشـتی یـە ئاسمـانی یـەیان خـستە بۆشـایی ئاسمانـەوە کـە لـە پلـەی یەکـەمی دەرچـوونی کەشـتی یەکـە (٢٠٠٠) دوو هـەزار تـەن سـووتەمەنی بـەکارهێنرا دوو دەقیقـە و نیـوی خایانـد ، بـەم جـۆرە یەکـەم ئـادەمیزاد لەسـەر ڕووی مانگ دابەزی، لە ئەنجام دا دەرکـەوت ژیان لەسـەر مانگ نی یە چوونکە ئاووهـەوای تێدا نـی یـە ،بەشـەو زۆر سـاردە پلـەی گـەرما ١٧٠ پلەیـە لـەژێر سـفری سـەدی یـەوە لەبەرئەوە ژیان لەسەر مانگ نی یە!!!

بڕوانە وێنەی ژمارە ٨ کاتێ بۆ یەکەم جار ئادەمیزاد چووە سەر مانگ .

بڕوانە کتێبی (رحلة فی الفضاء) عزالدین بلیق /چاپی یەکەم ١٩٨٤ بیروت

لێرەدا کۆتایی بەباسی مانگ ئـەهێنین، باسـی چوارەمین ئەندامی کۆمەڵـەی خـۆر ئەکەین، تاکو لە دروست کراوەکانی پـەروەردگار شـتێك بزانین و گـەورەیی ودەسـەلاَتی باشتر ڕوون بێتەوە بۆمان بۆ خواناسان وخوانەناسان .



وێنەی ژمارە ( ٨ ) بۆ یەکەم جار ئادەمیزاد ڕۆیشتە سەر مانگ

## ٤-ئەستێرەی عطارد

ئـەم ئەسـتێرەیە نـزیکترین ئەسـتێرەی گەڕۆکـە لـە خـۆرەوە هـەروەها بـچووکترین ئەندامی کۆمەڵەی خۆرە لە قەبارەو لە بارستایی دا بارودۆخی هەروەکو مانگ وایە، بۆ ژیان دەست نادات تەنها ئەوەندەیان جیاوازە ئەم بەرگەبایەکی تەنکی هەیە زۆربـەی لـە گازی هیلیۆم پێك هاتووە لەگەڵ هەندێ گازی تر وەکو هیدرۆجین و نیۆن ، ڕووی ئـەم ئەستێرەیە لە ئاسـندا دەوڵەمەنـدە عطـارد لـە زەوی یـەوە (٥٧) پـەنجاو حـەوت ملیـۆن کیلۆمەتر دوورە ماوەی سـووڕانەوەی بـەدەوری خـۆردا ٨٨ هەشتاوهەشـت ڕۆژە واتـە ساڵێکی هەشتاوهەشت رۆژە.

پلـەی گـەرما جیاوازیـەکی زۆری هەیـە لـە نێـوان شـەوو ڕۆژی دا لـە ڕۆژدا ٤٣٠ مْ چوارسـەدو سـی پلـەی سـەدی‌یە، بەشـەودا ١٧٠ مْ سـەدو حـەفتا پلـەی سـەدی لـە ژێـر سفرەوەیە .

تیـشکە کوشـندەکان هەنـدێکیان ئەکەونـە سـەر ئـەم ئەسـتێرەیە وەکـو تیـشکی گەردوونی و تیشکی سەرو وەنەوشەیی ، لەبەر ئەوە ژیان مەحاڵە لەسەری ...

## ٥-ئەستێرەی زوهرە

ئەم ئەسـتێرەیە پێنجـەمین ئەنـدامی کۆمەڵـەی خـۆرە ، ئەسـتێرەیەکی زۆر جـوان و ڕۆشـنە وە ئەدرەوشـێتەوە پێـی ئـەڵێن ئەسـتێرەی بـەیان و ئەسـتێرەی ئێـوارە !! ئـەم ئەستێرەیە پێچەوانەی ئەستێرەکانی ترە لە سووڕانەوەیدا ، واتە : لە ڕۆژهەڵاتـەوە بـۆ ڕۆژئاوا ئەسوڕێتەوە .

هەنـدێ لـە کەشـتی‌یە ئاسمانیـەکانی روسـیاو ئەمـەریکا بـەرەو ئـەم ئەسـتێرەیە ڕۆیشتوون، زانیاری زۆریان لە بارەیەوە زانیوە لە ساڵی ١٩٦١ ز کەشـتی‌یەکی روسـی بە هێمنی لەسـەر ئـەم ئەسـتێرەیە نیشتەوە ...چـەند وێنەیـەکی شاخ و داخـی گـرت ، پلەی گەرمای پێواو هەروەها پلەی پاڵەپەستۆی ڕووەکەی .

لەساڵی ١٩٦٢ کەشتی ئاسمانی ئەمەریکی (مارینر) هەنـدێ زانیـاری نـاردەوە سـەر زەوی دەربارەی ئەم ئەسـتێرەیە، دەری خـست ئـەم ئەسـتێرەیە بـە دەوری‌دا هـەورێکی زۆر چـڕ هەیـە ، لەبـەر ئـەوە نـازانرێ ڕۆژی چـەندە ، ئـەم هـەورە ٦٠٪ تیـشکی خـۆر

پێچەوانە ئەکاتـەوە ، لەبـەر ئەوەیـە ئـەم ئەسـتێرەیە ئەدرەوشـێتەوەو جوانـە ، ئـەم ئەستێرەیە کەمێك لە زەوی بچووکترە .

پلـەی گـەرمای ڕووبەرەکـەی (٥٠٠) پێـنج سـەد پلـەی سـەدی‌یە ، ١٠٠ سـەد جـار پاڵەپەسـتۆی هـەوای لـە پاڵەپەسـتۆی هـەوای زەوی بـەهێزترە بەرگەبایـەکی ئەسـتووری هەیە ٩٧٪ ی بریتی‌یە لە دووەم ئۆکسیدی کاربۆن و کەمێك لە ئۆکسجین و نـیترۆجین و هـەڵمی ئـاو ، بـەلاّم ئـاوی تێـدا نـی یـە لەبـەر ئـەوە ژیـانی لەسـەر نـی یـە و نابێـت ، هەرچەندە هەندێ لە زاناکان ئەڵێن ئەگەر بەرگە باکەی بگۆڕین بۆ ژیان دەست ئـەدات ، ئەمەش بە بردنی هەندێ ڕەگەزی کیمیاوی سەر زەوی بۆ بلاّوکردنـەوەیان لەبەرگـەبای ئـەم ئەسـتێرەیەداو نزیکـەی ١٠٠٠ هـەزار سـاڵ ئەخایـەنێ ، ئـەوەیان لـەبیر چـووە بەرگەبای زەوی لە چینی ئۆزۆن کونێکی تێ بووە بۆیان ناگیرێ و چارەسەر ناکرێ !!!

## ٦ -ئەستێرەی مەریخ

زۆر دەمێکە زانایان ڕایان وابوو ئەم ئەستێرەیە ژیانی لەسەرە !!!

ئەمـەش بـەهۆی تەلەسکۆبەکانیانەوە تەماشـایان ئەکردو رایـان وابـوو کشت وکاڵی تێداکراوەو جۆگەی ئاودێری زۆری تێدایە!!.

پاشـان بـەهۆی کەشـتی یـە ئاسمانیەکانـەوە دەرکـەوت ئـەو ڕەنـگ و هێڵانـەی لەسەریەتی سێبەری رەشەبای خۆڵاوین و ژیانیش لەسەر ئەم ئەستێرەیە نیە.

پلـەی گـەرما لەسـەر رووبەرەکـەی ٢٧-١٤٠م° پلـەی سـەدی یـە لـەژێر سـفرەوە، هـەروەها بەرزترین پلەی گەرمای ١٠ - ١٥م ە پلـەی سەدی‌یە بـەفری لەسـەرەوەئەبێت بەهەڵم بێ ئەوەی ببێت بەئاو!!.

بەرگەبایەکی تەنکی هەیە ئەستووری یەکەی ١/٥ی بەرگەبای زەوی یە.

واتە بەرگەبای زەوی پێنج ئەوەندەی بەرگەبای مەریخ ئەستورترە !!.

زۆربەی بەرگەبای ئەم ئەستێرەیە بریتی‌یـە لـەگازی دووەم ئۆکسـیدی کـاربۆن $CO2$ وکەمێك لەهەڵمی ئاو $H2O$ هەروەها یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن $CO$ و هیـدرۆجین $H_2$ و نیترۆجین $N_2$ و ئۆکسجین $O_2$ بەڕێژەی هەزاران جار لەزەوی زیاتر.

لەساڵی ١٩٦٠ تاکوو ساڵی ١٩٧٦لەماوەی ئەم شانزەساڵەدا ٢٤بیست و چوار کەشتی ئاسمانی رەوانەی ئەم ئەستێرەیەکراوە ، شانزەیان لەلایەن روسیاوەو هەشتیان لەلایەن ئەمەریکاوە بەلاّم تەنها شەشیان سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە لەساڵی ١٩٧١دووکەشتی رووسی مارس[٢] – مارس[٣] بەهێمنی لەسەر ئەم ئەستێرەیە نیشتنەوە، هەروەها لەساڵی ١٩٧٥ ئەمەریکا دووکەشتی ئاسمانی نارد (ڤایکنگ ١) و(ڤایکنگ ٢)لەساڵی ١٩٧٧دوای دووساڵ لەسەرئەم ئەستێرەیە نیشتنەوە، زۆربەسەرکەوتووانە توانیان هەندێ گڵ و بەردی ئەم ئەستێرەیە لەناو تاقیگەکانی خۆیان دا شیبکەنەوەو نزیکەی ١٠٠٠هەزار وێنەی جۆراوجۆرو لەشوێنی جۆراوجۆری ئەم ئەستێرەیان گرت و هەندێ تاقیکردنەوەی زانستی یانەیان کرد گرنگترینیان ٣ سێ تاقی کردنەوەبوون بۆئەوەی بزانن ئەم ئەستێرەیە ژیانی تێدایە یان بۆژیان دەست ئەدات:

**بڕوانە وێنەی ژمارە (٩ ) کەشتی ئاسمانی فایکنگ (٢ ) لەسەر مەریخ.**

١–تاقی کردنەوەی گۆڕینەوەی گازی بۆئەوەی بزانن کرداری هەناسەدان پێك دێت لەسەر ئەم ئەستێرەیە یان نا؟

٢–تاقی کردنەوەی کرداری رۆشنەپێك هاتن بۆئەوەی بزانن رووەك لەسەر ئەم ئەستێرەیە ئەژی یان نا؟

٣–تاقی کردنەوەی رزگاربوونی گازی لەخۆڵی پالاٌوتەو نەپاڵێوراو.

ئەنجام دەرکەوت بۆژیان دەست نادات.

بەلاّم هەندێ کەشتی تری ئاسمانی (مارینر ٩،٦،٥،٤) وێنەی باشتریان گرتووەو دەریان خستووە ژیانی تێدا نی یە و بۆژیانیش دەست نادات.

## ٧–ئەستێرەی مشتەری:

ئەگەر بمانەوێ لەئەستێرەی مەریخەوە بڕۆین بۆئەستێرەی مشتەری ڕێگەمان چۆڵ نی یە ، تاکوو ئێستا هاتووین ڕێگەمان چۆڵ بووە بەلاّم لێرەوە لەئەستێرەی مەریخەوە بۆ مشتەری هەندێ ئەستێرەی بچووك دێنەڕێگامان کەلەبۆشایی ئاسمانی نێوان

خولگەی ئەم دووئەستێرەیەدا بلاوبوونەتەوە، کەبریتین لەچەند تەنێکی گەردوونی لەقەبارەو شێوەدا جیاوازن و جۆراوجۆرن، هەندێکیان وەکوو چەوولم بچووکن هەندێکیشیان گەورەن و تیرەکەیان هەزار کم ئەبێت و گەورەترینیان (سیرس)ی پێئەڵێن

مشتەری یەکێکە لەو ئەستێرە گەڕۆکە گەورانە، هەورێکی تاریك ئەگەڕێ بەسەر رووەکەی دا ئەستووری ئەم هەورە ١٦,٠٠٠شانزەهەزار مەترە پێ ی دەوترێ بەرگەبای مشتەری، دوای ئەم بەرگەبایە چینێك سەهۆڵ رووبەری مشتەری داپۆشیوە، ١٦,٠٠٠شانزە هەزار کیلۆمەتر ئەستوورە.

ئەم ئەستێرەیە زۆر ساردە و پاڵەپەستۆی زۆر بەهێزەو پلەی گەرمی ١٤٠° سەدوچل پلەی سەدی‌یە لەژێر سفرەوە، چەند گازێکی تێدایە لەوانە گازی هیدرۆجین ٧٨٪بارستایی مشتەری‌یە هەروەها گازی هیلیۆم و کەمێك میپان و ئامۆنیا.

ئەم ئەستێرەیە زانیاری زۆری لێزانراوە، بەهۆی دووکەشتی ئاسمانیەوە (فویجر ١و فویجر ٢).

هیدرۆجینی ئەم ئەستێرەیە ساردە بەپێچەوانەی هیدرۆجینی خۆرەوە.

هەروەها ئەم ئەستێرەیە گەورەترین شتی سەرسوڕهێنەری لەسەرە تاکوو ئێستازاناکان بەو هەموو زانست و تاقی کردنەوەو ئامێرەنوێ یانەوە لەبەردەستیان دایە نازانن چی یە.

ئەویش پەڵەیەکی پرتەقاڵی مەیلەو سوورە، وێنەی هێلکەیی‌یە ئەکەوێتە سەرڕووی هێڵی ئیستیوای مشتەری یەوە : **بڕوانە وێنەی ژمارە (١٠)**

بۆچوونی زاناکان لەبارەی ئەم پەڵەیەوە ئەوەیە تەنێکی رەقەو هەروەك دوورگەیەك وایە ئەخولێتەوە لەناو هەورە تاریکەکەی مشتەری‌دا ئەم تەنە هێلکەیی و درێژی ٤٨,٠٠٠ چلوهەشت هەزار کیلۆمەترەو پانیەکەی ٢٤,٠٠٠بیست و چوارهەزار کیلۆمەترە.

هەندێ جاریش رەنگەکەی ئەگۆڕێ، بەلام تاکوو ئێستاش زانیاری تەواو دەربارەی ئەم دوورگە پرتەقاڵی یەوە نی یە.

**لەساڵی ١٩٧٢ئەمەریکا کەشتی ئاسمانی (بایونیر ١٠) نارد بۆ مشتەری لەگەڵ نامەیەکی زانستیدا بۆ دانیشتوانی گەردوون لەسەر هەرئەستێرەیەك هەبن. لەسەر پارچە کانزایەك نووسراوەتەوە ئەمەش دەقی نامەکەیە:**

**(لەئادەمیزادی سەرزەوی یەوە بۆ بوونەوەرە ئاقڵەکان لەهەر ئەستێرەیەك یان هەرشوێنێکی گەردووناهەن)**

**هێڵکاری یەکی گەردی هیدرۆجین کەتیشك ئەداتەوە لەسەر درێژی شەپۆلی ٢١ سنتیمەتر، ئەمەش باشترین هۆی گەیاندنە تاکوو ئێستا، چونکە هیرۆجین زۆرەو لەزۆربەی ئەستێرەکان دا هەیە**

**هێڵکاریەکی قەبارەی سروشتی نێرومێ بەگوێرەی قەبارەی ئادەمیزاد بۆکەشتی یەکە.**

**نێرە کەواتە پیاوەکە، دەستی راستی بەرزکردوەتەوە سەلامی برایەتی دانیشتوانی زەوی ئەگەیەنێ بەدانیشتوانی گەردوون لەهەرکوێ هەن و ئەم کەشتی یە ئەگاتەلایان**

**هێلکاریەکی کۆمەڵەی خۆرو ئەستێرە گەڕۆکەکان و سووڕانەوەیان بەدەوری خۆرداو دیاری کردنی شوێنی زەوی لەناو ئەم کۆمەڵەیەدا**

**١٤چواردەهێڵی لەسەرە، کاتی دەست پێ کردنی رۆیشتنی کەشتی یەکە لەزەوی یەوە بەرەو ئاسمان دیاری ئەکات.**

**هەروەها لەساڵی ١٩٧٧ دووکەشتی ئاسمانی (فویجر١ ، فویجر ٢ ) رەوانەی مشتەری کران (فویجر ٢ یەکەم کەشتی ئاسمانیە کۆمەڵەی خۆر بەجێ ئەهێڵێ و ئەچێتە ناوەندی گەردوونەوە.)**

**لەسەر هەریەکێکیان لوولەیەکی مسی رووکێش کراوی ئاڵتون هەیە کەهەردووزانای بەناوبانگ (ساغن و دیراك) دایان ناوەو چەند دەنگێکیان لەسەر تۆمارکردووە، سەلامی دانیشتوانی زەوی بەزۆربەی زمانە جیاوازەکانی جیهان بۆ دانیشتوانی گەردوون ناردوە.**

چەند دەنگێکی جۆراوجۆر وەکوو دەنگی ئۆتۆمبیل و شەمەندەفەرو فڕۆکەو گریانی منداڵ و هەورە بروسکەیان لەسەر تۆمارکردووە.

چەند دەنگێکی مۆسیقای جیهانی وەکوو مۆسیقای بتهۆڤن و باخ و هەندێ مۆسیقای وولاتانی تریان لەسەر تۆمارکردووە.

کەشتی فویجر دوو سووتەمەنی زۆرەو لەڕاکێشانی کۆمەڵەی خۆردەرچووە بەرەو ڕێگای کاکێشان و شوێنە دوورەکانی تری گەردوون ئەڕوات.

ئەستێرەی مشتەری هەروەکوو زەوی یەك مانگی هەیە پێ ی ئەڵێن (ئایۆ) مشتەری گەورەترین ئەستێرەی کۆمەڵەی خۆرەو لەهەموویان خێراتر ئەسووڕێتەوە!!!



وێنەی ژمارە ( ٩ ) کەشتی ئاسمانی (فایکنگ ) لەسەر ئەستێرەی مەریخ



ویّنەی ژمارە ( ١٠ ) ئەستێرەی مشتەری

## ٨ –ئەستێرەی زوحەل

دووەمین ئەستێرەی گەورەیە لەکۆمەڵەی خۆردا دوای ئەستێرەی مشتەری کەشی وەکوو کەشی مشتەری یە.

قەبارەی ١,٣٠٠ هەزاروو سێ سەدجار لەزەوی گەورەترە، بەڵام کێشی بەدوای کێشی مشتەریدادێت.

ئەم ئەستێرەیە بەناوبانگە بەئەڵقە جوانەکانیەوە بەدەوریدا کەسەرئاو ئەکەون لەبەر کەمی چڕی.

ئەم ئەڵقە جوانانە ١٦٠,٠٠٠سەدوشەست هەزار کیلۆمەتر لەبۆشایی ئاسمان دا بڵاوبوونەتەوە، ئەم ئەڵقە جوانانە بەهەندێ زانست و تاقی کردنەوە دەرکەوتووە ٣ تا ٦ ئەڵقەیەو هەندێ زانایانیش رایان وایە سەدان ئەڵقەبن بەوجۆرە ئێمە بەکەم ئەیانبینین

بڕوانە وێنە (١١) زوحەل‌و ئەڵقەکانی

ئەستووری ئەم ئەستێرەیە ١٦ شانزە کیلۆمەترە، بەڵام لە هەمووشتیَ سەیر تر ئەوەیە: ئەم ئەستێرەیە وەکوو شووشە وایە لەم دیویەوە ئەودیوی دیارە واتە: ئەگەر تەنێکی ڕۆشن لە پشتی یەوە بێت دیارەو ئەیبینین.

کەشتی فویجر٢ زانستی زۆری ناردووە دەربارەی زوحەل‌و مانگەکانی، بەناوبانگ ترین مانگەکانی زوحەل ((تیتان))ە

ئەم مانگە زۆر جێگەی سەرسوڕمانە چونکە پاڵەپەستۆی کەشی (الضغط الجوي) وەکوو پاڵەپەستۆی کەشی زەوی وایە. هەروەها بەرگی کەشی ((تیتان)) وەکوو بەرگی کەشی زەوی وایە، ڕەنگی سوورەو ئەوە ئەگەیەنیَ پێك هێنەرە ئەندامیەکانی (المركبات العضوية) تێدابێت بەم جۆرە هەندیَ ڕای زانست هەیە لەبوونی ژیان لەسەر ئەم مانگە.

ئەستێرەی زوحەل زۆر دوورە لەخۆرەوەو پلەی گەرمای ١٨٠° سەدوهەشتا پلەی سەدی ژێرسفرە لەبەرئەوە ئاو بەشلی نامێنێتەوەو ئەیبەستیَ، هەندیَ لەزاناکان ئەڵێن کەشی ئەم ئەستێرەیە پێك هاتووە لەهەورێك لەگازی میثان.



وێنەی ژمارە (١١) ئەستێرەی زوحەل و ئەڵقەکانی



وێنەی ژمارە ( ١٢ ) ئەستێرەی زوحەل و مانگەکەی

## ٩-ئەستێرەی ئۆرانۆس

ئۆرانۆس سێ یەمین ئەستێرەی کۆمەڵەی خۆرە لەگەورەیی دا دوای مشتری و زوحەل ئەم ئەستێرەیە بەهۆی دووری لەخۆرەوە پلەی گەرمای ٢١٠ە پلەی سەدی‌یە لەژێر سفرەوە.

پاڵەپەستۆی کەشی (الضغط الجوي) ئەم ئەستێرەیە هەزاران کیلۆمەتر درێژئەبێتەوەو گازەکانی هیدرۆجین و هیلیۆم و کەمێك میپان و ئامۆنیای تێدایە.

لەبەرواری ١٩٨٦/٢/٢٥کەشتی ئاسمانی فویجر ٢ گەیشتە دەوروبەری ئەم ئەستێرەیە دوای ئەوەی ماوەی ٣٣ سی وسێ یەکەی گەردوونی بڕی لەماوەی ٩ساڵ دا واتە ٣٣×١٥٠ملیۆن کیلۆمەتر = ٤٩٥٠ ملیۆن کیلۆمەتر.

ئەمەش بەخێرایی ٥٣,٠٠٠پەنجاو سێ هەزارکیلۆمەتر لەسەعاتێك دا

ئۆرانۆس: پێنج مانگی هەیە ١-تیتانا ٢-أوبریۆن ٣-إبریل ٤-میرندا ٥-إمبریل.

کەشتی ئاسمانی ئەمریکی فویجر/٢ بەم خشتەی خوارەوە نزیك مانگەکانی ئۆرانۆس بوویەوە و دوا جاریش ئۆرانۆس. هەروەکوو لە گۆڤاری/ العلوم/ ژمارە/ ٤٨/ ساڵی ١٩٨٩ لاپەڕەی ٤٦/بغداد/ هاتووە ١٩٨٦/١/٢٤کاتژمێری ١٥,١١ فویجر/٢ گەیشتە مانگی تیتانا لەدووری ٣٨٥هەزار کیلۆمەترەوە

لەکاتژمێری١٦,١٣نزیکی مانگی أوبریۆن بوویەوە لەدووری ٤٦٩هەزار کیلۆمەترەوە.

لەکات ژمێری ١٦,٢٢نزیکی مانگی إبریل بوویەوەو لەدووری ١٢٦هەزارمەترەوە لەکات ژمێری ١٧,٥نزیکی مانگی میرندا بوویەیەوە لەدووری ٢٩,٠٠٠بیست و نۆهەزار کیلۆمەترەوە.

لەکاتژمێری ١٨,٠٠٠نزیکی ئۆرانۆس بوویەوە لەدووری ١٠٦,٠٠٠کیلۆمەترەوە لەسەعات ٢٠,٥٣نزیکی مانگی إمبریل بوویەوە لەدووری ٣٢٣هەزار کیلۆمەترەوە لە١٩٨٦/٢/٢٥گەیشتە ئۆرانۆس.

## ١٠- ئەستێرەی نبتۆن

ئەم ئەستێرەیە زۆر دوورە لەخۆرەوە، پلەی گەرمای ٢٢٠پلەی سەدی‌یە لەژێرسفرەوە !!! نزیکەی ٤٥٠٠ چوارهەزارو پێنج سەدملیۆن کیلۆمەتر لە خۆرەوە دوورە . قەبارەی ئەم ئەستێرەیە ڕێکی قەبارەی ئەستێرەی ئۆرانۆسە . (ترایتۆن) گەورەترین مانگی ئەم ئەستێرەیەیە . ئەم مانگە زۆر گەورەیە، گەورەترین مانگە لە کۆمەڵەی خۆردا . قەبارەی ڕێکی قەبارەی ئەستێرەی عطاردە . بەرگەبای هەیە و لە گازی نیترۆجین و میثان پێك هاتووە ... پاڵەپەستۆی ١/١٠ پاڵەپەستۆی زەوی یە ، کەشتی ئاسمانی فویجر /٢ لە ١٩٨٩/٨/٢٤ نزیکی ئەم ئەستێرەیە بوویەوە واتە دوای دوانزە ساڵ ڕۆیشتن بەرەو ئاسمان و ئاسمانە دوورەکان پاشان بەرەو ناوەندی ڕێگەی کاکێشان و قولایی گەردوون ، ئەم کەشتی‌یە خۆی چەند هێڵێکی ئەڵقەیی دۆزیەوە بە دەوری ئەستێرەی نبتۆن دا لەبەر ئەوە زاناکان ڕێرەویان گۆڕی نەوەك ئەو هێڵانە ڕەق بن یا وەکوو بگەنە شوێنێکی ڕەق کەشتی‌یەکە ووردوخاش بکەن .

ئەم کەشتی‌یە لەساڵی ١٩٧٧ ڕەوانەی ئەستێرەکانی کۆمەڵەی خۆرکراوەو پاشان کۆمەڵەی خۆر بەجێ ئەهێڵێ و ئەچێتە قووڵایی گەردوونەوە لەماوەی ١٢ساڵ دا (٧٠٠٠) حەوت هەزار ملیۆن کیلۆمەتر لەزەوی دوورکەوتووەتەوە.

نبتۆن چوارەمین ئەستێرەی کۆمەڵەی خۆرە لەقەبارەدا، ماوەی سووڕانەوەی بەدەوری خۆردا/ ١٦٥ساڵە، واتە یەك ساڵی ١٦٥سەدوشەستو و پێنج ساڵی زەوی‌یە.

لەساڵی ١٨٤٦ز دا ئەم ئەستێرەیە دۆزرایەوە تاکوو ئێستا سووڕانەوەیەکی بەدەوری خۆردا تەواونەکردووە لەساڵی ٢٠١١زیەك ساڵ تەواوئەبێت لەسەرئەم ئەستێرەیە. واتە لەساڵی ١٨٤٦ز تاکوو ٢٠١١ز تەنها ساڵێکە لەسەر ئەم ئەستێرەیە. چونکە لەوکاتەوە تاکوو ٢٠١١ ئینجا یەك سووڕانەوە تەواوئەکات بەدەوری خۆردا.

بەڵام سووڕانەوەیەك بەدەوری خۆی دا ١٧حەڤدە سەعاتە واتە شەوو ڕۆژێکی حەڤدەسەعاتە.

بەرگەبایەکی ئەستووری هەیە لەگازی هیلیۆم و هیدرۆجین و میثان پێك هاتووە لەگەڵ کەمێك لەگازی ئامۆنیای بەستراو.

کەشتی ((فویجر)) ٢لەسەرئەم ئەستێرەیە هەورو ڕەشەبایەکی زۆربەهێزی ئاشکراکردو خاڵێکی ڕەشی لەسەرە هەروەکوو خاڵە سوورەکەی ئەستێرەی مشتری.

زاناکان زۆر سەرسام بوون لەم هەورو رەشەبابانە، هەروەها ئەڵێن ئەستێرەی نبتۆن سەرچاوەیەکی گەرمی هەیە، چونکە زۆر دوور لەخۆرەوە، ئەوسەرچاوە گەرمی یە نهێنی یە و زاناکان زۆر سەریان سوڕماوەو تێ ناگەن، بوونی هەور لەسەر ئەم ئەستێرەیە بەهۆی ئەو سەرچاوە گەرمی یە نهێنی یەوە بوو چونکە گەرمی خۆر ناگاتە ئەم ئەستێرەیە.

﴿وَأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْماً ﴾ (الطلاق:١٢)

هەروەها کەشتی (فویجر ٢) پێنج ئەڵقەی بەدەوری ئەم ئەستێرەیەدا دۆزیوەتەوە لەبەردی کانزاو سەهۆڵ پێك هاتوون و تیشکی خۆر پێچەوانە ئەکەنەوە

ئەم کەشتی یە ٨هەشت مانگی دۆزیوەتەوە کە بەدەوری ئەستێرەی نبتۆن دا ئەسووڕێنەوە.

## (( پاشەرۆژی کەشتی ئاسمانی فویجر/٢))

لە گۆڤاری (العلوم) ژمارە/ ٤٨ دا هاتووە.

لەساڵی ٢٠٠٠ئەم کەشتی یە چووەتە ماوەی هالەی خۆرەوە........

لەساڵی ٢٠١٢ماوەی هالەی خۆر بەجێ ئەهێڵێ و ئەچێتە ناوەندی ئەستێرەکانی گەلەئەستێرەی کێشان.

لەساڵی ٨٥٧١ز نزیکی ئەستێرەکانی (برنارد) ئەبێتەوە کە ٤چوارساڵی تیشکی دوورە لەوئەستێرانەوە بەڵام ٤٢,٠ساڵی تیشکی لەخۆر دوورئەکەوێتەوە!!

لەساڵی ٢٠٣١٩ز ئەم کەشتی یە نزیکی ئەستێرەی (بروکسیما قنگورس) ئەبێتەوە لەدووری ٣,٢١ساڵی تیشکی دا لەساڵی ٢٠٦٢٩ز تێپەڕئەبێت لەنزیکی ئەستێرەی (ئالفاقنگورس) کە ٣٠٤٧ساڵی تیشکی لەکەشتی یەکەوە دوورە. ئەم ئەستێرەیە ١,٠٢ساڵی تیشکی لەخۆرەوە دوورەو نزیك ترین ئەستێرەیە لەخۆرەوە لەگەلە ئەستێرەی کاکێشان دا.

لەساڵی ٢٣٢٧٤ز ئەم کەشتی یە بەلای ئەستێرەی(لاتلاد/٢١١٨٥)تێپەڕئەبێت لەدووری ٤,٦٥ساڵی تیشکی یەوە هەروەها (فویجر ٢) ﴿١,١٥﴾ساڵی تیشکی لەخۆرەوە دوورە.

لەساڵی ٢٦٢٦٢ز ئەم کەشتی یە ئەچێتەناو هەوری (أورات)ئەم هەورە تۆپێکە لەو کلك دارانەی بەدەوری خۆردا ئەسووڕێنەوە کە درێژی یەکەی ٢٠,٠٠٠ تاکوو ٢٠٠,٠٠٠یەکەی گەردوونیە، واتە ٢٠٠,٠٠٠×١٥٠ملیۆن کیلۆمەتر= ٣٠,٠٠٠,٠٠٠ واتە سی ملیۆن ملیۆن کیلۆمەتر........

**لەساڵی ٢٨٦٣٥ز کەشتی فویجر/٢ هەوری (أورات) بەجێ ئەهێڵێ و ئەچێتە قووڵایی گەردوونەوە بەیەکجاری کۆمەڵەی خۆر بەجێ ئەهێڵێ.**

**کەوابوو ئەم کەشتی یە ئاسمانی یەکەمین بە ٢٦,٦٣٤ نزیکەی بیست و شەش هەزارو شەش سەدو سی و چوار ساڵ بەجێ ئەهێڵێ کەهەموو کۆمەڵەی خۆرە.**

**لەساڵی ١٢٩٠٨٤ ز ئەم کەشتی یە بەلای ئەستێرەی (رۆژ/١٥٤) دا لە دووری ٥/٧٥ ساڵی تیشکی‌یەوە تێپەڕ ئەبێت لە خۆرەوە ٦/٣٩ ساڵی تیشکی دوورە!!!**

**لە ساڵی ٢٩٦٠٣٦ ز بەلای (ئەستێرەی شوعرای یەمانی) دا تێپەڕ ئەبێت لە دووری ٤/٣٢ ساڵی تیشکی، ئەم ئەستێرەیە ڕووناکترین ئەستێرەی سەرووی ئاسمانەو چوارسەد ملیۆن جار لە خۆر گەورەترو ڕووناکترە ئەم کەشتی یە (فویجر ٢) لێرەدا ١٤/٦٤ ساڵی تیشکی لە خۆرەوە دوورە .**

**لە ساڵی ٤٤٢/٣٨٥ ز کەشتی (فویجر ٢) بە نزیك ئەستێرەی (عواو ٤) دا تێپەڕ ئەبێت لە دووری ٦/٧٢ ساڵی تیشکی یەوە ٢١/٨٨ ساڵی تیشکی لە خۆر دوورکەوتووەتەوە .**

**لێرەدا ئەمە ڕای زاناکانە، دوورنی یە ئەم کەشتی یە بەسەلامەتی بگاتە ئەو شوێنانە هەرچەندە هیوای ئەم گەیشتنەکەمە لای زاناکان بەهەرحاڵ بێت ئەوە بەرنامەیە و دانراوە بۆ کەشتی (فویجر ٢) .**

**﴿لَخَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ النَّاسِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ﴾ (غافر: ٥٧)**

**ماناکەی ئەوەیە پەروەردگار فەرموویەتی دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی گەورەترە لە دروست کردنی خەڵك تەنها لە ئاسمانی یەکەم و زەوی دا ئەم فەرموودەیە ڕاستی یەکەی دەرکەوتووە بێجگە لە ئاسمانەکانی ترو ئەو تەنە گەردوونیانەی نێوانیان ، کە لەمەولا باسیان ئەکەین !!!**

## ١١-ئەستێرەی پلۆتۆ

**ئەم ئەستێرەیە (٥٨٨٠) ملیۆن کیلۆمەتر لە خۆرەوە دوورە واتە نزیکەی ٤٠ چل یەکەی گەردوونی . تیرەکەی ١ تیرەی زەوی یە و دوورترین ئەستێرەی کۆمەڵەی خۆرە**

کەلـە خـۆرەوە دوورە .زەوی تـەنها یەکەیـەکی گـەردوونی لـە خـۆرەوە دوورە ، ئـەم ئەستێرەیە ٤٠ چل یەکەی گەردوونی واتە چل ئەوەندەی زەوی لە خۆرەوە دوورە .

تیشکی خۆر بە ماوەی هەشت دەقیقە ئەگاتە زەوی بەلاّم ڕووناکی ئەم ئەستێرەیە ٥/٥ پێنج سەعات ونیو ئەگاتە زەوی ئەوەندە لە زەوی‌یەوە دوورە .

تاکوو ئێستا زانیاری ئەوتۆ لە بارەی ئەم ئەستێرەیەوە نەزانراوە بەلاّم بەهۆی تەلەسکۆبی ئاسمانی (هابل) هەندێ زانیاری لێ وەرگیراوە ، ئەم ئەستێرەیە یەك مانگی هەیە، بەرگەبایەکی تەنکی هەیە لە گازی میپان ، کە باش دەرناکەوێ، تاکوو ئێستا هیچ کەشتی یەکی ئاسمانی ڕەوانەی ئەم ئەستێرەیە نەکراوە .

ئەستێرەی پلۆتۆ لە ماوەی ٦ شەش سەعاتدا بەدەوری خۆی دا ئەسوڕێتەوە واتە شەوو ڕۆژێکی شەش سەعاتە ، بەلاّم لە ماوەی ٢٤٨ ساڵی دا یەك جار بەدەوری خۆردا ئەسوڕێتەوە ، واتە ساڵێکی ٢٤٨ ساڵی ئێمەیە لەسەر زەوی ڕووی ئەم ئەستێرەیە پارچە ئەستێرەی زۆری بەرئەکەوێ وە تیشکی سەرووی وەنەوشەیی بەرئەکەوێ ، ئەمە بوو گەشتەکەمان بۆ ئەستێرەکانی کۆمەڵەی خۆر کە یەکەمین ئاسمانی مادی یە و ژمارەیان ١١ ئەستێرەی جۆراوجۆرن .

﴿إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَا أَبَتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَباً وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَاجِدِينَ﴾ (يوسف: ٤)

ماناکەی/ گەورەمان یوسف بەباوکی ئەڵێ لەخەوما ((یانزە ئەستێرەم دی لەنێوان ئەوئەستێرانەدا مانگ و خۆر سوجدەیان بۆبردم.

لایەنی یەکەمی ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەوەی دەرخستووە کۆمەڵەی خۆر ١١یانزە ئەستێرەیە. پێش ١٤٢٤ساڵ. زانست و زاناکان بەم هەموو تەلەسکۆب و کەشتی‌یە ئاسمانیانەوە تازە ئەڵێن کۆمەڵەی خۆر ١١یانزە ئەستێرەیە!!!!. ئیتر خوانەناسان بیرێك بکەنەوە لەنەزانینی خۆیان تاکوو ڕێگەی ڕاستی خواپەرستی بگرنەبەر باشترە لەوحاڵەی ئێستایان کەگومڕایی یە.

لایەنی دووەمی ئایەتەکە ئەوە ئەگەیەنیٚ کەگەورەمان یوسف نۆبرای هەبووە لەگەڵ دایك و باوکی ١١یانزەکەسن.

یان ١١یانزەبرای هەبووە لەگەڵ دایك و باوکی سوجدەیان بۆ بردووە هەروەکوو لەئایەتی (١٠٠) هەمان سورەت دا هاتووە:

﴿وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى الْعَرْشِ وَخَرُّوا لَهُ سُجَّداً وَقَالَ يَا أَبَتِ هَذَا تَأْوِيلُ رُؤْيَايَ مِنْ قَبْلُ قَدْ جَعَلَهَا رَبِّي حَقّاً وَقَدْ أَحْسَنَ بِي إِذْ أَخْرَجَنِي مِنَ السِّجْنِ وَجَاءَ بِكُمْ مِنَ الْبَدْوِ مِنْ بَعْدِ أَنْ نَزَغَ الشَّيْطَانُ بَيْنِي وَبَيْنَ إِخْوَتِي إِنَّ رَبِّي لَطِيفٌ لِمَا يَشَاءُ إِنَّهُ هُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴾ (يوسف: ١٠٠)

لەهەندیٚ سەرچاوەدا ئەو ئەستێرانەی گەورەمان یوسف لەخەودا بینینی و سوجدەیان بۆبرد

١-جَرّیان ٢-الطارق ٣-الذَّیال ٤-قابِس ٥-عَمودان ٦-الفَیلَق ٧-أَلمِصبَحُ ٨-الضَّروح ٩-الفَرغ ١٠-وَثّاب ١١-ذوالكَتفَین.

## گەلە ئەستێرەی ڕێگەی کاکێشان و ئەستێرەکانی دەرەوەی کۆمەڵەی خۆر:

(نزیکەکان –دوورەکان – زۆر دوورەکان – هەرە دوورەکان)

ئەستێرە نزیکەکان.........

ئەستێرەی دراوسیٚ ی هەرە نزیکمان (ئالفا قنطورس).

دوای ئەوەی لەکۆمەڵەی خۆر ئەچینە دەرەوە، لەناو ئەستێرەکانی گەلە ئەستێرەی کاکێشان دا هەندیٚ ئەستێرەی نزیکمان دێتەڕیٚ.

گەلە ئەستێرەی کاکێشان ١٠٠,٠٠٠سەد هەزار ملیۆن ئەستێرەیە.

ئەم ئەستێرانە زۆربەیان خۆرن وەکوو ئەم خۆرەی ئێمە بەڵکو هەندێکیان ملیۆنەهاجار یان سەدان ملیۆن جار لەم خۆرە گەورەترن.

تیرەی ئەم گەلە ئەستێرەیە ١٠٠,٠٠٠سەد هەزار ساڵی ڕووناکی یە.

واته سەدهەزارساڵ رۆیشتن بەخێرایی رووناکی ( ماشاء الله) ئەم گەلە ئەستێرەیە دووقۆڵی هەیە کۆمەڵەی خۆر ئەکەوێتە ناو یەکێك لەم قۆڵانەو ٣٠,٠٠٠ سی هەزار ساڵی تیشکی لەناوەندی یەوە دوورە.

**بڕوانە وێنەی ژمارە(١) ڕێگەی کاکێشان یان گەلەئەستێرەی کاکێشان.**

لەناو گەلەئەستێرەی کاکێشان داو نزیك خۆری خۆمان حەوت خۆرهەن نزیك ترینیان خۆری یان ئەستێرەی (ئالفا قنگورس)ە دراوسێی خۆرەکەمانە هەروەکوو دراوسێ یەك تەنها دیوارێکی هەبێت لەگەڵ دراوسێکەی تری دا، ئەم ئەستێرەیە ٤ چوارساڵی رووناکی و سێ یەکی ساڵێك لەئێمەوە دوورە............یەك ساڵی رووناکی = ١,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠کیلۆمەترە.

برایانی ئادەمیزاد ئەگەر بیربکەینەوە لەدەسەڵاتی پەروەردگارو بزانین دراوسێی هەرە نزیکمان ٤ × ١,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠ = ٤,٣٣٣,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠ بلیۆن کیلۆمەتر دوورە.

زاناکان ئەڵێن ٣٥٠٠سێ هەزارو پێنج سەد کۆمەڵەی خۆر وەکوو ئەم کۆمەڵەی خۆرەی ئێمە بەم فراوانیەوە جێگەی لەماوەی ئەم دووری‌یەدا ئەبێتەوە. واتە لەنێوان ئێمەو دراوسێ نزیکەکەمان ئەستێرەی (ئالفا قنطورس).

**زانایانی گەردوون ناسی ئەڵێن:**

ئەگەر بتوانین کەشتی یەکی ئاسمانی دروست بکەین لەسەعاتێك دا ٢٠٠,٠٠٠دووسەد هەزار میل بڕوات پاش ١٥,٠٠٠پانزە هەزارساڵ ئەگەینە ئەم ئەستێرەیە سەرەتای دەست پێکردنمانە بەرەو ئەستێرەکانی گەردوون هەروەکوو چۆن لەسەر قەرەوێڵەکەت هاتیتە خوارەوە بەمەبەستی گەشتێك بەدەوری کوورەی زەوی‌دا بەپێ. کەوابوو ئەستێرە دراوسێ کەمان سەرەتای دەست پێکردنی رۆیشتنە بەرەو ئاسمانەکان و ئەستێرەکانیان!!!. پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ﴾ (الذريات: ٤٧)

واتە: بەدەستی خۆمان ئاسمانەکانمان دروست کردوو خۆمان فراوانیان ئەکەین.

## ((جووڵانەوەی ئەستێرەکانی ڕێگەی کاکێشان ))

(( مَجّرةَ دَرب التَّبانة ))

هەموو ئەستێرەکانی گەلە ئەستێرەی کاکێشان بەخێرایی یەکی زۆر زۆر ئەڕۆن هەریەکەو بەلایەك دا ، تێکڕایی خێرایی جووڵانەوەی ئەستێرەکان ١٦,٠٠٠ تاکوو ٦٤,٠٠٠ شەست و چوارهەزار کیلۆمەترە لە سەعاتێکدا .

سووڕانەوەی خۆر بەدەوری گەلە ئەستێرەی کاکێشاندا دووسەد ملیۆن ٢٠٠,٠٠٠,٠٠٠ساڵ ئەخایەنێ کەوابوو خۆر لەو کاتەوە دروست کراوە تاکو ئێستا تەنها (٢٠) جار بەدەوری ڕێگەی کاکێشاندا سووڕاوەتەوە !!!

بەمەرجێ خێرایی ڕۆیشتنی خۆر لە سەعاتێکدا ٧٠٠,٠٠٠ حەوت سەد هەزار کیلۆمەترە ، لەلایەکی تریشەوە ، سەد هەزار ملیۆن ئەستێرەی کاکێشان هەموویان ئەسووڕێنەوە بەدەوری محوەری گەلە ئەستێرەکەدا . ئایا ئەم هەموو ئەستێرانە بەم هەموو خێرایی سووڕانەوەیانەوە تەنها لەگەلە ئەستێرەیەکدا ١٥٠ سەدو پەنجا هەزار ملیۆن گەلە ئەستێرەی وەکوو گەلە ئەستێرەی کاکێشان هەیە لە گەردوون دا .

ئەمانە هەمووی خۆیان بە ڕێکەوت دروست بوون، کوێرانە بەڕێوەئەڕۆن ؟ گومانی تێدا نی یە دروست کراوی پەروەردگارن، پەروەردگار بەڕێوەبەریانە .

## بەرەو ئەستێرەکانی تری گەلە ئەستێرەی کاکێشان

دوای ئەوەی باسی هەندێ ئەستێرەی دراوسێ مان کرد ، کە نزیکن لە کۆمەڵەی خۆرەوە ، ئێستا بەرەو دوورتر ئەڕۆین بۆ ناوەوەی گەلە ئەستێرەی ڕێگەی کاکێشان (مجرە درب التبانە) بزانین چی ئەبینین، چی دیارە پەروەردگار چی دروست کردووە !!!؟

دوای ئەوەی کۆمەڵەی خۆرو ئەستێرە دراوسێکانمان بەجێهێشت ، خۆمان لە دەریایەکی گەورەی پڕ لەئەستێرەدا ئەبینینەوە ، لە پێشمانەوە ئەستێرەیەو لە دوامانەوە ئەستێرەیە، لەسەرەوەو ژێرەوە ئەستێرەیە !!هەزاران ملیۆن ئەستێرە، دووری نێوانیان لە ١٠–١٠٠ دە تاکو سەد ساڵی ڕووناکی لەیەکترەوە دوورن .

کـەوابوو ئـەم ئەسـتێرانە ئەوەنـدە دوورن لەیەکـەوە ئەگـەر بڕۆینـە نزیکـی هەریەکێکیان وا ئەزانین تەنها ئەم ئەستێرەیە هەیە بە ئاسمانەوە !!! زاناکان ئەڵێن هەموو ئەستێرەیەك ڕێگەیەکی فراوانی هەیە بۆ ڕۆیشتن و جوڵانەوەو سوڕانەوە ، نزیکەی پەنجا ملیۆن جار بەقەدەر تیرەی خۆی ئەبێت و بەڕای زاناکان بەینی نێوان ئەستێرەیەك و ئەستێرەیەکی تر لەگەلە ئەستێرەی کاکێشان دا بەلایەنی کەمەوە ٤ ساڵی ڕووناکی ئەبێت ، ئەو ئەستێرە زۆرانەی لە ڕێی ڕێگەی کاکێشان دا دیارن سەد هەزار ملیۆن ئەستێرەن ، هەموویان بە ڕێك و پێکی هەروەکوو شانەی هەنگ یەکەیەکی گەردوونی پێك هێناوە ئەم یەکەیە پێ ی ئەڵێن : **(Galaxy )** (مجرە) یان گەلە ئەستێرە .

گەلە ئەستێرەی کاکێشان تەنها شانەیەکە لە شانەکانی گەردوون کە ژمارەی ئەستێرەکانی ١٠٠,٠٠٠ سەد هەزار ملیۆن ئەستێرەیە، خۆریش یەکێکە لەم ئەستێرانە ، بەلاّم هەزاران خۆری تر لەم گەلە ئەستێرەیەدا هەیە کە زۆر گەورەترو بەتین ترو ڕووناکترن لەم خۆرەی خۆمان . زاناکان ئەڵێن :

گەلە ئەستێرەی کاکێشان شێوەکەی پێچاوپێچە، دووقۆڵی هەیە، تیرەکەی ١٠٠ سەد ساڵی ڕووناکی‌یەو ئەستوورایی ئەکەوێتە ناوەڕاستی ٩٩٪ ی ئەستێرەکانی ئەکەونە ئەم ناوچەیەوە، ئەستوورترین ناوچەیەتی و ئەم ئەستووری‌یە ٢٠ بیست ساڵی ڕووناکی یە بارستایی ١٠٪ ی بارستایی گەلە ئەستێرەکە هەموویەتی ، لەبەر ئەوە ئەم شوێنە ئەشکەوتە ڕەشەکانی ئاسمان لە ناوەڕاستیدا دروست ئەکات کە زۆر زۆر چڕیەکەیان بەرزە ئەگەر گەنمی هەموو جیهان دانە دانە بکەین زەوی تەنها دەنکێکە لەو هەموو گەنمە لەچاو گەردوون دا !!!

# له نێوان ئەو هەموو ئەستێرانەدا بۆشایی نی یە

زاناکان ئەڵێن تاکوو ئێستا ١٦٠٠ هەزارو شەش سەد ملیۆن گەلە ئەستێرە لە گەردوون دا هەیە هەریەکەیان لە گەلە ئەستێرەی کاکێشان گەورەترو فراوانترە، ژمارەی ئەستێرەکانی زۆر زۆر زیاترە ، هەروەها ئەڵێن تیرەی گەردوون لە دوو ملیار واتە دوو هەزار ملیۆن ساڵی ڕووناکی زیاترە ، **ماشاء الله** لەم فراوانیە : بڕوانە کتێبی (الذرة والكون ) ص ١٣٢ مترجم عربی/عصام میاس

تالیف: ڤیار روسو

﴿وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ﴾(البقرة:٢٥٥)

واتە: عەرش و ئاسمانەکان وزەوی فراوان کرد ، ئینجا لەمە فراوانتر ئەبێ چی بێت؟ تەنها لە توانای پەروەردگاردایە ئەم فراوانیە ، دیسانەوە زاناکان ئەڵێن :

هەرچەندە بە تەماشا کردن بۆشایی زۆر ئەبینین لە نێوان ئەستێرەکان دا بەڵام ئەم بۆشایی یە چۆڵ نی یە بەڵکو مادە هەیە ، ئەو مادەیە پێ ی ئەڵێن : هەورە گەردوونیەکان (السُحُب الكونيه) کە زۆربەی پێك هێنەرەکانیان گازی هیدرۆجینە ، ئەم هەورە گەردوونیانە بەزۆری لەهەردوو قۆڵی گەلە ئەستێرەی کاکێشاندا هەیە ...

بارستایی ئەم هەورانە بەقەدەر بارستایی هەموو ئەستێرەکانی ڕێگەی کاکێشان ئەبێت !!

# گەلە ئەستێرە دوورەکانو گەلە ئەستێرە دراوسێکانیگەلە ئەستێرەی کاکێشان

نزیك ترین دراوسێ ی گەلە ئەستێرەی کاکێشان گەلە ئەستێرەی (ئەندرومیدا)یە **Andromeda** (مجرة المرأة المسلسلة)

ئەم گەلە ئەستێرەیە سێ ئەوەندەی گەلە ئەستێرەی کاکێشانە!! واتە لە ٣٠٠ سێسەد هەزار ملیۆن ئەستێرە پێك هاتووە !!!هەرچەندە نزیکترین گەلە ئەستێرەیە ، بەڵام دوو ملیۆن ساڵی ڕووناکی لە گەلە ئەستێرەی کاکێشانەوە دوورە سبحان الله ئەم گەلە ئەستێرەیە ، تاکە گەلە ئەستێرەی گەردوونە کە بەچاو لە شەوانی تاریکی زستان

دا وەکو هەڵمێك بە ئاسمانەوە لە زۆر دوورەوە دیارە ...ئیتر لێرەدا زانست و زاناکان سەرگەردانن هیچ زانیاریەکی تریان نیە.

بەڵام دوای ئەم گەلە ئەستێرەیە پێنج گەلە ئەستێرەی تر هەن کە بە دراوسێی کاکێشان دانراون بەچاو نابینرێن تەنها بە ئامێری نوێی پێشکەوتوو دیارن ئەمانیش هەریەکەیان لە دوو ملیۆن ساڵی ڕووناکی زیاتر لەیەکترو لە کاکێشانەوە دوورن ئەم پێنج گەلە ئەستێرەیە و گەلە ئەستێرەی ئەندرومیداو کاکێشان حەوت گەلە ئەستێرەی دراوسێ ی یەکترن، حەوت ئاسمانی مادیان هەیە کە هەورە نەوەوییەکانن یان هەورە گەردوونیەکان .

﴿سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقاً مَا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَنِ مِنْ تَفَاوُتٍ﴾ (الملك:٣) هەروەها :

﴿وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعاً شِدَاداً﴾ (النبأ:١٢)

ئەمە یەکەم کۆمەڵەی گەلە ئەستێرەی گەردوونە . هەندێ لە زاناکان ئەڵێن : تاکوو ئێستا دەرکەوتووە زیاتر لە سەد ملیۆن گەلە ئەستێرەی گەورە لە گەردوون دا هەیە هەندێکیان ژمارەی ئەستێرەکانیان لە ٥٠٠ پێنج سەد هەزار ملیۆن ئەستێرە زیاترەو خۆری وایان تێدایە ٤٠٠ چوارسەد ملیۆن جار لەو خۆرەی ئێمە گەورەترە ، ئەو خۆرەی ئێمە یەك ملیۆن و دووسەدو پەنجا هەزار جار لە زەوی گەورەترە ، ئەمە کێ دروست کەرو فەرمانڕەوایەتی ؟ پەروەردگارە پەروەردگار .

ئەم گەلە ئەستێرانە، هەرچەندە لەدروست بووندا وەکوو یەك وان بەڵام لەشێوەدا جیاوازن: هەندێکیان پێچاوپێچن، هەندێکیان پێچاوپێچن و دەسك دارن، هەندێکیان ئیلیجی و هەندێکیان هێلکەیی .

**بڕوانە وێنەکانیان وێنەی ژمارە (١٣)**

## ((قەبارەی ئەستێرەکانو خێرایىو جوولانەوەیان))

ئەستێرەکانی ڕێگەی کاکێشان نزیکەی ٨٠٪یان قەبارەی خۆریان هەیە بەڵام ٢٠٪یان زۆر زۆر گەورەترن و هەندێکیان لە ٣٠سی ملیۆن جار تاکوو ٤٠٠ملیۆن جار لەخۆر گەورەترن!!!.

هەروەها هەندێ ئەستێرەی بچووکیش هەیە تیرەکەیان ٦٪ی تیرەی خۆرە.

## ((پەندێكو ئامۆژگاری یەك بۆخاوەن هۆشەکان))

ئەم گەردوونە بەم یاسا ڕێك و پێکی یەوە بەم هەموو جوولانەوەو خێرایی یەوە، بەو هەموو مانگ و خۆرو ئەستێرانەوە، بەو هەموو سەدیم و مجرەو کۆزاراو ئەشکەوتی ڕەش و سپیانەوەو ئەو هەموو نهێنی یانە کە تاکوو ئێستا زاناکان هیچی لێنازانن: گومانی تێدا نی یە هەمووی دروست کراوی پەروەردگارن، دروست کراوی یەك دەسەڵاتن کە خاوەنی هێزو زانست و دەسەڵاتێکی کۆتایی نەهاتووە..........

تەنها تەماشاکردنێکی گەردوون کەزاناکان تەمەنیان بەهەزاران ملیۆن ساڵ داناوەو هەزاران ملیۆن خۆری جۆراوجۆری تێدایە کەلەم خۆرەی ئێمە زۆر گەورەترن و ملیۆنەها جار خێراترن لەڕۆیشتن داو لەسووڕانەوەداو هەندێکیان خێرایی یان دەگاتە خێرایی رووناکی.

ئەم هەموو ئەستێرانە ئەڕۆن و ئەسووڕێنەوە لەبۆشایی ئاسمان دا کەژمارەیان بەنووسین نانووسرێ ئەوەندە زۆرن، ئەمەبێجگە لەگەورەیی و گەرمایی و خێرایی و جوولانەوەو پارچەو هەوری گەردوونی تر لەنێوانیان دا ، هەموویان لەبۆشایی یەکی فراوان دا بەنەخشەیەکی ڕێك و پێك ئەڕۆن و ئەخولێنەوە بێ ئەوەی یەکێکیان لەگەڵ ئەوی تریان لەیەك بدات یان زۆر زۆر بەکەمی کاربکاتە سەر جوولان و ڕۆیشتن.

ئەگەر هەرجۆرە هەڵەیەك زۆر زۆرکەم یان بچووك بێت رووبدات لەنێوانیان دا هەموویان ئەڕووخێن بەسەریەکداو گەردوون کاول و وێران ئەبێت.

لەبەرئەوە ئەو یاسایەی پەروەردگار دایناوە بۆیان هەرگیز تێك چوونی نیە!! تاكوو ئەوكاتەی فەرمانی پەروەردگاری دەرئەچێت بۆ كۆتایی هاتنی هەموو گەردوون و بوون و بوونەوەر.

## زاناكان ئەڵێن:

هەموو ساڵێك ٤٠-٥٠ تەقینەوە ئەبێت لەگەڵە ئەستێرەی كاكێشان دا لەناوچەی (سوپرنوڤا)ی گەلە ئەستێرەكەدا.

هەموو گەلەئەستێرەی كاكێشان چەند رووناكە ئەم تەقینەوانە ئەوەندە رووناكی ئەدەنەوەو رووناكتری ئەكەنەوە!!!

ئەو تەقینەوەیە لەسوپرنوڤادا رووئەدات هێزی چەند هەزار ملیۆن بۆمبی هیدرۆجینی هەیەو رووناكی هەزاران ملیۆن خۆری هەیە!!! جاری واهەیە ئەم تەقینەوەیە ١٠-١٥رۆژ ئەخایەنێ بەرۆژیش ئەتوانین هەستی پێ بكەین هەرچەندە بەشەودا روون و ئاشكراترە!!

بەڵام پەروەردگار سنووری دیاریكراوی بۆ داناوە، كەلەوە زیاتر كارناكاتەسەر رەورەوەی مانگ و خۆرو ئەستێرەكانی تر.

## كەوابوو:

گەورەیی و دەسەڵات و هێزوتوانای پەروەردگارە یاسای تایبەت و نەخشەی تایبەتی كێشاوە بۆ گەردێكی بچووك كەبەچاو نابینرێ لەبەر بچووكی تائەگاتە گەورەترین تەنی گەردوونی هەمووی بەیەك یاسای تایبەتی ئەڕۆن بەڕێوە.

هەروەكوو لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿أَفَلَمْ يَنْظُرُوا إِلَى السَّمَاءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا وَمَا لَهَا مِنْ فُرُوجٍ﴾ (ق:٦)

واتە: ئایا تەماشا ناكەن چۆن ئاسمانمان لەسەروویانەوە دروست كردو رازاندمانەوە، شڕی تێدا نی یە واتە درزی تێدانی یە و هەڵەی تێدا نی یە.

لێرەدا پێویستە یاخی بوان و بێ باوەڕان بیربكەنەوە رێگەی راست بدۆزنەوە ئەویش خواپەرستی یە ، یەكتاپەرستی یە.

خواپەرستانیش دڵنیابن کەلەسەر راستین و سەرکەوتنی ئەم جیهانەو جیهانی دوایی یان بەدەست هێناوە.

## ((هەورە گەردوونیەکان))

هەروەکوو باسمان کرد، زاناکان ئەڵێن: بۆشایی نی یە لەنێوان ئەستێرەکانی گەردوون دا. بەڵکو هەورێك وەکوو هەڵم بڵاوبوەتەوە لەنێوان ئەستێرەکانی گەلە ئەستێرەکان دا لەگەردوون دا. زاناکان ئەڵێن: سەد ملیۆن گەلە ئەستێرەهەیە لەگەردوون دا (ئەوانەی تاکوو ئێستا زانراون)

لەهەر گەلە ئەستێرەیەك دا ١٠٠سەد هەزار ملیۆن تاکوو پێنج سەدهەزار ملیۆن ئەستێرە هەیە ، ئەم گەلە ئەستێرانە هەندێکیان نزیکی یەکترن و کۆمەڵەی گەلە ئەستێرە پێك ئەهێنن هەروەکوو: گەلە ئەستێرەی کاکێشان و ئەندرۆ میداو پێنج گەلە ئەستێرەکەی تری نزیکیان کۆمەڵەی گەلە ئەستێرەی یەکەمیان پێك هێناوە ، پاشان گەلە ئەستێرەکانی تریش کەسەد ملیۆن زیاترن بەژمارەی جیاوازو نزیك یەکتر کۆمەڵەی گەلە ئەستێرەی تر پێك ئەهێنن!!!.

کەوابوو هەروەکوو باسی ئاسمانە گازی یەکانمان کرد حەوت ئاسمان بوون.

ئاسمانە مادییەکانی کۆمەڵەی گەلە ئەستێرەی یەکەمیش حەوت ئاسمانن.

١-گەلەئەستێرەی کاکێشان ئاسمانی یەکەمی کۆمەڵەی خۆرە.

٢-گەلەئەستێرەی ئەندرۆمیدا یەکەم دراوسێ ی کاکێشانە ئاسمانی دووەمی کۆمەڵەی خۆرە.

٣-پێنج گەلەئەستێرەی تر ئەوانیش پێنج ئاسمانی مادی ترن بۆ کۆمەڵەی خۆر. کەهێشتا زاناکان بەتەقدیری باسیان ئەکەن و ژمارەی ئەستێرەکانیان بەتەقدیری دیاری ئەکەن. ئەمە هەرحەوت ئاسمانە مادی یەکە.

حەوت ئاسمانی ئەثیری هەیە لەبەشی دووەم ی ئەم کتێبەدا باسیان ئەکەین.

هەروەها گەردێك بەچاو نابینرێ حەوت توێکڵی هەیە واتە حەوت ئاسمانی هەیە هەرچەندە بچووکە. واتە لەقورئانی پیرۆزدا باسی حەوت ئاسمان ئەکات

لەهەمووکات و شوێنی جۆراوجۆری یان دا راستە حەوت ئاسمانن بەگوێرەی زانستی نویٚ......

کەواتە بابلێین:

﴿ الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَاماً وَقُعُوداً وَعَلَى جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلاً سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾ (آل عمران:١٩١)

واتە: پەروەردگار ئەم هەموو بوونەوەرەت بیٚ مانا دروست نەکردووە.

هەروەها:

﴿وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعاً شِدَاداً﴾ (النبأ:١٢)

واتە: حەوت ئاسمانی بەهێزمان لەسەرویانەوە دروست کرد.

دیسانەوە فەرموویەتی:

﴿الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقاً مَا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَنِ مِنْ تَفَاوُتٍ فَارْجِعِ الْبَصَرَ هَلْ تَرَى مِنْ فُطُورٍ﴾ (الملك:٣)

واتە: ئەوەی حەوت ئاسمانی دروست کرد یەك لەسەرووی یەکەوە.

جارێکی تریش فەرموویەتی:

﴿فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ وَأَوْحَى فِي كُلِّ سَمَاءٍ أَمْرَهَا﴾ (فصلت:١٢)

واتە:لەماوەی دوو رۆژدا حەوت ئاسمانی دروست کردو هەرئاسمانێك فەرمانی پەروەردگاری بۆدەرکرد.

لێرەدا پێویستە باسی پرسیارێکی هاوڕیٚ یەکی نەزانم بکەم کە لیٚ ی پرسیم ووتی:

﴿جَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ﴾

لەقورئان دا هەیە یان نی یە ؟ منیش ووتم بەڵیٚ هەیە.

ئەویش ووتی باشە ئەگەر ئاسمانەکان و زەوی هەموو بەهەشت بیٚ ئیتر ئاگری چی و دۆزەخی چی!!!.

**منیش وەڵامم دایەوە ووتم :**

برای بەڕێزم بەم ئایەتە بەهەشت بەقەدەر زەوی و حەوت ئاسمانەکەی ئەبێت واتە ئەو حەوت ئاسمانەی کۆمەڵەی گەلە ئەستێرەی یەکەم کەلە گەلە ئەستێرەی کاکێشان و ئەندرومیداو پێنج گەلە ئەستێرەکەی تری نزیکی ئەوان. ئەمە تەنها کۆمەڵە گەلە ئەستێرەیەکە. لەگەردوون دا بەگوێرەی زانستی زاناکان و بۆچوونیان ١٠٠سەدملیۆن تاکوو سەد هەزار ١٠٠,٠٠٠ملیۆن گەلە ئەستێرەهەیە ئەوانیش بەملیۆن کۆمەڵەی گەلە ئەستێرە پێك ئەهێنن کەهەندێ گەلە ئەستێرەیان نزیکەی ٥٠٠پێنج سەد هەزار ملیۆن ئەستێرەی تێدایەو دووری نێوان گەلە ئەستێرەیەك و گەلە ئەستێرەیەکی تر دووملیۆن ساڵی رووناکی یە.

ئێمە کۆمەڵەی گەلە ئەستێرەی یەکەمی گەردوونین بەهەشت بەقەدەر ئەم کۆمەڵە گەلە ئەستێرەیە ئەبێت بەگوێرەی ئەو ئایەتەی باست کرد.

واتە: سەدهەزار ملیۆن بەشی گەردوون بەشێکی بەهەشتە!!!. ئەویش بۆ بڕواداران. بەشەکانی تریش جێگەی دۆزەخە بۆبێ باوەڕان.

بەم جۆرە هاوڕێی بەڕێزم تێ گەیشت و ئێستاش زۆر حەزی لەباسی گەردوون ناسی‌یە...

دوای ئەم کورتە باسە، دێینەوە سەرباسی هەورە گەردوونیەکان: ئەم هەورانە گەردوونیان پڕکردوەتەوە لەهەموو شوێنێکی گەردوون دا هەن بەڵام خەستی و چڕیان لە شوێنێکەوە ئەگۆڕێ بۆ شوێنێکی تر.

لەهەندێ شوێنی گەردوون دا گەردی ئەم هەورانەیەکیان گرتووە وەکوو چەوو لمی بچووکیان لێ هاتووە پێی دەڵێن خۆڵی گەردوونی...

ئەم خۆڵە گەردوونیە لەگەڵ گازەکان دا مادە دروست ئەکەن.... زاناکان ئەڵێن: ئەستێرەکان و مانگەکان و خۆرەکان لەگەردوون دا لەم مادە گەردوونیە دروست کراون. دیسانەوە بڕوانە پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿ أَفَلَمْ يَنْظُرُوا إِلَى السَّمَاءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا وَمَا لَهَا مِنْ فُرُوجٍ﴾ (قّ:٦)
واتــه: ئايــا تەماشــاى ئاسمــانى ســەرەوەيان ناكــەن؟ چـۆنمان دروســت كــردو رازاندمانەوەو هيچ درزى تێدانيه؟ بڕوانە وێنەى ژمارە (١٣) ڕازانەوە هەروائەبێت
﴿إنا زينا السماءَ الدنيا بِزينة الْكَواكبِ﴾ (الصافات:٦)
هەروەها:
﴿وَزَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ﴾ (فصلت: ١)




وێنەى ژمارە (١٣)

**هەندێ لەزاناکان ئەڵێن:**

ئـەم مـادە گەردوونیـە لەئەسـتێرە سـەرەتایی یـەکانی گـەردوون دا دروسـت بـووە لەکاتی یەکگرتنی ئەم ئەستێرانەدا!!!.

**هەروەها هەندێکی تریان ئەڵێن:**

گەردیلـەکانی لەشـی ئـادەمیزاد لەسـەرەتاوە لـەم خۆڵـە گەردوونیـە دروسـت کراون!!!!...کتێبی (شهادە الکون) ص١٠٧/ عبدالودود رشید محمد ماشاء الله پاش زیاتر لەهەزارو چوارسەدساڵ لەمەوپێش کەلەقورئانی پیرۆزدا هاتووەو پەروەردگار فەرموویەتی: لەشی ئادەم لەقوڕ دروست کراوەو پاشان ڕۆحی بەبەرداکراوە لەلایەن پەروەردگارەوە هەروەکوو فەرموویەتی:

﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ صَلْصَالٍ مِنْ حَمَإٍ مَسْنُونٍ﴾ (الحجر:٢٦)

﴿الَّذِي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ وَبَدَأَ خَلْقَ الْإِنْسَانِ مِنْ طِينٍ﴾ (السجدة:٧)

واتە :پەروەردگار هـەموو شـتێکی بەچاکی دروست کـردو لەسـەرەتاوە ئادەمیزادی لەقوڕ دروست کرد.

بەڵگـە لەمـە راسـتتر ئـەبێ چـی بێـت: کەپـەروەردگار فەرموویـەتی: ئادەمیزادمـان لەقوڕێکی وەستاو دروست کرد. بێگومان ئەوخۆڵە گەردوونیەبووە کەیەکی گرتـووە هەروەکوو زاناکـان ئـەڵێن وێنـەی چـەوولمی زۆر وورد. سـوپاس بـۆ پـەروەردگار هـەتا زانست پێش بکەوێ گەورەیی و دەسەڵاتی پەروەردگار زیاتر دەرئەکەوێ!!!.

ئـەم فەرموودانـەی پـەروەردگار لـە قورئـانی پـیرۆزدا باسـی ئەوەئەکـەن یەکـەم ئادەمیزاد لە قوڕدروسـت کـراوە.....وەکـوو زاناکـان ئـەڵێن لەهـەورە گـەردونی و خۆڵـە گەردونیەکان دروست کراوە.

**بڕوانە وێنەی ژمارە (١٤) یەکێك لەهەورە گەردوونیەکان**

﴿ إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلائِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَراً مِنْ طِينٍ ﴾ (صٓ:٧١)

﴿وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ مِنْ نُطْفَةٍ ثُمَّ جَعَلَكُمْ أَزْوَاجاً﴾(فاطر:١١)



وێنەی ژمارە ( ١٤ ) هەورێکی گەردوونی

﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْأِنْسَانَ مِنْ سُلالَةٍ مِنْ طِينٍ ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَكِينٍ ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَاماً فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْماً ثُمَّ أَنْشَأْنَاهُ خَلْقاً آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾ (المؤمنون:١٤،١٣،١٢)

﴿فَاسْتَفْتِهِمْ أَهُمْ أَشَدُّ خَلْقاً أَمْ مَنْ خَلَقْنَا إِنَّا خَلَقْنَاهُمْ مِنْ طِينٍ لازِبٍ﴾ (الصافات:١١)

لەمەوپێش باسمان کرد کەقۆڵە پێچاوپێچەکانی (لوولەیی یەکانی) گەلە ئەستێرەی کێشان پڕن لەم هەورە گەردوونی یانەو لەم رەگەزانە پێك هاتوون: (کالیسیۆم، پۆتاسیۆم، صۆدیۆم، ئاسن، هیدرۆجین) بەمەرجێ زۆرترینیان هیدرۆجینە!!. (هەمان سەرچاوە)

کەوابوو ئەم گازو رەگەزانە کەلەمادە گەردوونیەکان داهەن لەلەشی ئادەمیزادیش داهەن.

هەروەکوو ئادەم لەو قوڕە دروست کراوە لەوانەیە بڵێین ئەوخۆڵە گەردوونیە چۆن بووە بەقوڕ!!.؟

زاناکان خۆیان ئەڵێن: (هەورە گەردوونیەکان وەکوو هەڵمی ئاون ، گەردوون پڕە لەم هەورانەو خەستی و چڕی یان جیاوازە لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر کەوابوو هەڵم و خۆڵ تێکەڵ ببن یەك ئەگرن و قوڕاوێکی وەستاو دروست ئەبێت!!!

ئەوەیە لەقورئانی پیرۆزدا باس کراوە بە﴿مِنْ حَمَإٍ مَسْنُونٍ﴾ زاناکانیش ئەم راستی یە ناشارنەوە. (هەمان سەرچاوە)).

کەوابوو: هەورە گەردوونیەکان و خۆڵە گەردوونیەکان پەردە لەڕووی هەموو دواکەوتنێکی ئەقڵی دائەماڵن و راستی دەرئەخەن. قورئانی پیرۆزیش ئەم باسەی کردووە پێش زیاتر لە ١٤٠٠ هەزارو چوارسەد ساڵ!!!.

زاناکان بەزانستی نوێ سەلماندیان هەموو فەلسەفەی کوفرو إلحاد درۆیەو تاقە فەلسەفەی ئیسلامی زانستی ڕاستە!!!.

لەگەردوون دا هەمووشتێك قەبارەی خۆی هەیەو ماوەی تایبەتی نێوانیان هەیە.

هەوری گەردوونی وەکوو هەوری سەرزەوی نی یە:

هەورێکی گەردوونی چڕ هەیە لای زاناکان زۆر بەناوبانگە:

ئەگەر مانگ و خۆرو زەوی و ئەستێرەکانی تری ئەم کۆمەڵەیە بخەینە ناو ئەو هەورەوە لەماوەی چرکەیەکدا ئەبن بەهەڵمێکی نادیار لەناو هەورە گەردوونیەکەدا.

ئەمەیە دەسەڵاتی گەورە ئەمەیە دروست کراوی سەرسوڕهێنەر کەپەروەردگار بەدی هێنەری هەموویانە.هەزاران ئەستێرەی بەکۆمەڵ و چین چین و دروستکراو هەیە بەکۆمەڵ هەروەکوو تۆپێك، ناوەڕاستیان رووناك ترە لەلێوارەکانیان زاناکان پێ یان ئەڵێن هێشووە خڕەکان.

ئەم هێشووە ئەستێرانە لەگەردوون دا لەگەورەیی دا یەکسانن بەگوێرەی رای زاناکان.

تیرەی هەر هێشووە ئەستێرەیەك ١٠٠ سەد ساڵی رووناکی یە.

**بڕوانە وێنەی ژمارە ( ١٥ ) هێشوو ئەستێرەیەك**



**وێنەی ژمارە ( ١٥ ) هێشووە ئەستێرە**

**هەندێ هێشووە ئەستێرەی تر لەگەردوون دا هەن بەڕیزو چین چین دانەنراون زاناکان پێ یان ئەڵێن: هێشووە ئەستێرەی کراوە!!.**

**هەرهێشوویەك لەمانە لە١٥٠سەدوپەنجا گەلە ئەستێرەی وەکوو گەلە ئەستێرەی کاکێشان پێك هاتووە.**

**هێشووە ئەستێرەی (ثُريّا) یەکێکە لەمانە. کەلەکوردەواری دا پێ ی ئەڵێن (کۆ). ئەگەر بەچاو تەماشای بکەین لەشەوانی پایزو زستان دا زۆر جوان دیارە بەڵام تەنها حەوت ئەستێرەی بەکۆمەڵ ئەبینین. لەڕاستی دا ئەم هێشووە ئەستێرەیە هەزاران ساڵی رووناکی دوورەو هەزاران ملیۆن ئەستێرەی تێدایە!!!.**

ئەم هێشوانە ( خڕەكان و كراوەكان ) ئەكەونە دەرەوەی گەلە ئەستێرەی كاكێشان. نزیكەكانیان ٢٠-٥٠ هەزار ساڵی رووناكی دوورن لەكاكێشانەوە.

زانستی نوێ تاكوو ئێستا سەدجۆر لەم هێشوانەی دۆزیوەتەوە بەهۆی ئامێری زۆر پێش كەوتووەوە تەماشایان ئەكەن.

ئەم هێشوانە ئەسووڕێنەوە بەسووڕانەوەیەكی ئەڵقەیی بەدەوری گەلە ئەستێرەی كاكێشان دا.

كۆمەڵەی گەلە ئەستێرە لەچەند گەلە ئەستێرەیەكی نزیك یەكتر پێك هاتووە هەندێ لەم كۆمەلأنە لە ٢٠ گەلە ئەستێرە زیاترن.

بەلأم كۆمەڵەی گەلە ئەستێرەی كاكێشان و ئەندرومیراو پێنج گەلە ئەستێرەكەی‌تر كەكۆمەڵەی یەكەمن لەحەوت گەلە ئەستێرە پێك هاتووە....

واتە: گەردوون لەگەردێكەوە تاكۆتایی یەك یاسای ی رێك و پێكی هەیە.

تاك و جوت و كۆ: دیارن.

تاك و كۆمەڵ و گەل: دیارن.

ژمارەو دووری و قەبارەو چڕی و كێش دیارن.

سووڕانەوەو خێرایی و ماوەو كات دیارن.

هەموو شتێك دیارەو بەیاسایەكی رێك و پێك پەروەردگار ئەیبات بەڕێوە!!..

## ((سەدیمەكان)) - Nebula -

سەدیم تەمێكی تەنكەو چەند جۆرێكی هەیە، هەندێكیان رووناكن و بەهۆی ئەو ئەستێرانەوە لەدەوروبەری دان، یان لەناوی دان، یان رووناكی بەهۆی ئەو ووزەیەوە لەئەستێرەكانی نزیكی یانەوە، وەری ئەگرن ژمارەی ئەو سەدیمانە كە تاكوو ئێستا زانراوە ١٣٠ سەدوسی سەدیمن و نزیكترین یان لەزەوی یەوە هەزارساڵی رووناكی یە، هەندێ سەدیم تاریكن لەشێوەی پەڵەیەكی رەش دان و پیێ یان ئەڵێن (فەردەخەڵون).

جوانترین و گەورەترین سەدیم كەلەئێمەوە دیارە پیێ ی ئەڵێن: (سەدیمی راوكەر، الصیاد، یان سدیم سیف الجبار: شمشێری گەورە: ناوی زانستی ($M_{42}$) .

بڕوانە وێنەی ژمارە ( ١٦ ).

ئەم سەدیمە ٦٠٠شەش سەدساڵی ڕووناکی لەزەوی یەوە دوورەو تەنها ئەم سەدیمە بەچاو ئەبینرێ. هەروەها هەندێ ئەستێرەی تازە دروست بووی تێدا بڵاوبوەتەوە کەبوونەتەهۆی تیشك دانەوەی سەرووی وەنەوشەیی بەهێز.

## ((ئەستێرە زۆر گەورەکانو سەرووی ئەستێرە زۆر گەورەکان))

ئەم جۆرە ئەستێرانە لەئەستێرەکانی پێشوو کەباسمانکرد زۆر زۆر گەورەترن.

هەروەها سوورن، لەبەرئەوە پێ یان ئەڵێن ئەستێرە سوورە گەورەکان.

تیرەی هەریەکە لەم ئەستێرانە ٣٠-١٠٠سەد ملیۆن کیلۆمەترئەبێت.

بەڵام سەرووی ئەستێرە زۆر گەورەکان هەندێ ئەستێرەی سووری زۆر زۆر گەورەترهەیەو زۆر زۆر ڕووناك تریشن.

ئەمانە گەورەترین ئەستێرەن بەڵام گەرمی و چڕیان کەمترەو هەندێکیان ٣٠ سی ملیۆن جار لەخۆر گەورەترن.

ئەم ئەستێرانە چەندەها ملیۆن ساڵ گەرما ئەدەن و بەشێك لەبارستایی یان کەم ئەبێتەوەو هەندێ تەقینەوەیان تێدائەبێت و پێ یان ئەڵێن

ئەستێرەی تەقیو یان ((نۆڤا)) **Nova** . ئەم تەقینەوانە بەردەوام ئەبن تاکوو هەموو ئەستێرەکە ئەتەقێتەوەو پارچە پارچەئەبێت لەبۆشایی گەردوون داو پێ ی ئەڵێن (سوپرنۆڤا) یان سەرووی تەقینەوەکان.

ئەمەش کاتێك ڕووئەدات کەپلەی گەرمای ناوەندی ئەگاتە هەزاران ملیۆن پلەی سەدی.



وێنەی ژمارە ( ١٦ ) سەدیمی ڕاوکەر (الصیاد )

## ((ئەستێرە کورتە باڵا سپی یەکان))

ئـەم جـۆرە ئەسـتێرانە (مـردوون) چـونکە دڵـی نـەوەوی و گـەرمیەیان وەسـتاوە، بەدەوریاندا رەگەزی قورس کۆبوونەتەوەو لەشی ئەم ئەستێرانە ساردبوەتەوە زانستی نـوێ ئەسـتێرەی زۆری لـەم بابەتـە دۆزیوەتـەوە تیرەکـەیان لـەنیوەتیرەی زەوی تـاکوو چوارتیرەی زەوی ئەبێت.

واتە هەندێکیان نیوەی زەوی گەورەن و هەندێکیان چوارئەوەندەی زەوی ئەبن.

ئـەم ئەسـتێرانە هەرچـەندە مـردوون بـەڵام تیـشك ئـەدەن و نـابینرێ (تیـشکی ژێـر سـووری گـەرمی) تـاکوو ماوەیـەك ئـەم تیـشکە ئەدەنـەوە پاشـان ئەوەسـتێ و ئـەبن بەئەستێرەیەکی کورتە باڵای رەشی سارد.

## ((ئەستێرە نیۆترۆنیەکان))

ئـەم جـۆرە ئەسـتێرانە لەئـەنجامی تەقینـەوەی ((سـۆپەرنۆڤا)) دروسـت ئـەبن، بەئەستێرەی ((شەپۆلاوی)) ناوئەبرێن لەلایەن زاناکانەوە.

چوونکە زۆر بە رێك و پێکی ئەسـوڕێنەوە بەدەوری خۆیاندا و شـەپۆلی ڕادیـۆوی ئـەنێرن، لـە زەوی وەریـان ئـەگرین . هەریـەکێ لـەم ئەسـتێرانە لـە تـەنها چـرکەیەکدا ٢٠٠دووسـەد جـار بـە دەوری خـۆی دا ئەسـوڕێتەوە ..ماشـاء اللە لـەم دروسـت کـراوە سەرسوڕهێنەرە کە پەروەردگار دروستی کردوە . چڕی ئـەم جـۆرە ئەسـتێرانە لـە یـەك ئینج سێ جا دا ١٠,٠٠٠,٠٠٠ دە ملیۆن تەن ئەبێت ، بەڵام هەندێ لە زاناکان ئەڵێن :

چڕی ئەم جۆرە ئەستێرانە ١٠٠,٠٠٠,٠٠٠ سەد ملیۆن تەن ئەبێت لەیەك سـنتیمتر سێ جادا واتە ١سم[٣] .

لـەم ئەسـتێرانەدا بوومەلـەرزە ڕووئـەدات، لـەم کاتـەدا ووزە ئەداتـەوە ئـەم ووزەیـە بەرامبەرە بەهەموو ووزەی خۆر لە ماوەی یەك ساڵی تەواودا خۆریش لەیەك چرکەدا ٤ چوار ملیۆن تەن ووزە ئەدات واتە ساڵێك بکەین بە چرکە (پانیە) لێکی بـدەین لـە چـوار ملیۆن تەن یەکسانە بە ووزەی تەنها بوومەلەرزەیەکی ئەم ئەستێرانە .

زاناکان تاکوو ماوەیەك لەمەوپێش ڕایان وابوو ژیان لەم جۆرە ئەستێرانە دا هەیە ، لەبەر ئەوەی شەپۆلی ڕادیۆوی ڕێك و پێك ئەنێرن بەلاّم دوای ئەوەی لە هەندیّ ئەستێرەی ترەوە شەپۆلی ڕادیۆوی ڕێك و پێکیان وەرگرت ئەو ڕایەیان گۆڕی، بەتالّیان کردەوە .

# کوازاراکان (یان) کۆزاراکان

ئەم تەنە گەردوونیانە لە سەرەتای شەستەکانەوە یەکەمیان دۆزرایەوە لەلایەن زانایانی گەردوون ناسی یەوە، بۆچوونی زاناکان بە گوێرەی زانستی گەردوون ناسی ئەم تەنە گەردوونیانە ئەستێرەی زۆر زۆر گەورەن وە زۆر زۆریش ڕووناکن یەکەمیان کە دۆزرایەوە بۆ زاناکان دەرکەوت کە ٤٠٠٠ چوار هەزار ملیۆن ساڵ دوای تەقینەوەی گەورە تیشکی بەرەو زەوی هاتووە، ماوەی ١٦,٠٠٠ شانزە هەزار ملیۆن ساڵ ئینجا ئەو تیشکەی گەیشتووەتە سەر زەوی واتە ئەم کۆزارایە شانزە هەزار ساڵی ڕووناکی لە زەوی یەوە دوورە !! فراوانی گەردوون لەمە زیاترە هەروەکو پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی :

﴿وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ﴾ (الذاريات:٤٧)

واتە: ئاسمانمان بەدەستی خۆمان دروست کرد و خۆمان فراوانی ئەکەین ، زاناکان بۆ کۆزارا ئەم هێمایەیان داناوە ..OH471 . کۆزاراکان ئەم ڕەوشتانەی خوارەوەیان هەیە :

١-هێزی تیشکی ڕادیۆوی زۆر زۆر بەهێزیان تێدایە ..ئەم تیشکانە کەلەیەك کۆزاراوە دێن بەرامبەرن بە تیشکی ملیۆن ملیۆن ئەستێرەو پاشان تیشکەکە ئەبێت بە ووزە .

٢-ئەو ڕووناکی یەی کە لە تەنها کۆزارێکەوە دێت بەرامبەرە بە ڕووناکی هەزاران ملیۆن ئەستێرە لەناو سەدان گەلە ئەستێرەداو بارستایی یەك کۆزارا ٣٪ بارستایی گەلە ئەستێرەیەك ئەبێت ...

٣-دروست بوونی کۆزاراکان هێشتا بە تەواوی ساغ نەبووەتەوە ئایا ئەمانە جۆرە سەدیمێکن ؟یان کۆمەڵە ئەستێرەن یان گەلە ئەستێرەن ؟یان تاکە ئەستێرەی هەرە گەورەو هەرە ڕووناکترینی گەردوونن؟

هەرچەندە بۆچوونی زاناکان ئەوەیە :

کۆزاراکان گەورەترین و ڕووناکترین و دوورترین تەنی یان ئەستێرەی گەردوونن

٤-كۆزاری ٣س[٩] نزیكەی دە هەزار ملیۆن ساڵی ڕووناكی لە زەوییەوە دوورە ئەكەوێتە لێواری گەردوونەوە بەگوێرەی ڕای زاناكان، بە خێرایی ٢٤٠٠٠٠ كم پانیە ئەڕوات واتە لەیەك چركەدا ٢٤٠٠٠٠دووسەدو چل هەزار كیلۆمەتر ئەڕوات.

زاناكان ئەڵێن گەردوون لە سەرەتای دروست بوونیەوە تاكو ئێستا سێ ئەوەندەی جارانی فراوان بووە، ئەم فراوان بوونەش بەردەوامە !!!فەرموودەی پەروەردگارە، زۆر ڕاستە فراوانە، زۆرتریش فراوان ئەبێت ( وإنا لموسعون) هەروەكو باسمان كرد .

**زاناكان زۆر زۆر لەم تەنە گەردوونیانە سەرسامن و ئەڵێن :**

(كارگەی هێز) **Power house** لە ناوەڕاستی كۆزاراكاندا كە ووزە ئەدات و ئەسووتێ بەرامبەرە لەگەڵ درەوشانەوەی ڕووناكی سەد گەلە ئەستێرە .بەمەرجێك تەنها كۆزارایەك لە هەموو كۆمەڵەی خۆر گەورەترە .

بەڵام لەچاو گەلە ئەستێرەدا زۆر بچووكە بڕوانە وێنەی چەند كۆزارایەك

**بڕوانە وێنەی ژمارە (٢٠،١٩،١٨،١٧ )**



وێنەی ژمارە ( ١٨ ) وێنەی ( کۆزارا / مارکانی ) ٢٠٥




وێنەی ژمارە ( ١٧ ) وێنەی کۆزارا




وێنەی ژمارە ( ١٧ ) وێنەی کۆزارا 3C273



وێنەی ژمارە ( ١٧ ) وێنەی کۆزارا 3C48

# ئەشکەوتە ڕەشەکان

هەندێ لە ئەستێرە هەرە گەورەکان ئەمرن یان مردوون لە ئەنجامی تەواو بوونی ووزەیان و ئەبنەوە بە دوو تەنی گەردوونی

١- ئەشکەوتی ڕەش ٢- ئەستێرەی سپی کورتەباڵا

ئەگەر یەکێ لە ئەستێرە زۆر گەورەکان مرد کە بارستایییەکەی لە ¼ ( ڕێژەی شاندارا ) کەمتر بووبێت ئەبێت بە ئەستێرەی سپی کورتە باڵا .

بەڵام ئەگەر بارستایی ئەستێرە زۆر گەورە مردووە کە لە ڕێژەی شاندرا ¼ زیاتر بوو بێت ئەبێت بە ئەشکەوتی ڕەش لە گەردوون دا .

ئەم ئەشکەوتە ڕەشانە هێزی لە بن نەهاتوو کۆتایی نەهاتوویان هەیە بەجۆرێك هەرچی تەنێکی گەردوونی نزیکیان بێتەوە قووتی ئەدەن هەرچەندە ئەوتەنە گەردوونیە زۆر زۆر گەورە بێت یان خێرایی لە ڕووناکی زیاتر بێت ، تەقینەوەو هێزی پاڵە پەستۆی بۆ ناوەوە زۆر زۆرەو زۆر بەهێزە ، هێزی ئەم ئەشکەوتە ڕەشانە لە هەموو هێزەکانی پێشوو کە باسمان کرد زیاترە .

ئەم ئەشکەوتە ڕەشانە بوونەتە جێگەی سەرسوڕمانی زاناکان ئەم ئەشکەوتە ڕەشانە ئەکەونە ناوەڕاستی گەلە ئەستێرەکانەوەو بوون بە گۆڕستانی ئەستێرەکان .

چوونکە هەر ئەستێرەیەك یان تەنێکی گردوونی نزیکیان بێتەوە هەڵی ئەلووشن و ئەیهاڕن و لەمادەوە ئەگۆڕێ بە شتێکی نەزانراو، بەگوێرەی ڕای زانایانی گەردوون ناسی ، ئەم جۆرە شتە نەزانراوە کە لە ئەنجامی هاڕینی ئەستێرەو تەنی گەردوونی لەناو ئەشکەوتە ڕەشەکان دا دروست ئەبێت هێشتا زاناکان نازانن ناوی بنێن چی ؟

تەنها ئەوەندە ئەزانن مادە هەویەکەی بزر ئەکات لە ئەشکەوتە ڕەشەکان دا و لە شێوەی مادەدا نامێنێتەوە ...

هێزی ڕاکێشانی ئەم ئەشکەوتە ڕەشانە ئەوەندە بەهێزە ئەگەر تەنێکی گەردوونی خێراییەکەی ٣٠٠٠٠٠ سێ سەد هەزار کیلۆ مەتر بێت لە چرکەیەکدا ، ڕای ئەکێشێ بۆ ناوی خۆی و ئەیهاڕێ و قووتی ئەدا ئەمە بە مەرجێ ئەو تەنە گەردوونیانە چووبنە خولگەی ئەو ئەشکەوتانەوە واتە نزیکیان بووبنەوە .

له كاتی هاڕینی ته‌نه گه‌ردوونیه‌كان له ناو ئه‌شكه‌وته ڕه‌شه‌كاندا ده‌نگی گه‌وره‌و ته‌قینه‌وه‌ی به‌هێز دروست ئه‌بێت وته‌نه‌كه بۆ ناوه‌وه ئه‌ڕوات و شه‌پۆلی كهرو موگناتیسی زۆر به‌هێز دروست ئه‌بێت ، ئه‌مه‌ش له‌وه ئه‌چێ چۆن ئه‌ژدیهایه‌ك باڵنده‌یه‌كی گه‌وره به ده‌میه‌وه بێت و بیه‌وێ قووتی بدات باڵ ڕائه‌وه‌شێنێ‌و هه‌وڵ ئه‌دات خۆی ڕزگار بكات به‌ڵام بۆی ناكرێ و ئه‌ژدیهاكه هه‌ر قووتی ئه‌دات .

زاناكان ئه‌ڵێن ئه‌شكه‌وته ڕه‌شه‌كه‌ی ناوه‌ڕاستی گه‌له ئه‌ستێره‌ی كاكێشان تاكوو ئێستا سه‌د ملیۆن ئه‌ستێره‌ی زیاتر قووت داوه كه له‌خۆر گه‌وره‌تر بوون كه‌وا بوو ئه‌گه‌ر زه‌وی بكه‌ینه ده‌می ئه‌شكه‌وتێكی ڕه‌شه‌وه هه‌روه‌كوو خاڵێكه له‌سه‌ر هه‌موو ڕووبه‌ری ئه‌و ئاسمانه‌وه لێمانه‌وه دیاره ، به‌ڵام زاناكان ئه‌ڵێن ئه‌و خاڵه‌ش نامێنێ و به ته‌واوی ئه‌فه‌وتێ !!

كه‌وابوومادە له ئه‌شكه‌وتی ڕه‌ش دا به‌ماده‌یی نامێنێ و ئه‌بێ به‌شتێكی تر زاناكان سه‌ر گه‌ردانن نازانن ناوی چی لێ بنێن .

هێزی ڕاكێشان له ئه‌شكه‌وتی ڕه‌ش دا ئه‌وه‌نده به‌هێزه هه‌موو شتێك ڕائه‌كێشێ‌و قووتی ئه‌دات، گه‌رمابێت ، ده‌نگ بێت ، ڕووناكی بێت ، هه‌تاكو كاتیش قووت ئه‌دات .

بۆ نموونه زاناكان ئه‌ڵێن كات هێواش ئه‌بێته‌وه له‌و شوێنانه‌دا كه هێزی ڕاكێشان زۆره‌و كات خێرا ئه‌بێته‌وه له‌و شوێنانه‌دا كه هێزی ڕاكێشان كه‌مه .

به‌م جۆره زاناكان ئه‌ڵێن ، یه‌ك ئه‌شكه‌وتی ڕه‌ش ئه‌توانێ هه‌موو گه‌ردوون قووت بدات و بیهاڕێ !!! و هه‌موو گه‌ردوون ببێت به یه‌ك ئه‌شكه‌وتی ڕه‌ش .

زانایانی فیزیا گه‌ردوونیه‌كان له په‌یمانگه‌ی كالیفۆرنیای تكنولۆجی ئه‌ڵێن :

ئه‌شكه‌وته ڕه‌شه‌كان تونێلی كاتین یان ده‌رگای چوونه ژووره‌وه‌ن بۆ گه‌ردوونه‌كانی تر !!!!.

له گه‌ردووندا په‌روه‌ردگار بۆ هه‌موو شتێك به‌رامبه‌ره‌كه‌ی دروست كردووه ئه‌گینا گه‌ردوون ڕاوه‌ستاو و به‌رده‌وام نه‌ئه‌بوو زوو ئه‌فه‌وتا .

هه‌روه‌كوو به‌سته‌ڵه‌كی باكورو باشوور له هێزی ڕاكێشان دا .

هه‌روه‌ها ساردو گه‌رم + ، − له كاره‌بادا .

لەبەرئەوە لە ناوەڕاستی گەلە ئەستێرەکاندا ئەم دڕندە ڕەشانەی دروست کردووە مەگەر پەروەردگار هەر خۆی بزانێ بۆچی دروستی کردوون و لەو دیویانەوە چی هەیە ؟ یان لە ناویان دا چ باسە ؟!!!.

مرۆڤ کە ئەمانە دەبیستێ جالەو ئایەتە تێدەگات کە خوای گەورە دەپرسێ: (أن الله يمسك السموات والارض ان تزولا، ولئن زالتا ان مسكهما من احد من بعده، إنه كان حليماً غفوراً)

واتە: خوای پەروەردگار ئاسمانەکان و زەوی ڕاگرتووە بۆ ئەوەی ئاوا نەبن و تیانەچن، خۆ ئەگەر خوای پەروەردگار دەستی لێ بەردان بۆ ئەوەی ئاوابن کێ دەتوانێ جگە لەخوا بیانگرێتەوەو نەیەڵێت ئاوابن، بەدڵنیاییەوە خوا بەئارامیشەو لێبوردەشە!!

# ئەشكەوتە سپی یەكان

لە لێوارەكانی گەردوون دا پەروەردگار ئەشكەوتە سپی یەكانی دروست كردووە ، كەئیش و كاریان پێچەوانەی ئەشكەوتە ڕەشەكانە .

زاناكان ئەڵێن :

ئەشكەوتە سپی یەكان نەبوونایە گەردوون هەرگیز بەم شێوەیە نەئەمایەوە و تێك ئەچوو ، تەنها ئەشكەوتێكی ڕەش بەس بوو هەموو گەردوون قووت بدات .

ئەشكەوتە سپییەكان زۆر ڕووناكن ، هەروەكوو زاناكان چۆن نازانن مادە چی لێ دێت لە ئەشكەوتە ڕەشەكاندا هەروا نازانن ئەو مادەیە لە كوێ وە دێ لە ئەشكەوتە سپییەكاندا !!!

كەوا بوو مادە هەویەكەی لە ئەشكەوتە ڕەشەكاندا بزر ئەكات و لە ئەشكەوتە سپییەكان دا هەویەی تازەی بۆ ئەكرێتەوە .

دیسانەوە زاناكان ئەڵێن نازانین سەرچاوەی ئەو مادەیە كە دروست ئەبێت لە ئەشكەوتە سپییەكاندا كامەیە و لە كوێ وە دێت !!.

كەوابوو مادە لە ئەشكەوتە ڕەشەكاندا مردوو لە ئەشكەوتە سپییەكاندا زیندوو بوویەوە ، بەو جۆرەی زاناكان باسی ئەكەن .

هەروەكوو ئەڵێن : یەك ئەشكەوتی ڕەشی كاكێشان تاكوو ئێستا سەد ملیۆن زیاتر ئەستێرەی قووت داوەو نازانن مادە كەیان چی لێ هاتووە ...

بەڵام لە ئەشكەوتە سپی یەكان دا بەرامبەری ئەوان مادەی نوێ دروست بوەتەوە!!!

كەوابوو لەم دوو ئەشكەوتەدا :

١- ڕەش وسپی لەیەكەمیان دا مادە ئەمرێت لە دووەمیان دا زیندوو ئەبێتەوە .

كەوابوو مردن و زیندوو كردنەوەی هەموو ئادەمیزاد پێویستی بە كاری تەنها دوو ئەشكەوت نی یە ئیتر ئەمە ووتەی زانستەو فەرموون قورئانی پیرۆز بخوێننەوە هەرچی باسی كراوە هەمووی ووتەی ئەو دەسەڵاتەیە ئەم گەردوونە سەیرو سەمەرەیەی دروست كردووە .

هەندێ لە زاناکان ئەڵێن ئەشکەوتی ڕەش هەیە قەبارەی ملیۆن ملیۆن جار لە خۆر گەورەترە !!!.

(ئەستێرەکان لە چی دروست بوون و چۆن دروست بوون وچۆن ئەمرن)

ئادەمیزاد لە خۆڵ دروست کرا ، هەروەها ئەستێرەکانیش لە خۆڵ دروست کراون ، بەلاّم لە کام خۆڵ ؟ بێگومان هەروەکوو باسمان کرد هەردووکیان لە خۆڵی گەردوونی و هەوری گەردوونی بوون ودروست کران بە فەرمانی پەروەردگار ، چونکە گەردەکانی خۆڵی گەردوونی ئەبن بە پارچەی جیاوازو یەك ئەگرن لەگەڵ هەورە گەردونیەکان (هەروەکو چۆن گەردیلەکانی هەڵم یەك ئەگرن دڵۆپە دڵۆپە ئەبن بە باران )

ئەستێرەکان لە هەموو شوێنێکی گەردووندا لە دایك نابن بەڵکو شوێنی تایبەتیان لە بۆشایی گەردوون دا هەیە ، واتە شوێنی لە دایك بوونیان هەیە کە ئەکەوێتە ناو (سەدیمە گازی‌یە گەورەکان و ڕۆشنەکانەوە) ئەو سەدیمە گەورانە هەندێکیان پانی‌یان لە ٢٦ ساڵی ڕووناکی زیاترە کۆمەڵەی خۆری ئێمە پانیەکەی ١١ یانزە کات ژمێری ڕووناکی‌یە !!!کەوابوو ئەم هەورە خۆلاّوی‌یە گەردوونی‌یانە کاتێك گەردەکانیان یەك ئەگرن ئەبن بە پارچە پارچەی جیاواز تاکو هۆکارێکی دەرەوە کاریان ئەکاتە سەر پاڵەپەستۆیان ئەخاتە سەر بە جۆرێك هێزی ڕاکێشانی ناوخۆی هەورەکان وائەکات پارچەکان لە یەکتر جیائەبنەوەو هەرپارچەیەك ئەبێت بە تەنێکی سەربەخۆ کە بریتی‌یە لە مادەی گەردوونی و ئەسوڕێتەوە بە دەوری خۆیدا هەر بەشێك لەم بەشانە ناوکە بۆ ئەستێرەیەك لە ئەنجامی هێزی ڕاکێشانی ناوخۆی ئەم ناوکەدا بەرە بەرە گەورەتر ئەبێت بەهۆی ئەو تۆزە گەردوونیەوە لە دەوری ناوکەکەوەیە ، بەم جۆرە پاڵەپەستۆی ناوەوە زۆر ئەبێت، لێکخشان ولێکدانی گەردەکان بە تایبەتی لە ناوەڕاستدا پلەی گەرمای زۆر ئەکات ، بەم جۆرە تیشکەکان دوور ئەکەونەوە لە ئەستێرە نوێ یەکە ، ئەمەش یارمەتی کەم بوونەوەی پاڵەپەستۆی ناوخۆی ئەدات و هێزی ڕاکێشان زۆر ئەبێت بۆ قەبارەو بارستایی ..

کاتێ پلەی گەرمای ناوەندی ئەوەندە بەرز ئەبێتەوە تاکوو ئەبێتە هۆی یەکگرتنی گەرمای نەوەوی ، هیدرۆجین ئەسوتێ و ئەبێ بە هیلیۆم ، کاتێ ئەمە ڕووئەدات لە

خۆیەوە ووزە دروست ئەبێت (بێ گومان بە فەرمانی پەروەردگار) ئەبێت بە سەرچاوەی گەرماو ڕووناکی لە ئەستێرەکەدا ...ئەمەش بەردەوام ئەبێت تاکو ئەستێرەکە کێشی و بارستایی ڕێك ئەبێت و ئەگونجێ .

ئەمەش یەکسانی هێزی پاڵەپەستۆی گەرمایە بۆ دەرەوە لەگەڵ هێزی ڕاکێشان بۆ ناوەوە ، خۆریش ئەستێرەیەکە لەم جۆرە ئەستێرانەو ئێستا لە تەمەنی لاوی دایە ، بەمەرجێ خۆر لە چرکەیەکدا چوار ملیۆن تەن گەرماو تیشك ئەڕژێتە بۆشایی ئاسمانەوە ، لەبەرئەوەی گازی هیدرۆجینی زۆرە زاناکان ئەڵێن : سەد هەزار ملیۆن ساڵی تر تەمەنی ماوە دوای ئەم ماوەیە بەرەو نەمان ئەڕوات ، کەوابوو بابزانین ئەستێرەکان چۆن ئەمرن .

دوای ماوەی تەواوبوونی ووزەی ئەستێرە ..پاشەڕۆکی ووزە سووتاوەکە لە ناوەندی ئەستێرەکەدا کۆئەبێتەوە هەروەکو هیلیۆم و ڕەگەزە قورسەکانی تر بەم جۆرە ئەستێرەکە پیر ئەبێت تاکوو هەموو گەرماو تیشك و ووزەی بەرەو نەمان ئەڕوات واتە دواهەناسەی ئەدات و ئەکوژێتەوە و ئەمرێت بەم جۆرە ئەستێرە ئەمرێت، ئەستێرەی تریش دروست ئەبێتەوە هەروەکو ئادەمیزادەکان !!!

ئەمە دەسەلاّت و نەخشەی پەروەردگارە لەسەرەتاوە تاکو ئێستاو دواتریش .

# گەردوون چۆن دەستی پێکرد ؟

## چەند فراوانە؟

## تەمەنی چەندساڵە؟

﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقاً فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلا يُؤْمِنُونَ﴾ (الانبياء:٣٠)

هەروەکوو باسمان کرد لە قورئانی پیرۆزدا ئەم ئایەتە ڕوونی ئەکاتەوە گەردوون چۆن دەستی پێ کرد و دروست کرا لە لایەن پەروەردگارەوە ..ئەمە فەرموودەی پەروەردگارە لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی بە خۆشەویست و نێراوی خۆی محمد(د.خ) کە ئاسمانەکان و زەوی یەك تۆپەڵ بوون، تەقاندمانەوە ئەم گەردوونەمان دروست کرد بەهۆی ئاوەوە هەموو شتێکمان زیندووکرد، ئایا زاناکان چی ئەڵێن لەم بارەیەوە ؟

<u>لابلاس:</u> زانای بەناوبانگ دەقی ئایەتەکەی کردووە بە ئینگلیزی و باوەڕی تەواوی پێ هێناوە هەروەکو باسمان کرد ، زانای گەردوونی بەلجیکی (ادورلومیر)لەساڵی ١٩٢٧تیۆری تەقینەوەی گەورەی دانا بۆ دروست بوونی گەردوون دوای خۆی زانا فیزیاویە گەردوونیەکان بایەخیان پێدا و پەرەیان پێدا .لەوانە : زانای فیزیاوی ئەمەریکی (جورج کاموف) بەم جۆرە ئەم تیۆرە دەم کوتی ئەوانەی کرد کە ئەیان گوت گەردوون ئەزەلی یە و دروست کراو نی یە ..

**ئەم تیۆرە ئەڵێت :**

ئەم گەردوونە فراوانە بیست ملیار ساڵ لەمەو پێش دروست کراوە ئەم تەمەنەش بە کرداری تیشك دانەوە لە مادەکانی گەردوونەوە کە زاناکان ئەزانن دۆزراوەتەوە ، هەروەها بە گوێرەی ئەم تیۆرە گەردوون دروست کراوە، ئەزەلی نی یە بەڵکو ئەوەی دروستی کردووە ئەزەلی یە ، واتە دروست کەری گەردوون و بوون و هەموو بوونەوەر ئەزەلی‌یە ئەمەش بەگوێرەی یاسای دووەمی (دینامیکی گەرمایی)..کەئەم یاسایە ئەڵێ :

گەرمی لە گەرمەوە ئەگوێزرێتەوە بۆ سارد ( لە گەرمای بەرزەوە ئەڕوا بۆ گەرمای نزم ) تاکو هەردوولایەن یەکسان ئەبن و گۆڕینەوەی گەرما ئەوەستێ.

ئەگەر گەردوون ئەزەلی بوایە و سەرەتای دروست بوونی نەبوایە ئێستا دەمێك بوو گۆڕینەوەی گەرما وەستا بوو نەگەردوون و نەژیان نەمابوون، هەموو شتێك لەناو چووبوو !!!

ئەم یاسایەی باسمان کرد بەڵگەی ڕاستەقینەیەو زاناکان ڕایان لەسەرە کە گەردوون دروست کراوەو ئەزەلی نی یە وە دروست کەری هەیە کە هێزو دەسەڵاتی تەواوی هەیە بەسەرداو زانایەکی زۆر بەرزو زانستی کۆتایی نەهاتووە .بێجگە لەمانە ئێمە هەموو شتێك کۆتایی ئەبینین .

وەکو مردنی خەڵك و مردنی شارستانیەکان، مردنی ئەستێرەکان و گیانلەبەران و ڕوەکەکان و کۆتایی هاتنی سەعات و ڕۆژو هەفتەو مانگ و ساڵ و تەمەن و هەموو شتێك ، کەوابوو کۆتایی هاتن و مردنی گەردوونیش ئەبێت هەروەکو لە کتێبی :

(الله يتجلى فى عصر العلم ) (ص ٨)[١] دانەرەکەی زانای بەناوبانگ :

(فرانك آللن) خاوەنی بڕوانامەی ماجستێرو دکتۆرا ئەم زانایە ئەڵێ :

((پێك هێنەرەکانی ئەم گەردوونە بەردەوام گەرماکەیان ئەڕوات و کەم ئەبێتەوە تاکوو کاتێك دێت هەمووی سارد ئەبێتەوەو پلەی گەرمای ئەگاتە (صفر المطلق) واتە هیچ گەرمای نامێنێ!!!.))

بەم جۆرە ووزە نامێنێ و هیچ ژیانێکیش نامێنێ.

لەبەرئەوە بۆمان دەرئەکەوێ هەمووشتێك کەدروست بووە لەگەردوون دا سەرەتای هەیەو کۆتایشی هەیەو دێت!!.

هەموو گەردوون و بوون و بوونەوەر دروست کراون و دروست کەریان هەیە کەئەزەلی یە و زانستی بێ سنوورەو هێزو دەسەڵاتی بێ کۆتایی یە ئەم گەردوونە دەستکردی خۆیەتی.

---

(١) ئەم کتێبە لەلایەن (٣٠) زانای ئەمریکیەوە نوسراوە کە خاوەنی (٣٠) پسپۆڕین (اختصاص) لەبوارە جیا جیاکانی زانستدا، هەریەکەیان لەڕێگەی زانستەکەی خۆیەوە بوونی خوای سەلماندووەو وەڵامی زانستی ئەوانە ئەدەنەوە کە مولحیدو بێدینن.

لێرەدا ووتەی ئەم زانایە تەواو.......

**ئێمەش ئەڵێین:**

ئەوهێزەی بەملیۆن ئادەمیزاد لە((حەیا مِنْ)) دروست ئەکات کەپڕی کەوچکە چا زیاترنین، یان لەتۆوێکی بچووکی داری ((توو)) ئەوداره گەورەیە دروست ئەکات و بەهەزاران ملیۆن داری تری لێ ئەکەوێتەوە.

ئەم گەردوونە گەورەو فراوانەی دروست کرد کەتاکوو ئێستا پێش کەوتووترین تەلەسکۆبی رادیۆوی نەی توانیوە سنووری دیاری بکات ئەوەندە فراوانە، هەزاران بەڵکو ملیۆنەهاجار ئەوەندەیتر زانست پێش کەوێت زیاتر فراوانی ئەم گەردوونە دەرئەکەوێ و سنووری دەرناکەوێ و کۆتایی نایەت.

**زاناکان ئەڵێین:**

ئەم گەردوونە فراوانە کاتی خۆی دروست کراوەو نەخشە کێشراوەو خراوەتە ناو گەردێکی زۆر گەورەوە کەلە $10^{79}$ دەتوان حەفتاونۆ گەردی نیوترۆنی پێك هاتووە، واتە ژمارە(١) حەفتاونۆ سفر لەبەردەمیا بێت، پاشان ئەم گەردە گەورەیە تەقێنراوەتەوە کەپلەی گەرمای هەزاران ملیۆن پلەی سەدی بووەو تیشکی زۆر بەهێزی داوەتەوەو ئەمە تەقینەوەی گەورەبووە بۆ دروست بوونی گەردوون و کات و شوێنیش دروست بوون لەگەڵیا.

کەوابوو ئێمەیش بۆمان هەیە پرسیاربکەین:

نەخشەی گەردوون کێ دایناوەو ڕێکی خستووە؟

کێ خستیە ناو گەردە گەورەکەوە؟

کێ گەردەکەی تەقاندەوە؟

ئەمانە هەمووی بەفەرمانی پەروەردگاربوو چونکە:

ئەگەر تۆپێك لەشوێنێکی تەختایی دابنێین، تاکوو هۆیەکی دەرەوە نەبێت پاڵی پێوەبنێت ناجوولێ.

واتە ئەگەر ئەوگەردە گەورەیە تۆپەکەبێت بەبێ هۆیەکی دەرەوە ناجووڵێت بێگومان نەئەتەقیەوە، کێ تەقاندیەوە ئەم گەردوونە گەورەو فراوان و ڕێك و پێکەی لێ

دروست کرد؟ بێ گومان ئەوهێزەبوو نەخشەی کێشاو خستیە ناوگەردە گەورەکەوە!!!.

چونکە هێز پێویستە بۆ دەرهێنان و دروست کردنی، ئەوشتانەی ئەیان بینین کەزیرەکی و توانای بێ سنوور بێت.

**لێرەدا پرسیاری تر دێتە پێشەوە:**

کێ زەوی لەم شوێنەی ئێستای داناوە، کە لە خۆرەوە ماوەکەی ئەوەندەیە بۆ ژیان لەبارە.......... ئەگەر نزیك تر بوایە ژیان نەئەبوو، ئەگەر دوورتریش بوایە دیسانەوە ژیان نەئەبوو..........؟

کێ ئەو خواریەی بەخشی بەزەوی کە خوار بسوڕێتەوە بۆ دروست کردنی چوار وەرز لە ساڵێکدا؟

کێ بەرگەبای بۆ زەوی دروست کرد تاکوو لەهەمووشتە زیان بەخشەکانی وەکوو تیشك و نیازك لەئاسمانەکانی گەردوونەوە دێن بۆزەوی بیپارێزێ و ژیان بەردەوام بێت لەسەری؟؟.

کێ پێویستی ژیانی هەموو بوون و بوونەوەری لەسەر ئەم زەوی‌یە دروست کرد بەملیۆن ملیۆن پێویستی بۆ ملیۆن ملیۆن زیندەوەر؟

هەندێ لەوپارچە ئەستێرانە گەورەو کلك دارن پێ یان دەڵێن(مُذَنَّبْ) یان کلکدار

**بڕوانە وێنەی ژمارە( ٢١ )**

ئەم کلکدارە جوانە لەساڵی ١٩٥٧ز بەئاسمانەوە دەرکەوت لەماوەی چەندهەفتەیەکدا بەهێواشی و لەسەرخۆ روونـاکی نەما بەهۆی بەرزبوونەوەو گەڕانەوەی بۆ قوولایی شوێنە ساردەکانی بۆشایی ئاسمانە دوورەکان لەنێوان ئەستێرەکاندا ئەم وێنەیە لەڕوانگەی (هبل) وەرگیراوە.

کێ ژمارەی ئەلەکترۆناتی ڕێکی ژمارەی پڕۆتۆنات دروست کرد بەبێ زیاد و کەم لەهەموو گەردوون دا؟

بۆچی ئەلەکترۆن بارگەی کارەبایی ساردی لەسەرەو پڕۆتۆن بارگەی کارەبایی گەرمی لەسەرە؟

ئەگەر تەنها یەك ئەلەكترۆن لەگەڵ یەك پرۆتۆن لەیەك بدەن یان زیادوكەم بكەن هەموو گەردوون تێك ئەچێ و ئەفەوتێ لەماوەی چەند چركەیەك دا!!!!...

ئەی چۆن زیادەی ئەلەكترۆنەكان یان پرۆتۆنەكان نەماو ڕێك وەستان؟ كێ ئەم نەخشەیەی كێشاو ئەم گەردوونە فراوان و سەرسوڕهێنەرەی دروست كرد؟

بێ گومان پەروەردگارە.

هەموو زانایەك لەزاناكانی زانستی ئەم راستی‌یە ئەزانن و ووشەی (باوەڕ) لەبەرچاویانە، چونكە باوەڕهێنان بەپەروەردگار بۆ زاناكان زۆر زۆر پێویستەو هەموو ئادەمیزاد هەر لەمناڵی یە وە باوەڕی هەیە پەروەردگارێك دروست كەریەتی.

هەروەكوو پەروەردگار لەقورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَعْلَمُونَ﴾ (الروم: ٣٠) .

كەوابوو زانیمان گەردوون لەتەقینەوەی گەردێكی زۆر گەورە لەدایك بووەو كات و شوێنیشی لەگەڵ لەدایك بوون.

هەندێ ئەڵێن:

مادەی گەردوون لەسەرەتاوە لەبۆشایی‌یەكی بێكۆتایی‌دا بووە، كاتێ تەقیوەتەوە پارچەكانی ئەو بۆشایی‌یە فراوانەیان گرتووەتەوە.

**ئەم قسەیە هەڵەیە:**

چونكە پێش دروست كردنی گەردوون بۆشایی نەبووە، شوێن نەبووە، كات نەبووە.

ووشەی كات و شوێن بەستراون بەیەكەوە واتە:

پێشەوای ئیسلام محمد (ﷺ) راستی فەرمووە:

(كانَ اللهُ وَلَمْ يَكُنْ شَيءٌ قَبلَهُ) ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی دەكات و ماناكەشی ئەوەیە كە خوای گەورە هەبوو پێش ئەو هیچ شتێك نەبوو.

کەوابوو:

بوون دروست بوو لەنەبوونەوە، لەتەقینەوەی گەورەدا کەلەکاتێکی زۆرکەم دا ڕووی دا دروست بوو لە ١٠٠٠٠٠ سەدهەزار بەشی چرکەیەك، یەك بەشی خایاند، بوون دروست بوو واتە لەچاوتروکاندنێك کەمتریش!!!.

ئەوەتا لەقورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ وَمَا أَمْرُنَا إِلَّا وَاحِدَةٌ كَلَمْحٍ بِالْبَصَرِ﴾(القمر: ٤٩-٥٠)

بەم جۆرە گەردوون دروست کراوە لەلایەن پەروەردگارەوە:

بەبێ وێنەو نەخشە، بێ یاسا، بێ زەوی، بێ ئاسمان، بێ خۆر، بێ ئەستێرە و مانگ، بێ گەلەئەستێرە، بێ مادە، بێ ووزە، بێکارەبا، بێ رووناکی، بێ هێزی راکێشان، بێ هێزی نەوەوی، بێ ژیان، بێ مردن، بێ بوون، بێ نەبوون، بێ جوولان، بێ جوولانەوە، بێ ژمارە، بێ پێوانە، بێ زانست، بێ هاوکێشە، بێ کات، بێشوێن.......هتد

ئەڵێن جارێکیان منالێك تەماشای پەیکەرتاشێکی ئەکرد وێنەی ئادەمیزادێکی لەسەر بەرد هەڵ ئەکەند، کاتێ پەیکەرتاش وێنەکەی تەواوکرد...... منالەکە ووتی بەپەیکەرتاشەکە:

باشە تۆچۆنت زانی ناوی ئەوبەردە ئادەمیزادی تیایە؟

کەوابوو ئێمە نابێ ئەوقسە منالانەیە بکەین کەمنالەکە کردی و بکەوینە هەڵەوە.

چونکە ئادەمیزادەکە لەناو بەردەکەدا نەبوو بەڵکو وێنەی ئادەمیزادەکە لەناو مێشکی پەیکەرتاشەکەدابووە!!!.

کەوابوو گەردوون لەناو مادە دانەبووە بەڵکو وێنەی مادە کێشراوە بەهێزوبیری پەروەردگار.

بەتواناو دەسەلات و زانینی خۆی ئەم گەردوون و بوون و بوونەوەرەی نەخشەکێشاو دروستی کرد، بەم شێوە ڕێك و پێك و ووردەکاری‌یەوە.



وێنەی ژمارە ( ٢١ ) یەکێك لە ئەستێرە کلکدارەکان

**بەڵام هەندێ کەس ئەڵێن :**

مادە ووزە چۆن لەنەبوونەوە دروست بوون؟ ئێمە چۆن تەماشای وێنەیەك بکەین لەنزیکەوە تاکو ماوەیەك وێنەکە ئەبینین و ئەیناسین بەڵام زۆر دوورکەوتینەوە وای لێ دێت وێنەکە لەبەرچاومان بزرئەبێت و دیارنابێت.

هەرچەندە وێنەکە بەرامبەرمانە و زۆر لەدوورەوەیە بەڵام نایبینین.

کەوابوو مێشکمان هەروەکو چاومان تاماوەیەك زانستمان هەیە شتەکان دروست بوونیان بزانین لەبەر ئەوە لەزۆر دوورەوە هیچیان لێ نازانین!!!!

هەروەکو پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿ وَيَسْأَلونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلاً ﴾ (الاسراء: ٨٥)

کەوابوو ئێمە تێ ناگەین لەهەموو شتێك لەگەردوون داو لەدروستکراوەکانی پەروەردگار هەرچەندە زانستمان هەبێت.

هەروەکو پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿ مَا أَشْهَدْتُهُمْ خَلْقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلا خَلْقَ أَنْفُسِهِمْ وَمَا كُنْتُ مُتَّخِذَ الْمُضِلِّينَ عَضُداً﴾ (الكهف: ٥١)

لەوکاتەوە گەردە گەورەی گەردوون تەقیوەتەوە گەردوون دەستی کردووە بەفراوان بوون و بەردەوامە لەفراوان بوون و هەرچەند فراوان ئەبێت پلەی گەرمای نزم ئەبێتەوەو چڕی کەم ئەبێتەوە.

## زاناکان ئەڵێن:

دوای چرکەیەك لەدروست بوونی گەردوون ١٠٠٠٠° دەهەزار ملیۆن پلەی سەدی گەرمای کەم بووەتەوەو چڕی ئەوەندە کەم بووەتەوە نیۆترۆنەکان و ئەنتینیۆترۆنەکان دەستیان کردووە بەجووڵانەوەو لەبەردەمیاندا هیچ بەربەستێك نەماوە!!!

لێرەدائەبێ ئەوە بزانین گەردوون ئەکشێ و لەهەموو شوێنێکیدا ئەم کشانە هەیەو بەردەوامە.

پاشان زنجیرەیەك یەکگرتنی چڕ دەستی پێ کرد، هەروەها زنجیرەیەك لەگۆڕانی مادە بۆ ووزە و لە ووزەوە بۆ مادە دەستی پێ کرد.

لەیەکەمین ساڵی ئەم تەقینەوە گەورەیەدا پلەی گەرما چەندین ترلیۆن پلەی سەدی بووە ئەو گەردیلانە دروست بوون کەئەم جیهانەی ئێمەیان لێ پێك هات، هەروەها لەم گەردانە هەورە گازی و تۆزاوی و نەوەوی یەکان دروست بوون، لەم هەورانەش گەلە ئەستێرە دروست بوون.

بەم جۆرە گەردوون فراوان بوو هەروەها بەردەوام فراوانتر ئەبێت تاکوو بەفەرمانی پەروەردگاری کۆتایی دێت و ژیانی نوێ و گەردوونی نوێ پەروەردگار دروستی ئەکاتەوە.

لەگەردێکـەوە تـاکوو گەلەئەسـتێرەکان لەوکاتـەوە دروسـت بـوون لەجوولانـەوەی بەردەوام دان و ناوەستن بەخێرایی یەکی وا ئەقڵمان نایبڕێ و نایزانێ.

ئەم جوولانەوەیە نزیکی خێرایی رووناکی ئەکاتەوە ، بەڵام دوای ماوەیـەکی زۆر زۆر ئەم جوولانەوەیە دەسـتی کرد بەکەم بوونـەوە بەهۆی بەرەنگاربوونەوەی هێـزی راکێشان.

زاناکـانی گـەردوون ناسـی بـەهۆی ئـامێری زۆر زۆر پـێش کـەوتووەوە دەربـارەی فراوان بوونی گەردوون ئەڵێن:

فراوانـی ئێستای گـەردوون زیـاترە لـە ۱۰,۰۰۰,۰۰۰,۰۰۰ دەهـەزار ملیـۆن سـاڵی رووناکی هـەروەها چێوەکەی ۱۲۵,۰۰۰,۰۰۰,۰۰۰سەدوبیست و پێنج هـەزار ملیـۆن ساڵی رووناکی یە ئەم زانایانە گەیشتوونەتە ئەنجامی ئەوە کەگەردوون بەبەردەوامی ئەکشێ و هەموو کاتێك لەفراوان بووندایە.

﴿ وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴾ (الذريات: ٤٧) )

﴿ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلا يَؤُودُهُ حِفْظُهُمَا وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ ﴾ (البقرة: ٢٥٥)

واتە: بەدەستی خۆمان ئاسمانمان دروست کردو فراوانی ئەکەین

ئەم فراوان بوونەی گەردوون بەجۆرێك فراوان ئەبێت کەماوەی دووری نێوان هـەموو تەنە گەردوونییەکان وەکو خۆی ئەمێنێتەوە لەگەڵ ئەوەشـا ئـەم فـراوان بوونـە چـەقی نییە. واتە گەردوون چەقی نی یەو دیاری نەکراوە کەلەو ناوەنـدەوە کشانەکە دەسـت پێ بکات.

لەبەرئەوە ئەکرێت خاڵێك لەگەردوون دا بکرێـت بەچـەقی گـەردوون هـەروەکو گەلـە ئەستێرەکەی خۆمان (کاکێشان). ....

بـەم جـۆرە کـشان و فـراوان بـوونی گـەردوون هـەروەکو میزەلانێـك خـاڵی زۆری لەسـەربێت، پـێش فـوودان ئـەم خالانـە نزیـك لەیـەکترەوەن بـەڵام کـەفوومان تێکـرد خاڵەکان دوورئەکەونەوە لە یەکتر بەڵام بەهەمان رێژەی دووری.

((**لێرەدا دوو پرسیار دێتە پێشەوە**))

**١-ئایا گەردوون کۆتایی هەیە؟**

**٢-ئایا دیوارێك یان پەردەیەکی ئاسمانی هەیە سنوورێك بۆ گەردوون دیاری بکات؟ واتە ئایا سنووری هەیە؟.**

**بۆ وەڵامی ئەم دووپرسیارە خوێنەری بەڕێز دڵنیائەکەین کەهەموو زانایانی گەردوون ناسی بەهەموو زانستو ئامێرەکانیانەوە ئەڵێن: نەئێستاو نەپاشەڕۆژی نزیكو دوور ناتوانن سنووری گەردوون بدۆزنەوەو دیاری بکەن یان بەرگی گەردوون دیاری بکەن هەروەکوو بەرگەبای زەوی.**

**زۆر راستە چونکە پەروەردگار فەرموویەتی﴿وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلاً ﴾ (الاسراء:٨٥)**

**هەروەها فراوان بوونی گەردوون بەردەوامەی لەهەموو چرکەیەکدا تەنە گەردوونی‌یەکان لەشوێنێکدان چرکەی دوایی لەشوێنێکی‌تردان و دوورکەوتونەتەوە لەشوێنی پێشوویان.**

**زانای بەناوبانگ (بلیڤن) لەکتێبەکەی دا: (زانست تەماشای ئاسمان ئەکات) ئەڵێ:**

**گەردوون فراوانترو گەورەترە لەوەی ئێستا باسی ئەکەین و بەبیرمان دادێت!!! بەشەدوورەکانی گەردوون لەبۆشایی ئاسمان دا بەخێرایی یەك ئەڕۆن زۆر زۆر ترسناکە.....**

**هەروەها ئەم زانایە ئەڵێ:**

**گەردوون بەهەموو ئەستێرەو تەنە گەردوونی یەکانەوە کە لەژماردن نایەن هەموویان زۆر بەخێرایی ئەڕۆن هەروەکوو (بۆمبێکی تەقیو) وایە، پارچەکانی بڵاوئەبنەوە بەخێرایی یەکی زۆر زۆر کەهەرگیز ئادەمیزاد ناتوانێ بەبیری دابێت هەروەها ئەڵێ بەقەدەر نووکە دەرزی یەك لەو هەموو پارچانە زەوی یە کە ئەم هەموو خەڵکەی لەسەرئەژی........ ئەم ئادەمیزادە بچووکە لەسەر ئەم شوێنە بچووکە لەم گەردوونە فراوان و گەورەیەدا بەرامبەری هەموو ئەم دروست کراوە گەردوونی‌یانە وەستاوەو ئەیەوێ تێ بگات و هەوڵ ئەدات نهێنی یەکانی بزانێت..........**

پەروەردگاریش لەقورئانی پیرۆزدا مافی ئەوەی دیاریکردووە کەبۆمان هەیە بڕۆین بۆ ئاسمانەکان هەروەکو ئەفەرموێ:

﴿يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالْأِنْسِ إِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَنْ تَنْفُذُوا مِنْ أَقْطَارِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ فَانْفُذُوا لا تَنْفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَانٍ﴾ (الرحمن:٣٣)

واتە: (ئەی کۆمەڵی جنۆکەو ئادەمیزاد ئەگەر توانیتان بڕۆن بۆ ئاسمانەکان بڕۆن ناتوانن بڕۆن بەدەسەڵات نەبێ)

ئیتر دەسەڵات بێ گومان بەزانست دەست ئەکەوێ.

## (لەهەر چرکەیەکدابێت گەردوون وێران ئەبێت و تێك ئەچێت‌و رۆژی دوایی‌و زیندووبوونەوەو لێ پرسینەوە دێتە پێشەوە).

**زاناکان ئەڵێن:**

تێکچوونی گەردوون کاتی دیاریکراوی نی یە لەناکاودا وێران بوون‌و تێکچوونی گەردوون لەهەر چرکەیەکدابێت کاتی هات ڕووئەدات‌و هەموو گەردون وێران ئەبێت.

لەمەوپێش باسمان کرد کەبارگەی کارەبایی لەگەردوون دا یەکسانە بەسفر چونکە ژمارەی ئەلەکترۆناتی هەموو گەردوون یەکسانە بەهەمان ژمارەی هەموو پرۆتۆناتی گەردوون.

ئەگەر ئەم ڕێژەو یەکسانی‌یە بەشێوەیەکی زۆر زۆر کەم تێك بچێت تەنانەت بەڕێژەی (١) تەنها یەك لەملیۆن ملیۆن ملیۆن ملیۆن ملیۆن ملیۆن واتە ژمارەیەك بکرێت بەیەك بەش لە $١٠^{٣٦}$ دەتوان سی وشەش تەنها یەك بەش چەندکەمە ئەوەندە تێك چوون دروست ببێت یەکسەر هەموو گەردوون تێك ئەچێت‌و کۆتایی هەموو شتێك دێت‌و تەنها پەروەردگار خۆی ئەزانێ چی بەسەردێت‌و رۆژی دوایی زیندووبوونەوەی یەکجاری‌و لێ پرسینەوە دێتە پێشەوە ﴿الْقَارِعَةُ مَالْقَارِعَةُ وَمَاأدريك

مالْقَارِعَةُ يَوْمَ يَكُونُ النَّاسُ كَالْفَرَاشِ الْمَبْثُوثِ وَتَكُونُ الْجِبَالُ كَالْعِهْنِ الْمَنْفُوشِ فمَنْ ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَاضِيَةٍ وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ فَأُمُهُ هاوية وَمَا أدريكَ ماهية نَارٌ حَامِيَةٌ﴾ القارعة.

هەروەكوو زانیمان هێزی ڕاکێشان گەلە ئەستێرەکان ڕائەکێشیٚ و کۆیان ئەکاتەوە، بەڵام فراوانبوونی دووریان ئەخاتەوە بەم جۆرە هەروەکوو + و – زۆرانبازی‌یە لەنێوان فراوانبوون و هێزی ڕاکێشان دا، ئەبیٚ لەئەنجامدا کامیان سەرکەون، چونکە گەردوون دروست کراوە تاکوو ئێستا ئەم زۆرانبازی‌یە بەردەوامەو هێزیان بەرامبەرە وەکوو یەك بەهێزن.

بەڵام بابزانین ئەگەر فراوانبوونی گەردوون سەرکەوت بەسەر هێزی ڕاکێشان دا چی ڕووئەدات؟

وەڵام/ ئەگەر فراوانبوون زۆربوو سەرئەکەویٚ بەسەر هێزی ڕاکێشان داو تەنە گەردوونی‌یەکان دوورئەکەونەوە لەیەکترو گەردوون زۆر زۆر فراوان ئەبێت و لەئێستا زۆرتر فراوان ئەبێت، ئەمەش پیٚ ی ئەڵێن گەردوونی کراوە!!!.

(خێرایی ڕزگاربوونی زەوی لەهێزی ڕاکێشان واتە فراوانبوونی گەردوونی زەوی ١١/٢٣کم ثانیەیە)

بەڵام ئەگەر لەزۆران بازییەکدا فراوانبوونی گەردوونی کەمی‌کردو هێزی ڕاکێشان زیاتربوو، فراوانبوون کەم ئەبێتەوەو گەلە ئەستێرەکان وردە وردە ئەگەڕێنەوە بۆلای یەکتر بۆئەوەی لەیەك شوێندا کۆببنەوە هەروەکوو سەرەتای دروستبوونی گەردوون ئەمەش پیٚ ی ئەڵێن گەردوونی داخراو.

تیۆرێکی زانستیش هەیە دەڵیٚ بوونەوەر پاش تەقینەوە گەورەکەی تائێستاش هەرلە حاڵەتی (فعل)دایەو هەر لە یەکتری دوور دەکەونەوەو دەگەنە خاڵێك و لەوێدا ئەوەستیٚ و ئەوجا (رد فعل)ەکەی دەست پێدەکاتەوەو ڕۆژو مانگ و هەموو ئەستێرەکانی تریش دێنەو بۆ ناو جەرگەو کۆدەبنەوەو دەبنەوە بەکوتلەی یەکەمجارو خوای گەورەش ئاماژەیەکی وا دەکات لە (قورئانداو ئەفەرمووێ) (مجمع الشمس والقمر، يقول الانسان يؤمئذ اين المغر).

پەروەردگار لەقورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿يَوْمَ نَطْوِي السَّمَاءَ كَطَيِّ السِّجِلِّ لِلْكُتُبِ كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُعِيدُهُ وَعْداً عَلَيْنَا إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ﴾ (الانبياء:١٠٤) واتە: لەو ڕۆژەدا (لەکاتی هاتنی قیامەت) ئاسمانەکان وە تۆمار دەپێچینەوە هەروەك چۆن یەکەمجار دروستمان کرد هەروا دووبارە دروستی دەکەینەوە، ئەوە پەیمانەو ئێمە جێبەجێی دەکەین.

واتە: پەیمانمان داوە کەئێمە کردوومانەو ئێمە ئەیکەینەوە.

واتە: دروستمان کردووەو لەناوی ئەبەین و دروستی ئەکەینەوە.

هەروەها پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) فەرموویەتی:

(يُقَيِّضْ اللهُ الأرضَ يَومَ الْقيامةِ ويَطوي الْسَّماءَ بِيَمينهِ ثُمَّ يَقولُ أنا ألْملِكُ أينَ ملوكُ الأرضِ) مسلم وبُخاری گێڕاویانەتەوە لەئەبو هورەیرەوە.

هەروەها پەروەردگار دیسانەوە لەقورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿ وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعاً قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾ (الزمر:٦٧)

هەروەها فەرموویەتی:

﴿ يَوْمَ هُمْ بَارِزُونَ لا يَخْفَى عَلَى اللَّهِ مِنْهُمْ شَيْءٌ لِمَنِ الْمُلْكُ الْيَوْمَ لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ ﴾ (غافر:١٦)

﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ ﴾ (الحج:١)

ئایەتی زۆرهەیە لەسوورەتەکانی قورئانی پیرۆزدا لەسەر کۆتایی هاتنی گەردوون و دەست پێکردنی ڕۆژی دوایی و زیندووبوونەوە. لێرەدا کۆتایی یان پێ ئەهێنین.

فراوانبوونی گەردوون و هێزی ڕاکێشان هەردووکیان پەیوەندیان بەچڕی ئێستای گەردوونەوەهەیە ئەگەر چڕی گەردوون بگاتە چڕی (حەرج) وەکوو زاناکان ئەڵێن ئەوکاتە هێزی ڕاکێشان توانای هەیە فراوانبوونی گەردوون بوەستێنێ لەپاشەڕۆژدا.

بەڵام ئەگەر ئەم چڕی یە لەچڕی (حەرج) کەم بوویەوە مانای ئەوەیە فراوانبوونی گەردوون زۆرترئەبێت و بەردەوام ئەبێت بە بێ وەستان.

چڕی (حەرج) (بەم جۆرە حساب کراوە لەلایەن زاناکانەوە) (٤/٧ × ١٠-٣٠ توان ٣٠غم سم٣ ) ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ سێگەردی هیدرۆجین هەیە لەهەر مەتر سێجا لەبۆشایی ئاسمان دا.

بەڵام ئەوچڕی یەی گەردوون ئێستا هەیە ٣٥٪ تاکوو ٤٥٪ی (چڕی حەرجە) هەرچەندە ئەم چڕییەی ئێستای گەردوون زاناکان دایان ناوە، ڕاستی تەواونی یە، چوونکە هێشتا چڕی ئەشکەوتە ڕەشەکان بەهیچ جۆرێك نازانن و نازانن لەناویاندا چی هەیە، لەبەرئەوەی تیشك قووت ئەدەن.

واتە: کات و شوێن و مادده هەڵدەمژن و هیچ زانایەك و زانستێك. لەمەوپێش و لەمەودواییش نازانێت نهێنی ئەم ئەشکەوتە رەشانە تێ بگات ئەمە بێجگە لەئەشکەوتە سپی یەکان ی لێوارەکانی گەردوون کەلەئەشکەوتە رەشەکان زۆر زۆرترن لەوانەیە بەگوێرەی زانست ١٠٠,٠٠٠سەدهەزار ملیۆن ساڵی رووناکی تاکوو ١٥٠,٠٠٠ ملیۆن ساڵی رووناکی لەئێمەوە دووربن، لەبەرئەوە خێراترین شت تاکوو ئێستا رووناکی یە لەچرکەیەکدا (١٨٦,٠٠٠) میل ئەڕوات.

کەوابوو ئەگەر کەشتی یەکی ئاسمانی مان هەبێت بەو خێرایی یە بڕوات ئەبێ سەد هەزار ملیۆن ساڵ بڕوات بەڕێوە ئینجا نزیك ئەشکەوتە سپی یەکان ئەبێتەوە!!!

بەگوێرەی تیۆری ڕێژەیی ئەنیشتاین هەرچی شتێك خێرایی بگاتە خێرایی رووناکی ئەبێتەوە بەسفر، واتە مەحاڵە ئێمە یان زاناکان و زانستی نوێ تێ بگەن لەم ئەشکەوتە سپی یانە یان رەشەکان هەروەها زاناکان ئەڵێن:

دوورنی یە لەنێوان گەلەئەستێرەکان دا گازو تۆزێکی زۆرنەبێت چونکە ناتوانین بەهیچ جۆرو شێوەیەك بیان بینین لەبەرئەوە چڕی گەردوون دوورنییە لەپاشەڕۆژدا نەگاتە چڕی (حەرج) دوای ئەوەی گازو تۆزی نێوان گەلە ئەستێرەکان ئاشکرابوو لەگەڵ ئەشکەوتە رەشەکان، ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ کەهێزی راکێشان زاڵ ئەبێت بەسەرهێزی فراوانبوونی گەردوون داو ئەم جووڵانەوەی گەردوونە وورده وورده هێواش ئەبێتەوە تاکوو ئەوەستێ و گەلەئەستێرەکان دەست ئەکەن بەگەڕانەوەی پێچەوانە بۆ شوێنێکی تایبەتی و کۆئەبنەوە لەیەك خاڵ دا بەم جۆرە چاوەڕوانی

مردنی ئەستێرەکان نابێن لەگەردوونی کراوەدا بەڵکو ئەم جۆرە گەردوونە داخراوەو هەموو ئەستێرەکان بەیەکەوە ئەمرن و قیامەتی هاوبەش ئەبێت و هەموو شتێك کۆتایی دێت.............

چونکە لەم کاتەدا ئەوەندە پلەی گەرما بەرزئەبێتەوە ملیۆن ملیۆن ملیۆن ملیۆن جار گەرمیان زیاددەکات و ئەستێرەکان هاواری مردنیان لێ بەرز ئەبێتەوەو ئەتوێنەوەو شۆربایەکی گەردوونی دروست ئەکەن کەپێك هاتووە لە تیشکەکان و ئەلەکترۆنەکان و ناوکی گەردەکان لەماوەیەکی زۆر زۆرکەم دا هەموو گەردوون ئەتوێتەوە ئەبێت بەم شۆربا گەردوونی یە و ئەکولێ... بەڵام چۆن کولانێك مەگەر پەروەردگار خۆی بزانێت.

بەم جۆرە گەردوون هەمووی ئەکولێ تاکوو قەبارەی کەم ئەبێتەوەو دێتە سفرو لەناوئەچێت و نامێنێ و نابینرێ ئەمەیە زاناکان پێی ئەڵێن (القيامة المشتركة)و پەروەردگار بە (الطامة الكبرى) سوێندی خواردووە

﴿فاذا جاءت الطامة الكبرى ﴾ (النازعات:٣٤)

هەروەها فەرموویەتی:

﴿فَإِذَا بَرِقَ الْبَصَرُ وَخَسَفَ الْقَمَر وَجُمِعَ الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ يَقُولُ الْأِنْسَانُ يَوْمَئِذٍ أَيْنَ الْمَفَرُّ﴾ (القيامة:١٠،٧)

لەم کاتەدا ئادەمیزاد ئاگادارئەکرێتەوە لەوەی کەکردوویەتی!!!!.

بەڵام ئەگەر گەردوون نەگاتە چڕی (حرج) ئەمە ئەوەناگەیەنێ کەفراوانبوون و کشانی گەردوون بەردەوام ئەبێت و هەرگیز کۆتایی نایەت!! نەخێر چونکە هەروەکوو باسمان کرد ئەگەر گەردوون کراوەبێت ئەستێرەکان بەرەبەرە یەك لەدوای یەك ئەمرن و ئەکوژێنەوە لەئەنجاما هەموو گەردوون ئەبێت بەگۆڕستانێکی هەرە گەورەی ئەستێرەکان.

ئەمە نوێترین زانستی ئەمڕۆ وائەڵێت کەبەزۆر زۆر پێشکەوتوو لەقەڵەم ئەدرێت، کەوابوو لەهەردوو جۆرە گەردوونەکەدا.......

(کراوە) و (داخراو) گەردوون تەمەنی دیاریکراوی هەیە:

کاتی دروست کردنی و کاتی مردنی ، تەمەنی ئەکەوێتە نێوان ئەم دووکاتەوە.

گەردوون ئەمرێت و نامێنێ... هەروەکوو پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿ إِنَّ السَّاعَةَ لَآتِيَةٌ لا رَيْبَ فِيهَا وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يُؤْمِنُونَ﴾ (غافر:٥٩)

واتە: کاتی کۆتایی گەردوون بەڕێوەیە بەڵام زۆربەی خەڵك باوەڕیان نیيە.

دیسانەوە ئەمە ئەوەناگەیەنێ گەردوون بەم دووشێوەیە ئەمرێ و کۆتایی دێت... بەڵکو هەزاران ڕێگەو تێك چوون و ئەگەری تر هەیە کەزاناکان و زانست باسی ئەکەن.

لێرەدا ناتوانین هەموویان باس بکەین چونکە چەند کتێبێکی وەکوو ئەم کتێبەی ئەویێ بۆ باس کردنیان. کتێبی (أبحاث في ضوء العلم الحديث) ص٨٨.

کەوابوو ((قیامەت)) زۆر زۆر نزیکە و هەرئەبێت و لەناکاودا ئەبێت بەدروست بوونی بچووکترین تێك چوون باری گەردوونی قیامەت ڕووئەدات و ئەبێت.

هەروەکو پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿ هَلْ يَنْظُرُونَ إِلَّا السَّاعَةَ أَنْ تَأْتِيَهُمْ بَغْتَةً وَهُمْ لا يَشْعُرُونَ﴾ (الزخرف:٦٦)

((ئایا تەماشائەکەن لەناکاو ئەوکاتەدێت بەخۆیان نازانن))

هەروەها فەرموویەتی:

﴿وَلِلَّهِ غَيْبُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا أَمْرُ السَّاعَةِ إِلَّا كَلَمْحِ الْبَصَرِ أَوْ هُوَ أَقْرَبُ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (النحل:٧٧)

واتە: نهێنی زەوی و ئاسمانەکان لای پەروەردگارە ڕوودانی کاتی کۆتایی گەردوون هەروەکوو چاوتروکاندنێك وایە بەڵکو نزیکتریش پەروەردگار دەسەڵات و توانای هەیە بەسەر هەموو شتێك دا.....

دیسانەوە تەماشای ووتەی زاناکان بکەن.. زاناکانی گەردوون ناسی و فیزیا هەروەکو لەکتێبی (القران و العلمُ الحديث)دا هاتووە ل١٤٥.

ئەڵێن: ئەگەر بەهەر هۆیەکەوەبێت و ڕێك بکەوێت تەنها یەك پرۆتۆنی (سالب-) لەئاسمان دا بگات بەیەك پرۆتۆنی (موجەب +) لەناو هەر گەردێك دا لەناو گەردوون دا ــ هەرگیز ناتوانین پێش بینی ئەو وێران کاری و کاول بوونەی گەردوون بکەین لەماوەی چەند چرکەیەکدا و کۆتایی بەهەموو شتێك ئەهێنێ لەمادە و ئادەمیزاد و ئاژەڵ و ڕووەك و ئاوو هەواو هەموو بوون و بوونەوەر لەگەردوون دا.

هەتاكو ئاسمانەكانيش نامێنن...

هەروەكو پەروەردگار فەرموويەتی:

﴿ إِذَا السَّمَاءُ انْفَطَرَتْ وَإِذَا الْكَوَاكِبُ انْتَثَرَتْ وَإِذَا الْبِحَارُ فُجِّرَتْ ﴾ (الأنفطار ١،٢،٣)

هەروەها دەفەرموێ:

﴿إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ وَإِذَا الْأَرْضُ مُدَّتْ وَأَلْقَتْ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتْ وَأَذِنَتْ لِرَبِّهَا وَحُقَّتْ ﴾ (الأنشقاق ٥،٤،٣،٢،١)

**بەم جۆرە زاناكان دەڵێن:**

كۆتایی زەوی لەچركەیەكدا یان كەمترئەبێت و تەقینەوەو وێرانبوونی گەردوون دەست پێ دەكات لەناو گەردەكان و زەوی و ئاسمانەكان داو هەرچی تەنە گەردوونی یەكاندایەو هەرچی یان تێدایە !!

﴿إِنَّمَا مَثَلُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا كَمَاءٍ أَنْزَلْنَاهُ مِنَ السَّمَاءِ فَاخْتَلَطَ بِهِ نَبَاتُ الْأَرْضِ مِمَّا يَأْكُلُ النَّاسُ وَالْأَنْعَامُ حَتَّى إِذَا أَخَذَتِ الْأَرْضُ زُخْرُفَهَا وَازَّيَّنَتْ وَظَنَّ أَهْلُهَا أَنَّهُمْ قَادِرُونَ عَلَيْهَا أَتَاهَا أَمْرُنَا لَيْلاً أَوْ نَهَاراً فَجَعَلْنَاهَا حَصِيداً كَأَنْ لَمْ تَغْنَ بِالْأَمْسِ كَذَلِكَ نُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (يونس: ٢٤)

واتە: شەوبێت یان رۆژبێت كۆتایی بەم گەردوونەدێت بەفەرمانی پەروەردگاری لێرەدا بۆیە ئەفەرموێ شەو یان رۆژ لەبەرئەوەی زەوی بەهۆی سووڕانەوەكەی بەدەوری خۆی‌دا شەورۆژ پێك ئەهێنێ لەبەرئەوە نیوەی رۆژەو نیوەی شەوە لەهەركاتێك دا كۆتایی گەردوون هات.

ئەم زانستە لەوكاتەدا بەوەحی پەروەردگاری هاتووە بۆ پێغەمبەرمان محمد(ﷺ) كەخوێندەوارنەبووە.

هەروەها لەهەمان سەرچاوەدا ل١٤٤ ئەڵێ:

لیژنەی ووزەی ئەتۆمی رایگەیاند كە دكتۆر ((إيرنست لورنس)) گەیشتووەتە دۆزینەوەیەكی ترسناك ئەویش ئەوەیە:

((کهـارب)) پەیـدابووە لەنــەژادی پرۆتـۆن بـەڵام لـەجۆری سـالب ـــ لەچـینەکانی سـەرەوەی بەرگــەبادا، ئەمــەش دژی سروشــتەو مەترســی‌یەکی وای هەیــە ئــەقڵی ئادەمیزاد پێش بینی ناکات !!!.

## پەروەردگار بۆچی ئەم گەردوونەی دروست کرد؟؟؟

کاتێك ئەمانـەوێ باسـی چـۆنییەتی دروسـت بـوونی گـەردوون بکـەین لەسـەرەتاوە پێویسـتە بـارودۆخی ئێـستای بـزانین بەتایبـەتی بـارودۆخی ئـەم زەوی‌یـەی لەسـەری ئەژین، واتە ئەبێ بڕوانینە هۆکارو ئەنجام.

ئەوگەردە گەورەیەی کە ۲۰,۰۰۰ بیست هەزار ملیۆن سـاڵ لەمـەوپێش تەقێنرایـەوە ئـەم گەردوونـەی لێ‌دروسـت بـوو، کـەوابوو گـەردوون لـەدایك بـووی ئـەو گـەردە گەورەیەبوو!!!.

کەئێـستا ئـەو هــەموو تەنـە گەردوونیانـەو مـانگ‌و خـۆرو ئەسـتێرەکان‌و زەوی بەهەمووبوون‌و بوونەوەریەوە لەگیاندارو بێ‌گیان‌و ئەو ئاوو هەوایەی تێدایە.

کـاتێ تەماشـای ئـەم هــەموو دروسـتکراوە سەیروســەمەرانە ئەکـەین تەماشـای یاساونەخشەو ڕێك‌وپێکی ئەم دروست بوونە ئەکەین، یاساو نەخشەو ڕێك‌وپێکی ئەم دروست بوونە ئەبینین بەجۆرێك سەرمان سوڕئەمێنێ‌و بۆمان دەرئەکەوێ لـەناو گـەردە گەورەکـەدا پــێش تەقینەوەکـەی نەخـشەی هــەموویان کێـشراوەو دروسـت کـراوەو ئامادەکراوە هەروەکوو چۆن مناڵێك لە تـەنها (حـەیامنێك)دروسـت ئـەبێت ئەوهـەموو ووردەکاری‌یە لەگەڵ خۆی‌دا ئەهێنێ ئەو حەیامنـەی بەچاونابینرێ ئەو مناڵـە دوای نۆمـانگ دێتـە دەرەوەو دەسـت بـەژیانی ئـەم جیهانەئـەکات بەهـەموو ئەندامـەکانی لەشـیەوە کـەوابوو نەخـشەی هەمووشـتێك پـەروەردگار کێـشاویەتی‌و لـەناو گـەردە گەورەکەدا پێچراوەتەوە بەتەقینەوەی هەموو بوون‌و بوونەوەر لەدایك بوون.

ئەگـەر تەماشـای لـەشمان بکـەین، یـان ئـەوئاوەی ئەیخۆینـەوە یـان ئـەو هەوایـەی هەناسەی پێ‌ئەدەین یان ئەوخواردنـەی ئـەیخۆین یـان ئەوبۆنـە خۆشـەی بـۆنی ئەکـەین لەگوڵەکانـدا یان ئەودەنگە خۆشەی لەگەرووی بولبولەکانـدا دێتـەدەرەوە، ئـەبینین ئـەو

گەردانەی لەمانەدا هەیە، گەردیلەکانیان ئەم هەموو پێداویستیانەیان دروست کردووە هەموویان لەناو ئەو شۆربا گەردوونی یەدا بوون کە لەتەقینەوەی گەردی گەورەوە دروست بوون، هەموویان گەردو گەردیلەی ئەو شۆربایەن و لەهیچ شوێنێکی ترەوە نەهاتوون، بەڵکو لەناوسکی دایکیان دا کەگەردی گەورەبوو هاتنەدەرەوە دوای تەقینەوەی ئەم شێوەیەی ئێستایان وەرگرت.

ئایا ئەمە بەس نی یە بۆ هەموو خاوەن بیرێك کەبزانێت نەخشەی گەردوون لەلایەن تەنها ئەندازیارێکەوە کێشراوەو ئامادەی کردووەو لەیەك مادە دروستی کردووە ئەوئەندازیارە بەتواناو دەسەڵاتە گەورەیە پەروەردگارە.

لێرەدا یەکێك لەناوە پیرۆزەکانی پەروەردگارمان دێتەوەیاد ئەویش ((حافظ)) ە واتە پارێزەر.

کەوابوو پارێزەر یان (ئاگادارکەر) تەنها پەروەردگارە کەبتوانێ ئەم گەردوونە بپارێزێ و ئاگاداری بکات و بەڕێوەی بەرێ بەبێ ئەوەی بهێڵێ تێك بچێت. هەمووکاتێك ئەڵێین یا ((حفیظ)) .

پەیوەندی تەقینەوەی گەردی گەورەو ئەم هەموو بوون و بوونەوەرانە لەم گەردوونە گەورەیەدا زۆر ووردەکاریمان بۆ دەرئەخاو بۆمان دەرئەکەوێ بەگاڵتەو لەخۆیەوە دروست نەبووە:

﴿ وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاءَ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لاعِبِينَ ﴾ (الانبياء:١٦)

بەڵکو دروستکراوە تاکوو ژیان دەست پێ بکات ــ چونکە ئەگەر وانی یە هەموو ئەستێرەکان تەماشابکەین هیچیان وەکو زەوی هۆی ژیانی لەسەرنی‌یە تەنها ئەوشوێنانە نەبێت کەجێ ی مەلائکەو رۆحەکان یان لەسەرە بێجگە لەئەستێرە هەرە دوورەکان کەهێشتا زاناکان نازانن ژیانیان لەسەرە یان نا؟

واتە: پەروەردگار بەڕێك وپێکی و پلەی تایبەت ئەم گەردوونەی ڕێك خست تاکوو لەئەنجامدا ئادەمیزادی دروست کرد لەگەڵ دروست کراوەکانی‌تر داو لەقورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾ (الذريات:٥٦)

زاناى فيزيا ــ جون ــ أ ــ ويلر ــ john . A. Wheeler

ئەڵێ: نرخی گەردوون چی یە ئەگەر ئادەمیزادی تێدانەبێت؟..

بـەڵێ ئـادەمیزاد زۆر خۆشەویـستەلای دروسـتکاری خـۆی بۆیـە لـەقورئانی فەرموویەتی:

﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً ﴾ (الاسراء: ٧٠)

زەوی هـەروەکو گەردێکـە لەهـەموو گەردوونـدا کـە ١٠٠,٠٠٠ سـەدهەزار ملیـۆن گەلەئەسـتێرەی تێدایـە، هەرگەلـە ئەسـتێرەیەك لـە١٠٠,٠٠٠سـەدهەزار ملیـۆن تـاکوو ٥٠٠,٠٠٠ پێنج سەدهەزار ملیۆن ئەستێرەوخۆری زۆرگەورەی تێدایە بێجگە لەهـەورە گـەردوونی یـەکان و خۆڵەگـەردوونی یـەکان و ئەشـکەوتە رەشـەکان و ئەشـکەوتە سپی‌یەکان و سەدیمەکان و ئەوتەنە گەردوونیانەی کەلەبەر دووریيان هێشتا زانست پەی پیٚ نەبردوون واتە نەیدۆزیونەتەوە!!

کـەوابووکیٚ ئـەتوانیٚ بڵـیٚ ئـەم گەردوونـە بـەبیٚ نەخـشەو ئامـادەکردنێکی پـێش ترنەبووە؟ کیٚ‌ئەتوانیٚ یڵیٚ لەخۆیەوەو بەرێکەوت دروست بووە!!!!

کیٚ ئەتوانیٚ بڵیٚ بە بیٚ مەبەست و بەبیٚ ئامانج دروست بووە.

دوای تەقینـەوەی گـەورە هـەموو دروسـتکراوەکانی پـەروەردگار هاتنەکایـەوەو بەرەبـەرە تـاکوو زەوی سـاردبوویەوەو پاشـان ژیـان لەسـەری دەرکـەوت و ئـادەمیزاد هاتەکایەوە بەفەرمانی پەروەردگار.

کەوابوو ئامانجی دروست بوونی گەردوون هەرلەسەرەتاوە بەجۆرێك هاتووە پلە پلەیەو کۆتایی پلەکان دروست بوون و دەرکەوتنی ئادەمیزادە.

کەوابوو ئادەمیزاد کەدێتەدنیاوە میوانی ئەم گەردوونەیە کە ٢٠,٠٠٠بیست هـەزار ملیۆن سالٚ چاوەرِیٚی بووە!!!.

ئەومیوانە پەروەردگار زۆر رێزی لیٚ ناوە:

﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً ﴾ (الاسراء: ٧٠)

کەوابوو ئادەمیزادی میوان زۆر بەڕێزە لای پەروەردگار هەروەها گەردوون بیست هەزار ملیۆن ساڵ لەمەوپێش لەپێشوازی دا بووە ئیتر ئەوئادەمیزادە ئەبێ بۆچی خۆی بەرێتە ئەندازەو پلەی ئاژەڵەکان و یا خی بێت لەپەروەردگاری خۆی لەدروست کاری خۆی و باوەڕی پێ نەبێت.. ئایا نرخی ئەوکەسە چی یە باوەڕی بەدروست کەری خۆی نەبێت؟

کەوابوو بۆمان دەرکەوت گەردوون بۆ دەرکەوتنی ژیان دروست کراو مەبەستیش لەدروست بوونی دەرکەوتنی ئادەمیزادبوو.

## (( لێرەدا دوو پرسیاری گرنگ دێنە پێشەوە ))

**پرسیاری یەکەم:** پەروەردگار خاوەن توانایەو هەموو توانایەك لای خۆیەتی و توانای کۆتایی نایەت و ئەتوانێ لەچرکەیەکدا هەموو شتێك دروست بکات.

بەڵام ئایا بۆچی دوای بیست هەزار ملیۆن ساڵ دوای دروستکردنی گەردوون ئادەمیزادی دروست کرد؟

هەرچەندە ئەیتوانی ئادەمیزادیش لەگەڵ گەردوون دروست بکات؟

**وەلام:**

ئەوە خوا خۆی دەزانێ بۆچی مرۆڤی دروست کردووە، بەڵام بەپێی ئاماژەکانی قورئان و حەدیس مرۆڤ بۆ (خواناسیش) و (خواپەرستن) دروستکراوەو داوای ئاوەدانکردنەوەی زەوی لێکراوە، (نشأکم من الارض واستعمرکم فیها) [1]. جا گەردوون بەم شێوەیە دروست کرا بۆئەوەی وەکوو ئاوێنەیەك بێت بۆ گەورەیی و بەتوانایی و ناوە پیرۆزەکانی و دروستکراوەکانی.

هەروەکوو هونەرمەندێك وێنەیەك دروست ئەکات توانای خۆی ئەخاتە کار بەهەموو جۆرێ لەوانەیە بۆ وێنەی تەنها چۆلەکەیەك یان کەوێك لەسەرلانەکەی دارودارستانێکی گەورەو شاخێکی گەورەو ئاوو بەفراوێکی زۆر ئاسمان و هەوریش

---

(١) مەلەوی عەللامەش لە (عقیدة مرضیة)ە کەیدا دەفەرموێ: وما خلقت هەس لە قورئاندا دەفەرموێت لە خلق جن وئینسان حیکمەت عیبادە (واجب الخلق)ە ئەویش بێ ئیمان هەبای موتڵەقە.

دروست ئەکات لەوێنەکەدا بۆئەوەی بیڕازێنێتەوەو ئینجا لەپێشانگا هەڵی ئەواسێ بۆ تەماشاکردن.

کەوابوو پەروەردگار دەستکردو دروستکراوی خۆی پیشان ئەدات گەورەیی و زانایی و توانایی خۆی دیاری ئەکات و هەموو ناوە پیرۆزەکانی بەڕاستی ئەسەلمێنێ.

لەوانەیە ئەگەر لەچرکەیەکدا هەموو گەردوون و بوون و بوونەوەرو ئادەمیزادی دروست بکردایە تەنها ناوی (قادر)ی لێ ئەگونجا واتە توانا بەڵام ئەی ناوەکانی تری؟ لەبەرئەوە ئەم ٢٠,٠٠٠ بیست هەزار ملیۆن ساڵەی خایاند ئینجا ژیانی دروست کرد بۆئەوەی ناوەکانی تری وەکوو(الحکیم * البدیع * المصور * الرحیم * الرحمان * العدل * الهادی *الصبور * الرشید....هتد دەرکەون لەدروستکراوەکانیدا.

لێرەدا لەوانەیە پرسیارێك بکرێت و بڵێ:

بۆچی دروست بوون لە نەبوونەوە هەروەکوو لە سەرەتاوە بووە تاکوو ئێستا بەردەوام نەبووە؟ واتە یەکەم گیان لەبەر لەنەبوونەوە دروست بوو ئێستاش بۆچی لە نەبوونەوە دروست نابن.

**وەڵامی ئەم پرسیارە ئەوەیە:**

سەرەتا بڵێین:

١-بێگومان خوا دەتوانێ ئەوکارانەو بە بێ یاسایەکی زانراو لای ئێمە ئەوکارانە بەڕێوەبەرێت وەك چۆن لەگەردوون و ئەشکەوتە سپیەکاندا بەڕێوەی دەبات.

٢-بۆ بەڕێوەچوونی ژیانی سەرزەوی و گەردوون یاساو نەخشەی داناوەو ژیان بەو یاسایانە بەڕێوە دەبات، دایك و باوك هۆن بۆ بوونی منداڵ، ئاوو هەوا هۆی بۆ دروست بوونی گژوگیا، هەرکاتێکیش ویستی ئەو یاسایە دەگۆڕێ و بێ باوك منداڵ ئەدات وەك حەزرەتی عیسا بۆ نموونە .. پاشان بابڵێین:

لەسەرەتاوە دەسەڵات و گەورەیی پەروەردگار راستەوخۆبووە بەبێ پەردە واتە بەبێ هۆیەك روونیبکاتەوە بەڵکو راستەوخۆ یەکسەرکارەکانی ئەنجام داوە.

بەڵام کاتێ گەردوون کەوتە پلەی یاسایی یەوە وای لێهات کارەکان بەڕوونکردنەوە بکرێن و کرداری دروست کردن گۆڕرا بەکرداری داهێنان.

دروست بوون لەنەبوون گۆڕڕا بەپێك هاتن لەبوون.

واتـە: کۆکردنـەوەی ئـەو ڕەگەزانـەی دروسـت بـوون و لەوانـەوە دروسـت کردنـی بوونەوەرێکی نویێ وەکوو (کۆبوونەوەی نێرومێ) و دروست بوونی بوونەوەرێکی نـوێ هەروەکوو پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿ يَسْأَلُهُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ ﴾ (الرحمن:٢٩)

هەروەها دەرکەوتنی هۆکان لەپشتی کارەساتەکانەوە گەورەیی پەروەردگار نیشان ئـەدات هـەروەکوو سـەرۆکێك فـەرمان دەرئـەکات بەفەرمانبـەرو کارگوزارەکـانی جێبەجێ‌ئـەکات لەهـەموو بوارێکـدا خـۆی دەرناخـات بەرامبـەر بەگەلەکـەی و ناچێتەناویانەوە.

پەروەردگار سەرۆکی هەموو بوونەوەرە یاساو فەرمانبەری داناوە لـەنێوان خـۆی و دروسـت کراوەکانی‌ـدا لەگـەڵ جیاوازی‌یـەکی زۆردا لـەنێوان کاربەدەسـتەکانی پەروەردگارو کاربەدەستانی سەرۆکێك لەسەرزەوی.

چونکە پـەروەردگار پێویسـتی بەیارمـەتی بەدەسـتانی خـۆی نـی یە بەدەسـتەکانی پێویستییان بەیارمەتی پەروەردگار هەیە.

سـەرۆکێك هەرچـەندە دەسـەڵات داربێـت لەسـەرزەوی دەسـەڵاتەکەی لەکاربەدەسـتەکانیەوە وەرئـەگرێت... بـەڵام بـە پێـچەوانەوە کاربەدەسـتەکانی پـەروەردگار دەسـەڵات لەپـەروەردگارەوە وەرئەگرن. وەکوو مەلائکـە هەریەکـەو جـۆرە کارێکی بەدەستەو بەتوانای پەروەردگار خۆی ئەنجامی ئەدەن.

پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَنْتُمُ الْفُقَرَاءُ إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ﴾ (فاطر:١٥)

**پرسیاری دووەم:** گرنگترین ئامانج و مەبەست لەدروستکردنی گـەردوون دروسـتکردنی ئادەمیزاد بوو...

هۆی چی بوو ئەم گەردوونە گەورەو فراوانە پەروەردگار دروستیکرد لەبەرئەم ئادەمیزادە زۆر زۆر بچووکە؟

وەڵام:

سەرەتا با بڵێین: تەنیا خوا خۆی دەزانێ هۆکەی چی یە، بەڵام بە ئاماژەکانی خواو پێغەمبەردا (ص) دەکەوێت کە مرۆڤ سەرداروگەورەو بەڕێزەو وەزیفەیەکی گەورەی هەیە.

راستە ئەم گەردوونە زۆر گەورەو فراوانە بەجۆرێك سەدهەزار ملیۆن گەلەئەستێرەی تێدایەو هەر گەلەئەوستێرەیەك سەد هەزار تاکوو پێنج سەدهەزار ملیۆن ئەستێرەی تێدایە بێجگە لەئەستێرەو تەنە گەردوونی و هەورو خۆڵە گەردوونییەکانی تر.

لەوانەیە هەندێکەس بڵێن تەنها کۆمەڵەی خۆر بەس بوو بۆ ئادەمیزاد واتە(خۆر * مانگ * زەوی و ئەستێرە گەڕۆکەکانی دەوروبەریان وەکوو (زهرە * مشتری * مریخ * زوحەل * نبتون * پلوتو * اورانوس هتد).

یان تەنها گەلەئەستێرەیەکی وەکوو گەلەئەستێرەی کاکێشان کە سەدهەزار ملیۆن ئەستێرەوخۆری تێدایە بەس بوو

لێرەدا ئەڵێین نەخێر دیسانەوە نەخێر چونکە بۆشایی و کات یەکەیەکی تەواوپێك دێنن لەگەردوون داو نابێت هیچیان جیابکرێنەوە چونکە ئەگەر گەردوون تەنها لەگەلە ئەستێرەیەك دروست بوایە کاتی ٢٠,٠٠٠بیست هەزار ملیۆن ساڵ کورت ئەبوویەوە بۆماوەی دوومانگ.

لەم کاتە کورتەداو لەدووری یەك گەلەئەستێرەدا گەورەیی و دەسەڵاتی پەروەردگار باش دەرنەئەکەوت و ڕێوشوێنی بوونەوەرکانیش وەکو جیهانەکانی ڕۆحەکان و شوێنی مەلائکەو جن و هەندێ نهێنی تریش تاکوو ئێستا زانست بۆی دەرنەکەوتووە روون نەئەبوویەوە.

ئەم گەردوونە گەورەیە دروست کراوە لەبەر ئادەمیزادێکی زۆر بچووك ئەوەناگەیەنێ بەشی خۆی چی یە هەرئەوەیەو ئەوی تری بەبۆشی ئەمێنێتەوە بەبێ

سـوود. چـونکه تـەنها تەماشـای لـەشمان بکـەین ئەوکاتـە ئـەزانین بۆچـی گـەردوون ئەوەندە گەورەو فراوانە............تەنها جگەرمان ٤٠٠کار زیاتر ئەنجام ئەدات ئایا ئەندامـەکانیتری لـەش هـەروەکوو کۆئەنـدامی هەسـتو هـەرسو خـوێن یـان وەکـو مێشكو دڵ ئەبێ چەندەها هەزارکاریان هەبێت.

کـەوابوو لەشـێکی بـچووکی ئـادەمیزاد ئەوەنـدە ووردەکـاریو ئەنـدامو شـانەی پێویـستە ئایـا گـەردوون گـەورەیی پـەروەردگارو دەسـەڵاتی پیـشان ئـەدات چـۆن بەگەورەییو فراوانی دروستی نەکات..................

کەوابوو بەرهەمی گەردوون ئەو بوونـەوەرە پیرۆزەیـە کـەئادەمیزادە تـەنها شـوێنی ئـەو نـی یـە و بـەس بـەڵکو کاروفرمـانی تـری هەیـەو دیمـەنی دەسـەڵاتو توانـای پەروەردگارەو شوێنی بوونەوەری ترە و تەنها پەروەردگار خۆی ئەزانێ بۆچی یە.

لێرەدا ئەبێ ئەوەش لەیادنەکەین،وولاتانی جیهان چەند بەربەرەکانی ئەکەنو چەند هەوڵ ئەدەن بۆ زانینی نهێنی یـەکانی گـەردوونو ژیـانی تـریش لەسـەر ئەسـتێرەکان تاکوو ئێستا داماون لەبەر دووری ئەسـتێرەکانو گەلـە ئەسـتێرەکانو بەهیوای ئـەوەن ژیـان لەئەسـتێرەی تـریش هـەبێ ئـەوان زانیاریـان هـەبێو نهێنـی گـەردوونمان بـۆ ئاشکرابکەن.

بـەڵام ئێمـە ئـەڵێین ئـەو دووریـی یـە کەبەسـەدهەزار ملیـۆن سـاڵی رووناکی زاناکـان ناوی ئەبەن چ زانستێك ئەتوانێ ئەمە نزیك بکاتـەوە؟ لەگـەڵ ئەوەشا ئێمـەی موسـڵمان باوەڕمان بە ژیـانی تـریش هەیـە لـەم گەردوونـەدا وەکـو شـوێنی مەلائیکـەکانو شـوێنی جنۆکەو شوێنی جیهانە ئەثیریو رۆحەکان.

بـەڵام ئایـا زانـست ئـەتوانێت ئـەو شـوێنە بدۆزێتـەوە بێگومـان نـەخێر چـونکە پەروەردگار لەزۆر ئایەتدا لەقورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿ وَالْخَيْلَ وَالْبِغَالَ وَالْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً وَيَخْلُقُ مَا لا تَعْلَمُونَ﴾ (النحل:٨)

﴿ وَيَسْأَلونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلاً ﴾ (الاسراء:٨٥)

بێجگـە لـەوەی پـەروەردگار بڕیـاری لەسـەرداوە ئـادەمیزاد لـەوەزیاتر نازانێـت و ناتوانێت.

کـەوابوو لێـرەدا دەرگـای زانـست دائـەخرێت و دەرگـای وەحـی پـەروەردگاری ئەکرێتـەوەو هیـچمان بـۆ نەماوەتـەوە تـەنها گوێڕایـەڵی پڕۆگرامـی پـەروەردگارە کەقورئانی پیرۆزەو کارکردن و خواپەرستی لەسەر فەرموودەکانی پێشەوای ئیسلام: محمد(ﷺ).

## (بۆچی پەروەردگار ئادەمیزادی دروست کرد)

هەروەکوو باسمان کرد پەروەردگار بایەخ و ئاگاداری تایبەتی داوە بەزەوی تاکوو هـەمووجۆرەکانی ژیـان بـەردەوام بێـت لەسـەری، لەسـەرووی هەموویانـەوە میوانـە خۆشەویستەکەی گەردوون (ئادەمیزاد).

پـەروەردگار ئـەم ئادەمیزادەی دروستکرد هـەروەکو بەرهـەمی گـەردوون بۆئـەوەی بزانـێ و ببینێ ئـەوکارە سەرسوڕهێنەرانە و ئەودەسـەڵات و توانایـەو ئـەو زانـست و نەخشانەی ئەوکەسەی ئەوی دروست کردووە، بۆئەوەی پەروەردگار بناسین

هەروەکوو لەقورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْأِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ (الذريات:٥٦)

واتـە: جنۆکـەو ئادەمیزادمـان بۆیـە دروسـت کـرد تـاکوو بمناسـن لێـرەدا مانـای (لِيَعْبُدُونِ) بۆناسین دێت هەرچەندە مانای خواپەرستی یە و (خواپەرستی و خواناسی) یەك مانایان هەیە ئەوەی خواناپەرستێ پێ ی ئەڵێن خوا ناناسێ.

هەرچـەندە مەولـەوی عەللامـەش بۆچـوونێکی وردتـری هەیـەو لە عەقیـدە مرضـية کـەیـدا باسـی دەکـات ئـەویش ئەوەیـە، خـوا کەلـە قورئانـدا دەفـەرموێ: (مـن پـەری و ئادەمیزادم بۆ هیچی تر دروست نـەکردووە بۆ ئـەوە نـەبێ بمپەرستن، پێغەمبـەریش (ص) لـەخوای گـەورەوە دەگێڕێتـەوە کە ئادەمیزادی بۆیـە دروسـت کـردووە تابیناسـن (خلقت الخلعه لكي أعرف) .

جا مەولەوی دەفەرموێ: تا خوا نەناسی ناتوانی بیپەرستی.

کەواتە خواناسین هەنگاوی یەکەمەو هەنگاوی دووهەم خواپەرستنە بۆیە لەکۆتایی کۆپلە شیعرەکەدا دەفەرموێ لەکەی موناڤات (لکي اعرف) چوو دەسەمل لەگەڵ (ليعبدون) بوو!!

هەروەها پەروەردگار نەخشەیەکی تایبەتی بۆ ئادەمیزاد کێشاوە تاکوو لەژیانی دا لەسەری بڕوا، ئەم کاروانە کورتەی بەرێتە سەر.

تەنها تەماشاکردنێك لەم کارە گەردوونیانەی پەروەردگار دروستی کردوون و ئەنجامیان ئەدات و ئەو نیعمەتانەی پێ ی بەخشیوین کەژمارەیان دوایی نایەت بۆ ئەم دروست کراوە بێ هێزو لاوازە کە ئادەمیزادەکە زۆرجار سپڵەیە.

بەڵێ ئادەمیزاد لاوازە چونکە بچوکترین دروست کراوی پەروەردگار (ڤایرۆس)ە کە بەچاونابینرێ نەخۆشی ئەخات و ئەیدا بەئەرزاو زۆجار ئەیکوژێ و توانای بەرگریکردنی لەخۆی نی یە!!!.

هەروەها هەندێ جاریش سپڵەیە چونکە وەفای نی یە بەرامبەر بەپەروەردگار کەئادەمیزادی کردووە بەسەرداری زەوی و هەرچی لەسەر زەوی و ناخی زەوی و ئاسمانی زەویدا هەیە هەمووی دابین کردووە بۆ خزمەتی.

ئەگەر هەموو ئادەمیزادێك بیربکاتەوە لەپەروەردگارو دروستکراوەکانی هەروەها لەنیعمەتە زۆرەکانی..... بەهەموو هێزوتوانایەوە کڕنوش ئەبات بۆ پەروەردگارو دڵی وا لێ ئەدات کەهەرگیز سەربەرزنەکاتەوە تاکوو مردن.

بەڵام سوننەتی ژیانەو ئەبێ خوابناسێ و کاریش بکا بۆژیان و بۆدوای مردن.

هەروەکوو یەکێ لەپێشەواکانی ئیسلام فەرموویەتی:

(إعْمِلْ لِدُنياكَ كَأَنَّكَ تَعيشُ أَبَداً وأعمَلْ لإخِرّتِكَ كَأَنَّكَ تَموتُ غداً)

پەروەردگار لەقورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿ وَآتَاكُمْ مِنْ كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ وَإِنْ تَعُدُّوا نِعْمَتَ اللَّهِ لا تُحْصُوهَا إِنَّ الْأِنْسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ ﴾ (ابراهيم:٣٤)

کەوابوو جیٚ ی خۆیەتی ئادەمیزاد پەروەردگار بناسیٚو سوپاسی بکات.

هەروەکو فەرمویەتی: ﴿هَلْ جَزَاءُ الْأِحْسَانِ إِلَّا الْأِحْسَانُ ﴾ (الرحمن: ٦٠)

ئەگەر ئەمە ئەرکی سەرشانی ئادەمیزادنەبیٚ ئەبیٚ چی بکات بەرامبەر بەپەروەردگار.

باڵندەکان کاتیٚ ئەفڕن بەئاسمان دا بەئەستێرەکان ڕێگەی خۆیان ئەدۆزنەوە بۆ ئەو شوێنانەی گەرمیان و کوێستان ئەکەن بۆیان.

ئایا ئادەمیزادیش نابیٚ هەرهیچ نەبێت وەکوو ئەو باڵندانە پەروەردگار بدۆزێتەوە بەدروستکراوەکانیدا ئادەمیزاد خاوەن ئەقڵە و باڵندە بیٚ ئەقڵە بیٚ ئەقڵ بەدروستکراوەکانی پەروەردگار ئەزانیٚو هەندیٚ ئاقڵیش ئەوەندە نازانن!!!!

((ئەگەر هەرکەسێك بتوانیٚ بیسەلمێنیٚ من هەڵەم کردووە لەبیرکردنەوەدا، من زۆر بە دڵخۆشی یەوە ڕاوبۆچوونی خۆم ئەگۆڕم، چونکە دروشمی من ئەو ڕاستی یەیە کەزیانی لەکەس نەداوە هەرگیز.))

مارکس اوریلیوس.

## ـ بەشی دووەم ـ

# ئایا مردن هەیە؟ زیدووبوونەوە هەیە؟

ئایا بێجگە لەم ژیانەی سەرزەوی لەم گەردوونە فراوانەدا ژیانێکی ترمان ئەبێت؟

....ئێمە لەجیهانێکدا ئەژین لەناو گەردوونێکی فراواندا تەنها گەردێك لەکێش و هاوکێشەی زۆربێت یان کەم بکات تێك ئەچێت.

ئەو هێزەی ئەم گەردوونە فراوانە ئەبات بەڕێوە زۆربەووردی و ڕێکوپێکی ناهێڵێ تەنها گەردێك هەڵەی تێداڕووبدات و نیوترۆن ئەگۆڕێ بۆ پرۆتۆن، ئەستێرەیەك ئەمرێ و ئەستێرەیەکی تر دروست ئەکات گەردوونی لە گەردەکان دروست کردووە ـ یەکیان گرتووەو بوون بەگەردیلەو ئەمانیش یەکیان گرتووە بەشەکانی مادەیان پێك هێناوە.

لەبەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا باسی ئەمانەمان کردو ڕوونمان کردەوە کە ئادەمیزاد دوای مردنی و بوونی بەخۆڵ، کۆکردنەوەی ئەو خۆڵە و زیندووکردنەوەی سەرلەنوێ گەلێ ئاسانترلە لەو دروستکراوە گەردوونیانەی کەباسمان کرد هەروەکوو هەورەنەوەوی سەدیم و ئەشکەوتی ڕەش و سپی هتد.....

کارێکی گران نی یە لای پەروەردگار ئەوگەردانەی لەوخۆڵەدان کۆبکرێنەوەو لە ڕۆژی دوایی دا زیندووبکرێنەوە... هەروەکو لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿ أَلَيْسَ ذَلِكَ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يُحْيِيَ الْمَوْتَى﴾ (القيامة: ٤٠)

بەڵێ پەروەردگار توانای هەیە بەسەر هەموو شتێکدا، دوای نەمان و وێرانبوونی ئەم گەردوونە، گەردونێکی تر دروست دەکات و ژیانێکی تری هەتا هەتایی لەسەر دائەمەزرێنێ، کە جوانتر و خۆشترە بۆ ئادەمیزاد بەتەنها و هیچ گیانلەبەرانی تری لەگەڵ دانیەو هەرچی ئاواتەکانی هەن دێنەدی و جێ بەجێ ئەکرێن (بەتایبەتی ئەوئاواتانەی لەسەر زەوی هیوای بوون).

کەوابوو پەروەردگار دروستکراوی خۆی کەڕێزی لێ ناوە نایمرێنێ و نایفەوتێنێ بەڵکو لەشوێنێکەوە ئەیگوێزێتەوە بۆ شوێنێکی تر هەروەکوو چۆن لەناو سکی دایك

دێتەدەرەوە بۆژیانی سەر زەوی بەوجۆرەش لەژیانی سەرزەوی‌یەوە ئەیگوێزێتەوە بۆ ژیانی جیهانی ئەثیری و ڕۆحی کەهەتا هەتایی یە.

هەروەکو فەرموویەتی:

﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثاً وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لا تُرْجَعُونَ ﴾ (المؤمنون:١١٥)

ئەم گەردوونە کاتێك ئەمرێ و ماوەیەك نامێنێ و دیارنابێت.

پاشان سەرلەنوێ پەروەردگار دروستی دەکاتەوە بەڵام بەشێوەیەکی‌تر بۆژیانی هەتاهەتایی.

هەروەکو فەرموویەتی:

﴿ مَا خَلْقُكُمْ وَلا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَاحِدَةٍ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ ﴾ (لقمان:٢٨)

ئادەمیزاد لەدەروونەوە حەزی لەژیانێکی هەتا هەتایی‌یەو مردنی تێدانەبێت بۆئەوەی ئەقڵ و رۆحی تێربێ و تێربوونی ئەم دووانە تەنها بەوژیانەئەبێت.

ئەگەرتەمەنی ئادەمیزاد ئەوەندە درێژبێت، بگاتە هەزاران ملیۆن ساڵ یان بگاتە تەمەنی ئەستێرەکان، چونکە کۆتایی دێت بەمردن تێرنابێت بەوتەمەنە هەرچەندە زۆریش بێت. لەبەرئەوە ئادەمیزاد بەو ئاواتەی ئەگات ئەگەر لەڕێڕەوێکی ڕاستەوە، ڕۆیشت و بەباوەڕی پاك و بێگەردەوە ڕووی‌کردە پەروەردگار بۆ بەجێ هێنانی فەرمانەکانی و هەموو ئەرکە پیرۆزەکانی بەڕێکوپێکی. ئەمەش تاکە ڕێگەیە بۆ ئەوژیانە هەمیشەیی‌یە کەمردنی تێدانی یە بەخۆشی هەتا هەتایە.

بەڵام ئەگەر بەپێچەوانەوە لادان و کوفربوو ئەوە خواپەنامان بدات ژیانی هەمیشەیی پڕلەناخۆشی و ئازارە.

## ( ژیان دوای مردن )

لەم باسەدا پێویستە بەووردی بیروڕای زانا ڕۆحی‌یەکان و زانا فیزیاوییەکان باس بکەین و بۆچوون و ڕای ئاینە ئاسمانی‌یەکانیش (ئیسلام * یەهود * مەسیح * ((فەلە)) )بەراووردبکەین لەگەڵ ئەو دووزانستەدا. تاکو بگەینە ئەنجامێك پەسەندبێت بەلامانەوەو ژیانی دوای مردن باس بکەین و بەبەڵگەی ئایینی و زانستی بیسەلمێنین.

....زۆر دەمێکەو لەسەرەتای تەمەنمەوە کاتیٚ قوتابی سەرەتایی بووم لەوکاتەوە لەشتێك ئەکۆڵمەوە کە تووشم بووە چەندجارێك و باسم کردووە بۆ کەسانی دەوروبەری خۆم وەلآمیان داوەتەوە کەئەوە هیچ نی یە ((مێردەزمە)) بووە بەعەرەبی (شبح)ی پیٚ ئەڵێن واتە سێبەری ئەوشتەی ئەی بینی و نایبینی.

چەند جارێك شەوان لەکاتێکی درەنگ لەناو باخەوە ئەهاتمەوە بۆناودیٚکەمان ((تەوێڵە)) هەستم ئەکرد لەڕێگە خزمێکی خۆم کەماوەی چەندساڵێك لەمەوپێش مردبوو لەنیوەی ڕیٚ دا تووشم ئەبوو ئەویش لەگەڵما ئەهاتەوە بۆ ناودیٚ و بەیەکەوە قسەمان ئەکرد لەوکاتەدا بەبیرمدا نەئەهات کەئەو خزمەم دەمێکە مردووە تاکوو ماوەیەك بەرەودیٚ ئەڕۆیشتین تاکوو نزیك ئەبووینەوە پیٚی ئەووتم تۆ بڕۆ بۆماڵەوە منیش لێرەدا تۆزێك ئەحەسێمەوە لەقەراغی ڕێگەکەدا دائەنیشت لەسەربەردێك و منیش بەرەودیٚ ئەڕۆیشتم پاش دوویان یان سیٚ هەنگاو ئاوڕم ئەدایەوە تەماشام ئەکرد خزمەکەم دیارنی یە هەرچەندە بانگم ئەکردو وەلآم نەئەبوو منیش ترس دای ئەگرتم بەڕاکردن بەرەودیٚ ئەهاتمەوە ئینجا ئەمزانی ئەوخزمە دەمێکە مردووە!!!. دیسانەوە باسەکەم ئەگێڕایەوە هەمان وەلآمم وەرئەگرتەوە کە (مێردەزمە)بووە.

لەم جۆرە ڕووداوانە زۆرم لایەو پێویست بەنووسینی هەموویان ناکات و جاروباریش هاوڕیٚ ی تری خۆم لەگەڵدابوون یەکێك یان دوان ڕووداوی وامان دیوە هەموومان ئاگادارین.

لێرەدا مەبەستم ئەوەیە ئەو ڕۆحانەماون و لەجیهانی تایبەتی خۆیان دان و هەندێکیان توانای گەڕانەوەیان هەیە بۆسەر زەوی و خۆیان پیشان ئەدەن لەبابەتەکانی دا هاتوودا ئەمە ڕوون ئەکەینەوە.

جیهانی ڕۆحەکان دەورەی جیهانی فیزیاوی مادی ئێمەی داوە لەزۆر زۆر دوورەوە. ئەو جیهانە ڕۆحی یانە حەوت جیهانن ئەڵقەیان داوە بەدەوری زەوی دا هەروەکوو حەوت ئاسمانەکان. ئەوجیهانە ڕۆحی یانە لەمادەی ئەثیر پێك هاتوون لەبەرئەوە بەچاونابینرێن و هەستیان پیٚ ناکریٚ. هەموو تەنە گەردوونی یەکان لەناو

ماددەی ئەثیردان بۆشایی گەردوون پڕە لەمادەی ئەثیر ـ زاناکان ئەڵێن ئەثیر ئەوەندە ڕوون و ناسك و تەنکە بەچاونابینرێ و هەستی پێ ناکرێ.

ئادەمیزادیش لەشی مادەی فیزیاوی یە و ڕۆحی ئەثیری لەناودایە هەروەها ئەقڵی فیزیاوی ئەقڵی ئەثیری لەگەڵدایە.

کتێبی ڕۆحی و زانستی زۆرم خوێندوەتەوە لەهەموویان گرنگتر بەلامەوە کتێبەکەی/ ج ـ آرثر فندلای کەبەناونیشانی (العالم الأثيري) (الحياة بعد الموت) کە j.Arthurfindlay لەئینگلیزی‌یەوە کردوویەتی بەعەرەبی ((أحمد فهمی)) هەرلەبەرئەوە ئەم زانایە زۆر بەزانستی و بەڵگەی زانستی سەلماندوویەتی جیهانی ڕۆحی هەیەو هەموو ڕۆحەکان لەوێن منیش لەبەرئەوە زۆربەی ئەم باسە لەسەر ڕۆشنایی زانیاری ئەوکتێبە ئەنووسم.

حەوت جیهانە ئەثیری‌یەکان شوێنی ڕۆحە ئەثیری‌یەکانن ئەثیر مادەیەکی زۆرتەنك و ڕوونە چڕی‌یەکەی ئەوەندە کەمە هەستی پێ ناکرێ.

## ئێمەی ئادەمیزاد:

لەم جیهانەدا لەشمان مادەیەکی فیزیاوی‌یەو رۆحی ئەثیری تێدایەو ئەقڵی ئەثیری.

بەڵام لەشی فیزیاوی ئەمرێ و ئەڕزێ و ئەبێ بەخۆڵ تەنها لەشی ئەثیری ئەمێنێ بەڕۆح و ئەقڵی ئەثیری‌یەوە. دوای مردن بەرەو جیهانی رۆحەکان ئەڕوات.

بەڵام لەڕۆژی دوایی و زیندووبوونەوەدا هەر ڕۆحێك ئەچێتەوەناو ئەو گەردە کە لەشە فیزیاوی یە ڕزیوەکەی خۆیەتی ئەگەر تەنها گەردێکیش بێت بەفەرمانی پەروەردگار ئەو ڕۆح و ئەو لەشە فیزیاوی‌یە یەك ئەگرنەوە هەروەکوو لەئایەتە پیرۆزەکاندا لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە ئەمە لایەنی ئاینی.

لایەنی زانستی شتێکی وای جیاواز نی یە چونکە لایەنە زانستی یەکەش هەر ئەڵێ ڕۆح ئەمێنێ و مردنی هەتا هەتایی نی یە بەڵام ژیانی هەتا هەتایی هەیە.

کەوابوو هەموو بوونەوەرێك لەشی فیزیاوی و ئەقڵی فیزیاوی و ڕۆحی فیزیاوی هەیە: لەشی فیزیاوی هەموو لەشیەتی بێجگە لە ئەقڵی فیزیاوی کەمێشکەو ڕۆحی فیزیاوی کەدڵە.

لەشی ئەثیری و ئەقڵی ئەثیری و ڕۆحی ئەثیری هەیە لەناو ئەوبەشە فیزیاوییانەدا.
چوونەدەرەوەی ڕۆح لەلەشی فیزیاوی‌دا هەروەکوو چۆن کەوێك لەقەفەزێك دائەخوێنیٚ وەدەنگی لێوەدیٚ و ئاوئەخواتەوەو دان ئەخوات و جم وجوڵێکی هەیە. بەڵام کەوەکە لابەرین قەفەزەکە بیٚ‌دەنگ و خامۆش ئەبێت و وەکوو لەشی مردووەکە وایە.

کەوەکەش وەکو ڕۆحەکەوایە لەهەموولایەك دا ئەجولیٚ و ئەخواو ئەخوێنیٚ.

هەندیٚ جار دەستمان یان قاچمان بریندارئەبێت ئازاری هەیەو ئەزانی ئازارەکە هی دەستەیان قاچ و هەستی پیٚ ئەکەین ئەمە ئازاری لەشی فیزیاوی یە.

بەڵام ئەگەر کێشە و گیروگرفتێك یان ناخۆشی‌یەکمان هەبوو هەست بەئازارێکی گشتی ئەکەین زۆرناخۆش ترە لەدەس و قاچ ئێشە. ئەمە ئازاری رۆحە.

ئەگەر بڵێین بۆچی رۆح نابینین دیارە لەمادەی ئەثیری‌یە و ئەثیر بەچاونابینریٚ و هەستی پیٚ ناکریٚ.

کەوابوو مردن ئەوەیە لەشی ئەثیری یان (رۆحی) جیائەبێتەوە لەلەشی فیزیاوی واتە (مردن بریتی یە لەدەرچوونی رۆح لەم جیهانەدا بۆ جیهانە رۆحی یەکان)

هەروەکو لەتەڵقینی مردوودا لەسەرقەبران ئەڵێن:

| | |
|---|---|
| خَرَجتَ من دار الفَناء | وَوَصَلْتَ إلى دارِ الْبَقاءْ |
| خَرَجتَ من دار الغرور | وَوَصَلْتَ إلى دارِ السرور |
| خَرَجتَ من دار المحنة | وَوَصَلْتَ إلى دارِ الرحمة |

لەهەرسیٚ جارەکەدا باسی چوونە دەرەوەیە بۆ جیهانی رۆحی هەتا هەتایی و لەئایینی ئیسلام دا ئەم جیهانە بەجیهانی (بَرزَخْ) باس ئەکرێت.

کەوابوو تەڵقینی مردوو بۆچی یە؟

زاناکان ئەڵێن: دەنگ لەهەوادا ئەمێنێتەوەو نافەوتیٚ، کەوابوو ئەوقسانە لەتەڵقینەکەدا هاتوون کەئامۆژگاری یە بۆ مردووەکە هەموو ئەوقسانە لەهەوادا ئەمێننەوە لەسەر قەبری مردووەکە. دیسانەوە زانا رۆحی یەکان ئەڵێن: ئەورۆحەی لەلەشی فیزیاوی ئەچێتە دەرەوە سیٚ ڕۆژ لەدەوری لەشە فیزیاویەکەی و کەس و کارو ماڵەکەیان دا ئەمێنێتەوە پاشان سەرئەکەویٚ بۆ جیهانی رۆحی.

کـەوابوو ئەوڕۆحـە ئـەثـیری یـە و ئـەو ئامۆژگاریانـەی لەتەڵقینەکـەدا هـاتووە لەهەوادایـە لەسـەر قەبرەکـە رۆحەکـە ئەچـێتەوە نـاو لەشـە فیزیاوی‌یەکـە بەفـەرمانی پەروەردگار گویٚ ی لەو قسانەئەبێت و پاشان مە لائکە پرسـیاری لیٚ ئەکـەن ئەگـەر پاك و چـاك بووبێـت لـەدنیادا ئـەوە بـەڕێکوپێکی وەڵام ئەداتـەوە ئەگـەر خـراپیش بـووبیٚ نازانیٚ و مەلائکە ڕێنومایی ئەکەن بۆ جیهانی ڕۆحە خراپەکان.

وەئەگەر باش بووبێت ڕێنومایی دەکەن بۆ جیهانی ڕۆحە چاکەکان.

مادییەکان ئەثیر بەڕاست نازانن، ئەڵێن شـتێك نەبینریٚ و هەسـتی پیٚ نەکریٚ لای ئێمە پەسەند نی یە!!!.

ئەمـە تـەنها دژایـەتی کردنـی ئاییـنـە ئاسمـانی یەکانـە...چـونکە زۆر لـەزانا بەناوبانگەکان راستی ئەثیریان سەلماندووەو باوەڕیان بەپەروەردگارهێناوە.

هێزی کارەبایان تـەزووی کارەبا لـەناو تەلـەکان دا نـابینریٚ بـەڵام کارەبا لەتەلەکـەدا هەیە ئەگەر دەستی لیٚ دەین ئەمانگریٚ.

دەنگ بەهـەوا ئەگوێزرێتـەوە بۆشـوێنێکی تر کەچـی نـابینریٚ تەماشای هەوابکـەین هیچ دیارنی‌یە. هەروەها تەلەفزیۆن سەتەلایت و ئینتـەرنێت. وێنـەودەنگ ئەگوێزنـەوە بەهەوادا. بەڵام نەوێنەو نەدەنگ نابینین لەهەوادا.

لێرەدا ئەبیٚ ئەوە بڵـێین: ئەوانـەی کەسـێکی خۆشەویستیان لـەم جیهانـە فیزیـاوی یەوە کۆچ ئەکا بۆ جیهانی رۆحی پێویست ناکات دڵتەنگ بن چونکە ئەوانیش وەکـوو خۆشەویستەکەیان لەم جیهانە فیزیاویە ئەو کۆچە ئەکەن.

ئەو کۆچ کردنـەی کـەرۆحی ئـەثیری پـاش سـیٚ ڕۆژ بەیـەکجاری مـاڵ و کـەس و کـارو گۆڕەکەی بەجیٚ‌ئەهێڵیٚ و ئەڕواتە جیهانی ئەثیری.

## زانا رۆحی یەکان ئەڵێن:

ئەو رۆحانەی پێش تر کۆچیان کردووە بۆ جیهانی ئـەثیری کـاتیٚ کەسـێکی خۆیـان کۆچ ئەکات ئەوان پاش سیٚ ڕۆژ ئەزانن و پێشوازی لەورۆحـە خزمـەیان ئەکـەن و ئـەو رۆحەش ماوەی شەوو رۆژێك ماندووو بیٚ ئاگایە خزمانی رۆحی لەدەوریـدان و تـاکوو

دێتەوە هۆش خۆی و بەیەکتر شادئەبنەوەو ڕێنومایی ئەکەن بۆ ژیانی نویٚ لەجیهانی ڕۆحی دا.

زانا ڕۆحی یەکان هەندیٚ مەرجیان داناوە بۆئەوەی بتوانین قسە لەگەڵ ئەوڕۆحانەدا بکەین کەماوەیەکی زۆر یان کەم لەمەوپێش کۆچیان کردووە لەم جیهانە فیزیاوی‌یەوە بۆ جیهانی ڕۆحی لەو مەرجانە:

(( **ناوەند** )): ( **ژووری ئامادەکردن** ) ( **ئامێرەکان** )

بۆئەوەی بەئاسانی بتوانین قسە لەگەڵ کەسێك یان خزمێك یان هاوڕیٚیەکی خۆمان کەماوەیەك لەمەو پێشتر زۆربێت یان کەم کۆچی کردبیٚ لەم جیهانە فیزیاوی یەوە بۆ جیهانی ڕۆحی ئەثیری.

**پێویستمان بە (( ناوەندێك )) هەیە :**

ئەوناوەندە ئەوەیە لەڕۆح ناسین دا شارەزایە لەنێوان تۆو ئەوڕۆحەی ئەتەویٚ قسەی لەگەڵ بکەی

ئەو (ناوەندە) پێویستە لەشی مادەی (ئەکتۆپلازمی) زۆری تێدابێت. lectoplasm

کەوابوو هەموو ئادەمیزادێك ناتوانیٚ ناوەندبێت کەسانێکی تایبەت نەبن بە زۆری ئەو مادەیە لە لەشیاندا هەبێت چوونکە ئەم مادەیە لەهەر لەشێکی فیزیاوی‌دا زۆربوو ئەوکەسە هەستی بینینی زۆر زۆرئەبێت و لەزۆر دوورەوە شت ئەبینیٚ و هەستی بیستنی زۆرئەبێت و لەزۆردوورەوە ئەبیسیٚ هەروەها شتی ڕابردووی کۆن دێنە پێش چاوی و شتی دواتریش دێنە بەرچاوی ئەتوانیٚ بەئاسانی قسە لەگەڵ ڕۆحەکان بکات.....

لەڕابردوودا ئەوانەی ئەوماددەی (ئەکتۆپلازمەی لەشیان) زۆربووبێت بوون بەدووبەشەوە:

١-هەندێکیان زیاتر باوەڕیان بەپەروەردگار هێناوەو بۆ خزمەتی ئاین و خواپەرستی توانایان بەکارهێناوە.

٢-هەندێکیان بۆ کاسپی کردن و دۆعاو جادوو نهێنی زانین ناوی خۆیان ناوە یان شێخ یان وەلی هتد...

بۆ خەڵەتاندنی خەڵك و پارە پەیداکردن. ئەوەی شایانی باسە شتی زۆریان زانیوە لەم راستی یە لانادەین.

زانا رۆحی یەکان ئەڵێن:

قسەکردن لەگەڵ رۆحەکان دا لەتاریکی دا باشترەو بە ئاشکرا دیارە.

بەلام لەرووناکی دا زۆر بەباشی ئاشکراو دیارنی یە چونکە رووناکی کارئەکاتەسەر لەرینەوەی ئەثیر و قسەکردنەکە لەگەڵ رۆحەکان دا تێکەڵ ئەبێت. بەلام لەتاریکی دا زۆرباشە و روون و ئاشکرایە.

هەروەها هەندێ لەزانایانی رۆح و ئەثیر ئەڵێن ئەگەر رووناکی یەکە سپی بێت باش نی یە و کارئەکاتەسەر شەپۆلە ئەثیری یەکان و قسەکردن لەگەڵ رۆحەکاندا زۆربەباشی ناکرێت بەلام ئەگەر رووناکی یەکە سووربێت ئەوەندە کارناکاتەسەر شەپۆلە ئەثیرییەکان و قسەکردن لەگەڵ رۆحەکاندا............. بەئاسانی ئەکرێت بەلام لە تاریکی دا باشترە.

هەروەها ئەڵێن ئەبێت ئەوناوە زۆر خامۆش بێت و هەوا لەباربێت چونکە ئەگەر هەورو شێ داربوو ئەوە لەبارنی یە بۆ قسەکردن بەلام سایەقە بێت لەبارە.

ئەوانەی باسمان کردن هەرلەناوەندەوە تاکوو ئێرە ئەومەرجانەن کەپێویستن بۆئەوەی قسە لەگەڵ رۆحەکان بکەین.

بەلام لەهەموو مەرجەکان گرنگتر مرۆڤە (ناوەندەکەیە) واتە ئەوکەسەیە(ئەکتۆپلازمی لەشی) زۆرەو زۆرترە لەمرۆڤی ئاسایی بەم جۆرە دەرکەوتووە کاتێك قسە لەگەڵ رۆحەکان ئەکەن دەنگی ئەو رۆحانە هەروەکوو دەنگی خۆیان وایە کەلەسەرزەوی بوون کاتی خۆی دەنگیان نەگۆڕاوەو بەهەمان شێوە قسەئەکەن واتە زمانەکەی خۆیان چۆن بووە هەربەو زمانە قسەئەکەن.

لێرەدا ئەم خاڵانەی خوارەوەمان بۆ دەرئەکەوێ:

١–لەمەوپێش ئەوەندە بایەخ نەدراوە بەزانستی رۆح چونکە ئەوانەی (ئەکتۆ پلازمیان زۆربووە) زانست نەیزانیوە هۆی ئەو زۆر زانی یە یان ئەو مادەیە بووە بەڵام کەبۆ زاناکان دەرکەوت هەندێکیان بەیەکجاری زانستی ئەم بوارەیان گرتەبەر واتە (زانستی رۆحی)و بەردەوام لێ ی ئەکۆڵنەوە.

ئێستا لەجیهاندا لەزۆربەی وولاتان دا سەدان پەیمانگە و زانکۆی تایبەت هەیە بەجیهانی رۆح.

٢–زۆربە ئاشکرا بۆمان دەرئەکەوێ ئێمە زۆر زۆرکەم ئەزانین لەگەردوون.

٣–ئەم باسە ئەیسەلمێنێ کەهەستەکانمان توانای زۆر زۆریان هەیە ئەگەر مادەی (ئەکتۆ پلازمی لەشمان ) زۆربێت و ئەتوانین پێش بینی بکەین و شتی زۆر زۆر بزانین.

بەڵێ لەرابردوودا بەهۆی دەسەڵاتی ئەو فەرمانڕەوایانەوە کەزانست و زانستی رۆحیان بەلاوە پەسەندنەبوو چونکە زیانی هەبوو بۆ بەرژەوەندی ئەوان گەشەی نەئەکردو پێش نەئەکەوت چونکە زانست بەهەموو شێوەکانی‌یەوە زیان ئەدات لەدواکەوتن.

بەڵام دوای پەیدابوون و داهێنانی چاپ و دەرکەوتنی زانایان و داهێنەران وەکوو: گۆتنبرگ ـ کوپرنیکوس ـ کبلر ـ گالیلۆ ـ لێونارد ـ داڤنشی ـ ئیسحاق نیوتن ـ هتد..........

تیشکی رووناکی زانست پەردەی شەوەزەنگی تاریکی و دواکەوتنی سووتاندو زانست بەرەو پێشەوە رۆیشت بەهەموو بەشەکانی‌یەوە.

لەسەرەتای سەدەی بیستەم دا زانایان رای خۆیان گۆڕی و بۆیان دەرکەوت ئادەمیزاد تەنها زیندەوەرێکی فیزیاوی نی یە بەڵکو فیزیاوی و رۆحی یە ئەمەش دوای ئەوەی زانست دروست بوونی مادەی بۆ روون بوویەوە هەروەها زانا رۆحی یەکان سەلماندیان و قسەیان لەگەڵ زۆر لەرۆحەکان کرد، مەبەست لەزانا رۆحی یەکان ناوەندەکانن کە (ئەکتۆپلازمیان) زۆرە هەروەکو باسمان کرد.

لەسەدەی هەژدەو نۆزدەدا، زاناکان ئەیان ووت:

مادە لەگەردەکان پێك هاتووەو یەك ئەگریٚو گەردیلە پێك ئەهێنیٚ و گەردیلەکان یەك ئەگرن و تەنە ماددی یەکان پێك دێنن بەڵام کەزانست پێش کەوت و تیشکی سینی دۆزرایەوە، بەهۆی ئەم تیشکەوە زاناکان لەمادە گەیشتن کەلە ئەلەکترۆن و پرۆتۆن و نیوترۆن و ناوك و هەندیٚ شتی تر پێك هاتووەو بۆیان دەرکەوت گەردوون تەنها فیزیاوی نی‌یەو گەردوونی ڕاستی ئەثیری‌یەو هەروەکو زاناکانی ئەم بوارە باسی ئەکەن و بەرامبەر مادی‌یەکان ئەڵێن:

﴿ ئەوانەی کە تەنها باوەڕیان بەمادە هەیە............. بەشێکی کەم یان ڕوویەکی کەمی گەردوون ئەبینن بەڵام ئەوانەی باوەڕیان بەمادەو بە ئەثیر هەیە هەموو بەشەکانی گەردوون ئەبینن ﴾!!!!

بۆ نموونە:

ئەگەر دووکەس لەباخچەیەکدا دانیشن یەکێکیان بەشەو یەکێکیان بەڕۆژ. پاشان داوابکەین هەریەکێکیان باسی باخچەکەبکات.

تەماشا ئەکەین ئەوەی کەبەشەو لەباخچەکەدابووە تەنها باسێکی کەم ئەزانیٚ لەباخچەکەو ئەوشتە نزیکانە باس ئەکات کەدیویەتی چونکە شەوبووە لەهەموو لایەکەوە هەموو شوێنێکی باخچەکەی نەدیوە.

بەڵام ئەوەی بەڕۆژ لەباخچەکەدابووە زۆر بەدرێژی و ڕێك و پێکی باسی کون و قوژبنی باخچەکەدەکات.

کەوابوو ئێمە هەتاکوو زیندووین لەم جیهانەدا وەکوو ئەوکەسە یان واین کەباخچەکەی بەشەو دیوە.

بەڵام دوای مردن ڕۆحمان چووە جیهانی ڕۆحی و ئەثیری‌یەوە وەکوو ئەوەیان واین کە باخچەکەی بەڕۆژ دیوە لەجیهانی ئەثیری‌یەوە هەردوولاکەی گەردوون ئەبینن (ئەثیری و مادی).

ئادەمیزاد لەسیٚ شت پێك هاتووە: (لەش، نەفس، ڕۆح) لەش فیزیاوی یە، نەفس ئەقلە، ڕۆح: لەشی ئەثیری یە کەڕێکی لەشی فیزیاوی یە و لە ناوی دایە. ئەم ڕۆحەیە

ئەبێتەهۆی ئەوەی لەشی فیزیاوی یەکگرتووبێت و جموجوڵ و بیرکردنەوەو هەموو کردارەکانی هەبێت.

لەشی فیزیاوی ئەقڵی فیزیاوی هەیە کەمێشکە. لەشی ئەثیری ئەقڵی ئەثیری هەیە.

زانا رۆحی یەکان ئەڵێن: گەردوونی مادی دروست کراوە بۆ کاتێکی دیاری کراو۔ نەمان و تێك چوونی رووئەدات.

هەر ئەم زانا رۆحیانە ئەڵێن: ئەمە ڕاستەو گەردوونی ئەثیری چاوەڕێ ی ئەو رۆژەیەو ئامادەکراوە لەلایەن پەروەردگارەوە هەرگیز فەوتانی نی یە و کۆتایی نایەت و تێك ناچێت و ژیانی هەتا هەتایی یە.

کەوابوو بەگوێرەی ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان ئەم زانستەو ئاینی ئیسلام دەربارەی رۆح و جیهانی رۆحی (بەرزەخ)وەکوو یەك وان و هیچ جیاوازی یەکیان نی یە.

چونکە ئاین و زانستی رۆحی هەردووکیان ئەڵێن:

لەش ئەمرێت و رۆح ئەمێنێ و ئەستێرە ئەمرێت و ئەستێرەش دروست ئەبێت تاکوو گەردوونی مادی یان فیزیاوی کۆتایی دێت.

﴿وَأَنَّ السَّاعَةَ آتِيَةٌ لا رَيْبَ فِيهَا وَأَنَّ اللَّهَ يَبْعَثُ مَنْ فِي الْقُبُورِ﴾ (الحج: ٧)

واتە: ئەوکاتە دێت و شکی تێدانی یە.

بەڵام ئەبێ ئەوەبزانین:

ئەقڵی ئادەمیزاد لەسەرووی ئەثیرییەوەیە............ واتە گرنگترە و super/ etheric هیچ ئادەمیزادێك ناتوانێ باسی ئەقڵ بکات و بزانێ لەچی پێك هاتووەو چۆن دروست بووە هەتاکوو لە لەشە فیزیاوی یەکەی دابێت. لەبەرئەوە ئەقڵ لەسەرووی ئەثیرییەوەیەو گرنگترە چونکە دوای مردنی لەشی فیزیاوی ئەقڵ کارئەکات و ڕێنومایی رۆحی ئەثیری ئەکات و ڕێکوپێکی ئەکات. چونکە: ئەگەر ئەقڵ لەئەثیر گرنگتر نەبوایە ئەوانەی کەوێنە ئەثیرییەکان ئەبینن یان قسە لەگەڵ رۆحە ئەثیرییەکان ئەکەن خراپیان ئەکرد بەوانە بەڵام ئەقڵی سەرووی ئەثیری لەو ڕۆحە ئەثیرییانەدا ناهێڵێ هیچ کەسێك لەوانەوە دەستیان بگاتێ و زیانیان لێبدات و خراپیان بکات. کەوابوو ناوەندەکان:

ڕۆحە ئەثیری یەکان و وێنە ئەثیرییەکان ئەبینن بەڵام دەستیان ناگاتە لایان چونکە ئەقڵی سەرووی ئەثیری ناهێڵێ!!!!

لەشی ئەثیرییە پارێزگاری لەشی فیزیاوی مادی ئەکات لەسەر زەوی کەوابوو ئەگونجێ هەموو بوونەوەرەکان لەگیاندارو بێ گیانەکان لەشی ئەثیری یان هەبێت.

بەمردن ئەقڵ نافەوتێ بەڵکو ئەقڵی مادی کەمێشکە ئەڕزێ وەکوو بەشەکانی تری لەشی مادی بەڵام ئەقڵی ئەثیری لەرۆحی یان لەشی ئەثیریدا ئەمێنێ کارەکانی خۆی ئەنجام ئەدات لەجیهان و بارودۆخێکی تری جیاواز لەبارودۆخی جیهانی فیزیاوی پێش مردنی لەشە فیزیاوی یەکە. هەروەکوو ئەقڵی جیاوازە لەمێشکی فیزیاوی، ژیانیشی جیاوازە لەلەشی فیزیاوی ئەویش بەستراوە بەڕۆحی ئەثیری یەوە، بەڵام ئایا چ کاتێك تێکەڵ بە لەشی فیزیاوی بووە؟

بێ گومان (العلم عندالله) زانست لای پەروەردگارە و بە ئایەتی قورئان بۆی باس کردووین و فەرموویەتی:

﴿وَيَسْأَلونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلاً﴾ (الاسراء:٨٥)

واتە: فەرموویەتی بە پێغەمبەرمان محمد(د.خ)

پرسیاری ڕۆحت لێ ئەکەن بڵێ رۆح فەرمانی پەروەردگارەو زانستمان پێ نەداون کەمێك نەبێت.

هەموو ژیان و بیرێك لەیەکەم بوونەوەرەوە دەستی پێ کردووە.

ئادەمیزادیش هەروەکوو لەبەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا باسمان کرد لەخۆڵە گەردوونی یەکان دروست کراوە ئەمەڕای زانستەو ئاینی پیرۆزی ئیسلام پێش ١٤٠٠سال ئەمەی ڕاگەیاندووە

هەروەها یەکەم مرۆۋ بەفەرمانی پەروەردگار لەلایەن مەلائکەوە دروست کرا لەوخۆڵە گەردوونی یە باپیرە گەورەی ئادەمیزاد گەورەمان ئادەم بوو پاشان پەروەردگار رۆحی کردەبەر کەوابوو رۆح و لەشی فیزیاوی جیاوازن.

رۆح ئەتوانێ لە جیهانی ئەثیریدا کاری خۆی بکات و لەژێردەسەڵاتی ئەقڵی ئەثیریدا بەبێ لەشی فیزیاوی و مادی.

## زانا رۆحی یەکان ئەڵێن:

جیهانی مادی کاتییەو نامێنێ، مادە هەرچەندە ئێستە لەلامان زۆر زۆر گرنگەو گرنگترین شتە لەگەردوون دا، بەڵام بێ نرخترین شتە!!!

چونکە ئەوشتانەی ئەبینرێن کاتین و بۆماوەیەکی دیاری کراو لەلایەن پەروەردگارەوە ئەمێنن پاشان کۆتاییان دێت، بەڵام ئەوشتانەی نابینرێن هەتا هەتاین هەروەکوو جیهانی ئەثیری.

زانستی سەدەی نۆزدەهەم لەهەموو سەدەکانی پێش خۆی زیاتر مەتەڵی مادەو گەردوونی روونکردوەتەوە.

پێش ئەم سەدەیە، مادە لای زاناکان هەموو شتێك بوو بێجگە لەمادە هیچی تر لەگەردوون دا نی یە بەڵام لەسەدەی نۆزدەهەم دا رای زانست گۆڕانی بەسەرداهات چونکە پێش کەوتنی زانست پلە پلەیەو، لەپلەیەکەوە ئەڕوا بەرەو پلەیەکی پێش کەوتووتر.

تاکوو ئەوکاتە زاناکان ڕایان وابوو مادە تەنها تەنە رەقەکانن و یەك یاسایان هەیە هەروەکوو زانایان

هیکلHaeckelو هکسلیHuxley (لایان وابوو ئادەمیزاد بەرهەمێکی فیزیاوییەو کارەکانی و بیرەکانی بەشێوەیەکی میکانیکی رووت ئەنجام ئەدات.

هەروەها لایان وابوو شوێنی شتێکی تر نی یە لەدەرەوەی جیهانی فیزیاوی هەمووشتێك لەگەردوون دا مادەیەو ئەبینرێ و هەستی پێ ئەکرێ بەیاسای تایبەتی خۆی) لەبەر ئەوە ئێمە پێویستە بڵێین:

ئەوە پلەیەکی زانست بووە لەکاتێك دا، بەڵام زانستی ئێستا پێش کەوتووترەو لە کاتێکی تردایە و پلەیەکی ترە، لەبەرئەوە بەرپەرچی ئەو راووبۆچوونە کۆنانە ئەداتەوە.

ئـاين: ئـاينی پـیرۆزی ئیـسلام هـەر لەسـەرتاوە لـەقورئانی پـیرۆزدا پـەروەردگار فـەرموودەکانی روون و ئاشـکرا لـە ئایـەتی سـورەتە پیرۆزەکانـدا وەکـوو گەوهـەر ئەدرەوشێتەوە کەلەزۆر جێگاوە فەرموویەتی(رۆح جیایە لەلەش).

(مردن گواسـتنەوەیە لەم ژیانـە کاتی یـە فیزیاوی یـە بۆ ژیـانی جیهانی ئـەثیری (بەرزەخ) و پاشان هەتا هـەتایی و کۆتـایی نـەهاتووە هـەروەها باسـی رۆحـە چاکەکان و شـوێنەکانیان (الجنـة)) بەهەشـت باسـی رِۆحـە خراپـەکان و شـوێنە کانیـان هـاتووە چەندجارێك.الجحیم (دۆزەخ).

ئەوباسـانەی لـەقورئانی پـیرۆزدا کـراوە دەربـارەی گـەردوون هێـشتا زانـست نەگەیشتووەتە ئەو ئاستەو ئەوپلەبەرزە.

بەڵام لەئاینەکانی تردا شتێکی وایان نەزانیوە لەبارەی ژیان دوای مردن.

فـەرمان بەچـاکەو دوورکەوتنـەوە لەخراپـە لـەو ئاینـەدا هـاتووەو لـە کتێبـە ئاسمانی‌یەکانیان دا باس کراوە.

وەکوو: جوولەکە/ تورات. فەلە/ ئینجیل.

بـۆ نموونـە: باسـی بەهەشـت و دۆزەخ لەسـروودی زۆر زۆر دووره باسـی بەهەشـت بـەوجۆرە ئـەکات، بـۆ رۆحـە چـاکەکان کەوێنەیـەکی ڕەنگـاورەنگی((قودسـە)) یـان (ئورشەلیم). ئەوەندە بـەدووردانراوە هـەروەکوو لەسـەدیمە زۆر دوورەکـان دابێـت یان لەکۆزارو ئەشکەوتە سپی یەکاندا بێت کەهەزاران ملیۆن ساڵی رووناکی دوورن.

هـەروەها سـەدیمێکی زۆر زۆر دووریـش کـە ئـاگرە دانـراوە کەدۆزەخـە بـۆ رۆحـە خراپەکان.

کەوابوو نەزانست و نەئاینەکانی تریش نەیان ئەزانی کەجیهانی رۆحی لەدەوری ئەم جیهانەی ئێمەدا (جیهانی بەرزەخ) هەن کەئاینی ئیسلام بەحەوت ئاسمان باسـیان دەکات و ئەوەشـیان ڕاگەیانـد کەهەنـدیٚ لـەزانایان بە حـەوت جیهـانی ئـەثیری باسـیان دەکەن یان بەحەوت جیهانی رۆحی.

ئەثیریش مادەیە لەم رووناکی یەی ئێمە رووناك ترە لەهەموو مادەیەك تـەنك و نـەرم تـرە بـەجۆرێك هەسـتی پـیٚ ناکـەین و نـابینریٚ ، ئەوجیهانـە ئـەثیری‌یانـە جێگـەی ئـەو

ڕۆحانەن کەدوای مردن(هەروەکوو زانا ڕۆحییەکان ئەڵێن) ڕۆحی لەشە مردووەکە ئەگاتە ئەم جیهانە ئەثیری یانە یان ڕۆحی یانەو ئەو لەشە فیزیاوییە ئەچێتەوە ناوخۆڵ و ئەبێتەوە بەخۆڵ چونکە خۆی لەخۆڵ دروست کراوە.

تەنها ئاین لەجیهان دا ئاینی ئیسلامە زۆر زۆر بەڕاستی ئەم زانستییە ڕۆحییەی بەڕوون و ئاشکرا لایەو کەئەڵێ ڕۆح جیاوازە لەلەش...

لەبەرئەوەی کاتی خۆی دژایەتی یەکی زۆرهەبوو لەنێوان زانایانی ئیسلام و زانایانی زانست کەبڕوایان تەنیا بەدونیای مادە هەبووە، نکۆڵیان لەدونیای غەیب دەکرد. ئیسلامەکان زاناکانیان بەکافر ئەزانی و زاناکانیش ئیسلامەکانیان بەدواکەوتوو ئەزانی!!!.

بەڵام لەسایەی پێش کەوتنی زانستەوە: دەرگای سەردەمێکی نوێ کرایەوە، تا وای لێ هات ئاین و زانست بوونە دوو هاوڕێ ی یەکتری.

ئێستا لەزۆربەی زانستە سروشتیەکاندا گەیشتوونەتە ئەنجام هەروەها لەزانستی ڕۆحیش دا.

بەڵام جێگەی تێڕامانە کە زۆربەی زانایانی زانست و زانایانی ڕۆح لەووڵاتانی جیهانی کوفردا گەیشتوونەتە ئەنجامی هەموو ڕاستیەکانی قورئانی پیرۆزو باوەڕیان بەپەروەردگار هێناوە بەئاشکراو ڕایان گەیاندووە کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ڕاستی یەکان بۆ هەموو جیهان روون ناکەنەوەو نایانەوێ بەموسڵمانان بڵێن ئاینەکەی ئێوە ڕاستییەو زانستەو پێش کەوتنە، چونکە ووڵاتانی ئیسلامی خاوەنی گەورەترین و زۆرترین سامانی کانزایین لەسەر زەوی لەبەرئەوە ڕژێمە سەرمایەدارەکان ئەیانەوێ شوێن و سامانی ئەم ووڵاتە ئیسلامانە بۆخۆیان و بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان بێت.

بەڵام پێویستە ئەوە لەیادنەکەن کەلەقورئانی پیرۆزدا پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِنْ بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ﴾ (الانبياء:١٠٥)

﴿يُرِيدُونَ لِيُطْفِئُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَاللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ﴾ (الصف:٨)

﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾ (الحجر:٩)

سروشتی ئادەمیزاد وابووە هەر لەسەرەتاوە گەڕاوە بەشوێنی نهێنی یەکانی گەردوون دا لەبەرئەوە، زاناکان بەردەوامن لەگەڕان و دۆزینەوەی نویٚ، بۆیە زانستی سەدەی بیستەم جیاوازی زۆرە لەزانستی سەدەی نۆزدەهەم.

یەکەم جار گەرد دۆزرایەوە پاشان ئەلەکترۆن...

بەلاٚم ئایا گەیشتنە کۆتایی؟ بیٚ گومان نەخێر، چونکە ئەلکترۆن هەموو شتێك نەبوو بەڵکو لەم ساڵانەی دوایی دا دۆزینەوەی زانستی فراوان بوو، گەردوون ناسەکان بەدووربینەکانی یانەوە قووڵایی ئاسمان تەماشائەکەن، میکرۆسکۆبەکانیان زیندەوەری وامان بۆ ئەدۆزێتەوە کە چاوی فیزیاوی هەرگیز نایبینیٚ.

هەروەها زانستی فیزیاوی و زانستی پاراسایکۆلۆجی نزیك بوونەوە لەیەکترو ئەیانەویٚ زانستێکی یەکبوونی دروست بکەن کەپیٚ ی ئەڵێن(سایکو فیزیاوی) واتە زانستی فیزیاوی دانی ناوە بە زانستی رۆحی داو هەردوو زانستەکە زۆر لەیەکتر نزیك بوونەتەوە....

زانستی نویٚ توانای ئەوەی هەیە گەردی مادە ئەتەقێنێتەوە ئەمە بێجگە لەوەی ئەلەکترۆن و پرۆتۆن و نیوترۆن و ناوك و بارگەی کارەبایی یان لەگەردێکدا دۆزیوەتەوە کەبەچاو نابینرێت، یاساو ڕێك و پێکی یەکی سەرسوڕهێنەری هەیە هەروەکوو کۆمەڵەی خۆر دروست کراوە.

وادەرئەکەویٚ بێجگە لەم جیهانە فیزیاوی یە جیهانێکی تری رۆحی هەیە کەهەستی پیٚ ناکەین و نابینریٚ.

هەروەکوو لەمەوپێش ناوی گەردێکی مادەمان نەئەزانی چی تێدایە ئەمڕۆش نازانین لەدەرەوەی جیهانی فیزیاوی چی هەیە تەنها بەزانستی رۆحی خەریکە زۆرشت دەرئەکەویٚ و جیهانی رۆحەکانمان بۆئاشکرا ئەبێت هەروەکوو چۆن زانستی فیزیاوی رۆژ بەرۆژ پەرە ئەسێنیٚ و پێش ئەکەویٚ هەروەها زانستی رۆحیش پێش کەوتووەو زیاتریش بەرەو پێشەوە ئەڕوا...

تاکوو لەئەنجامدا بەهەردوو زانستەکەوە زۆر نهێنی ئەم گەردوونە تیٚبگەن و ئاشکرای بکەن.

کەوابوو زانستی رۆحی زانستێکی بەرزەو لەهەموو زانستەکان گرنگترە پاشەڕۆژو ژیانی دوای مردنمان بەندە بەم زانستەوە کەبۆمان دەرئەخات جیهانی رۆحەکان لەدەوروبەرماندایەو دوای مردن جێگەمانە، ئەمەش بۆئەوانەی کەبێ باوەڕن و باوەڕیان بەپەروەردگارو زیندووبوونەوە نییە، بەڵام باوەڕداران و خواناسان باوەڕیان هەیەو پێش ئەم زانستەش باوەڕیان بەزیندووبوونەوە هەبووەو بەپەروەردگار هەبووە لەسایەی قورئانی پیرۆزەوەو پێغەمبەری مەزنمان محمد (ﷺ).

پێش کەوتنی زانستی رۆحی ئەگەڕێتەوە بۆ لێ هاتوویی و ئازایەتی و خۆماندووکردنی ئەوکەسانەی رێگای سەختی ئەم زانستەیان گرتەبەرو کۆڵیان نەدا هەرچەندە کۆمەڵ گاڵتەیان پێ ئەکردن و بەسووکی و ساحرو درۆزن تەماشایان ئەکردن.

ئەوزانا بەڕێزانە لەم زانستەدا سوارچاك بوون و پێش کەوتووبوون (سێرو لیم کرۆکس) **sir William crookes**

هەروەها (الفريد – رسل – والاس) **Alfred – Rassel Wallace**

ئەم دووزانایە هەرچەندە لۆمەئەکران و گاڵتەیان پێ ئەکرا بەڵام کۆڵیان نەداو جیهانی رۆحەکانیان دۆزیەوەو کتێبی (بحوث في الظواهر الروحية) کروکس دەریکرد لەساڵی ١٨٧٤ز شوێنەوارێکی زیندووی بەجێ هێشت بۆ زانا رۆحی‌یەکانی دوای خۆی دوای ئەم دووزانا بەناوبانگەی رۆحەکان هەندێ زانای تریش هەڵکەوتن و بەئاشکراو بەشانازی یەوە رایان گەیاند کەجیهانی رۆحی هەیەو دوای مردن زیندووبوونەوەی هەتا هەتایی‌یە.

لەوزانایانەش: لۆردراڵی/Raleighهەروەها مامۆستا: جلبرت مورای Gilbert Marray وە ئەرشیباڵد جیکی Geikie Archibald

لەووڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا(ولیم جیمس)و مامۆستای زانکۆی هارفارد دکتۆر هایسلۆپ **Dr – Hy slop** ئەمانە لەوتەمەنەی کەمابوویان خەرجیان کرد لەڕێگەی پەرەپێدان و پێش کەوتنی ئەم زانستە داو هەزاران گۆڤارو رۆژنامەو کتێب یان نووسیەوەو راستی جیهانی رۆحیان سەلماند.

هـەروەها لەئـەوروپادا/ لۆمبرۆسـۆ Lambroso وەفلامریـۆن Flammarion سـەلماندیان پەیوەندیـەکی روون و ئاشکرا هەیـە لـەنێوان جیهـانی مـادی فیزیـاوی و جیهانی ئەثیری و رۆحیدا.

زانـای جیهـانی فـسیۆلۆجی فەڕەنـسی بـەناوبانگ ریـشیە Richet لەکتێبـە بەناوبانگەکەیـدا (٣٠ سیـساڵ لـەرۆح ناسـی دا) باسـی ئـەم جیهانـە مـاددی و فیزیاوییەو باسی ئەوجیهانە ئەثیری و رۆحی یەی کردووەو پەیوەندی هـەردووکیان و گفتوگۆ لەگەڵ رۆحەکان دا لەم کتێبەدا زۆر بەدرێژی و روون و ئاشکرا باسی کردووە.

دوای ئەمـە ئـەم زانایـە زیـاتر بایـەخی بـەم زانستەداو لـەگۆڤاری نایتـشر Nature لەژێر ناوونیشانی/ زانستی رۆحی دا نووسیوویەتی:

((ئەتوانین بگەین بەرۆحـەکان بـەو هێزانـەی راسـتییەکانمان بۆدەرئەخـەن کەچاوو گوێ و هەستەکانی تر ناتوانن دەری خەن)).

لێرەدا زانا رۆحییەکان خۆیان باش ئەزانن ئەوهێزانـە کەراسـتی یـەکان دەرئەخـەن کامانەن و مەبەستیان لەچی یە؟

بێجگە لەو زانایانەی باسمان کردن دووزانـای بەناوبانگی تـریش هـەن: سـێرئولیڤر لۆدج/Sir oliver Lodge هەروەها:

سیرۆلیێم بارت/Sir. W.Barrett

ئـەم دووزانایـە کـاتێ باوەڕیـان هـەبوو بەئاشـکرا راسـتی جیهـانی رۆحـەکانیان راگەیاند کەکارەکانیان بەتاوان دائەنرا دژی زانست.

## ((زانستی رۆحی ئەکرێ بەچەند بەشێکەوە))

**یەکێك لەو زانستی یە رۆحیانە ئەوەیە:**

١-جوولاندن لەدوورەوە : واتە گواستنەوەی تەنەکان بەبێ دەست لێ دان.

٢-ڕووداوی ئەقڵی: واتە لەهۆش خۆچوون بەبێ چاوکردنەوەو بینین وەبێئاگاو بیستن و هەست کردن لەدوورەوە.

٣-دەنگی راستەوخۆ:

زۆربەی زانا رۆحی یەکان لەم زانستەدا زۆر ماندووبوون و هەندێکیان دوایی تەمەنیان کۆتایی هێناوە لەم بوارەدا، کەوابوو زانستی دەنگەکان پلەیەکی زۆرگرنگە و قسەکردنە لەگەڵ رۆحەکان و خاوەن دەنگەکان خۆیانن دوای مردنیان لەجیهانی رۆحی دا قسەیان لەگەڵ ئەکرێ!!!.

زانای بەناوبانگ ((ئیدوارد ڕاندالٚ)) بیست ساڵ زیاتر لەم بوارەدا کاری کردووە بەقسەکردن لەگەڵ رۆحی ئەوانەدا پێش خۆی مردوون و ئەڵێ ٧٠٠ حەوت سەد شەو خۆم خەریك کردووە بەقسەکردن لەگەڵ رۆحی ئەوانەدا کەپێش چەندساڵێك لەگەڵمان ئەژیان و ئێستە مردووی ئەم جیهانەن و رۆحی زیندووی جیهانی رۆحەکانن.

ڕاندال: بەناوبانگترین پارێزەرە لەئەمەریکا، ئەوەنی‌یە بڵێین خەڵکی فریودابێت بەڵکو بەپێچەوانەوە هەرچی راستی نەبووبێت نەی وتووەو نەینووسیوەتەوە لەبواری جیهانی رۆحەکان دا.

بەتایبەتی کتێبە بەناوبانگەکەی مردووەکان نەمردوون بەڵکو جێگەیان گۆڕیوە!!!.

هەروەها قەشە((جون لاموند)) دکتۆرای هەیە لەلاهوت دا لەکتێبەکەی‌دا (کاثلین)**Kathleen** گونجانی ئەم زانستەی لەگەڵ ئاین دا بەراووردکردووە.

هەروەها: مایرز: لەکتێبەکەی دا (شخصية الأنسان وَبقائها بَعدَ المْوتْ) کەدوو جەڵدی ٧٠٠حەوت سەد لاپەڕیە.

زۆربەئاشکرا سەلماندوویەتی دوای مردن زیندووبوونەوە هەیەو رۆحی پاك و چاك بۆجیهانی پاك و چاك و رۆحە پیسەکان بۆ شوێنی خراپ رەوانە ئەکرێن.

واتە: لەجیهانی بەرزەخ شوێنی خۆش بۆ رۆحە چاکەکان و شوێنی دۆزەخ بۆ رۆحە پیسەکان.

لێرەدا بۆمان دەرئەکەوێ کەژیان بەردەوامەو هیچ شتێك گوم نابێت و ئەو لەشە فیزیاویە بەرگێکە بۆ ڕۆحی ئەثیری و ئەقڵی ئەثیری کاتێ مرد ئەوبەرگە فڕێ دراوە و ئەقڵ و رۆحی ئەثیری بەرەوجیهانی ئەثیری ئەڕۆن واتە بەرەو (بەرزەخ) جیهانی رۆحی و ژیانی نێوان قەبروقیامەت.

## (گەردوونی ئەثیری)

((ئەوشوێنە بۆشایی یانەی لەنێوان ئەستێرەکان دایە کەهەندێکیان هەزاران ملیۆن ساڵی رووناکی دوورن لەیەکەوە، بۆشایی رووت نیە بەڵکوو پڕە لەمادەی ئەثیر کەبەچاو نابینرێ و هەستی پێ ناکرێ)). ((کلارك مکسویل)).

**گەردوون لەدووبەش پێك هاتووە:**

**أ- بەشی مادی و فیزیاوی.**

**ب- بەشی رۆحی و ئەثیری.**

بۆشایی گەردوون هۆی پەیوەندیانە بەیەکەوە.... لەجیهانی مادی ئەمە راستی یەکی بنچینەیی یە. بەڵام لەجیهانی رۆحی ئەم راستی یە وەکو ئەم نی یە بەڵکو پێش کەوتووترە، بەڵام لەجیهانی رۆح دا ئەثیر هۆی بەکارهێنانە بەڵام بەجۆرێك هێشتا نەزانستی فیزیاوی نەزانستی رۆحی سەری لێ دەرناکەن تەنها بەخەیاڵ نەبێت ((لۆدج))

ئێمە ئەژین و ئەجووڵێین لەم جیهانە فیزیاوی یەدا کەلەوشتانە پێك هاتووە ئەلەرێنەوە لەسنوورێکی دیاری کراودایە ناومان لێ ناوە(مادە)

ئێمە لەم جیهانە فیزیاوی یەدا لەدایك ئەبین و هەروا ئەزانین ئەمە هەموو شتێکە.

ئەمەش زۆر جیاوازە لەجیهانی رۆحی و ئەثیری لەڕاستی و لەشێوەدا.

زانست دەربارەی ئەم جیهانەمان لەسەدەیەکەوە ئەگۆڕێ بۆ سەدەیەکی تر وەکوو جیلێك وائەزانێ کە گەیشتووەتە سەر لووتکەی زانست بەڵام مێژوو، چیرۆکی ئەقڵی

ئادەمیزادەو نابینین لەهیچ پلەیەك دا گەیشتبێتە كۆتایی زانست، هەردۆزینەوەیەك بووبێت یەكێكی تر بەدوای دا هاتووە.

زۆرجار ئادەمیزاد وای زانیوە هەموو نهێنییەكانی گەردوون ئەزانێ و ئیتر پێویستی بەزانست نییە، بەڵام لەئەنجام دا بۆی دەرئەكەوێ هێشتا لەسەرتایە.

بەم جۆرە ئەقڵی ئادەمیزادیش گۆڕانكاری بەسەرداهتووە لەهەر پلەیەك دا دەوری خۆی دیوە، بەگوێرەی ئەقڵی ئەوكاتە، ئێستاش ئێمە واگەیشتووینەتە ئەم پلەیەی ئێستا كەبەرزترین پلەیە لەچاو پلەكانی پێشوومان و ئەبێ ئەوەبزانین پلەی ئەقڵی بەرزترو پێشكەوتووتر بەرێوەیە، چونكە هەرچەندە ئێستا ئادەمیزاد، دەسەڵاتی تەواوی هەیە بەسەر زەوی و ئاوو بوونەوەرەكانیتر داو روەكەكاندا بەڵام ئایا ئەمە ئامانجی كۆتایی ئادەمیزادە؟ ئەمە كۆتایی تێكۆشانی ئادەمیزادە؟

بێ گومان نەخێر زانست كۆتایی نایەت و ئامانجی مرۆڤایەتیش زۆر زۆری ماوە... تاكوو ماوەیەك لەمەوپێش زانست و زاناكان وایان ئەزانی مادە ئەوشتە رەقانەیە لەبەردەستمان دایەو هەستیان پێ ئەكەین، بەڵام لەڕاستی دا وانەبوو، زانستی ئێستا دەریخستووە كەئەو مادە رەقانە وەكوو كورسی یان مێزی ئاسن یان بەردو تەختە كۆمەڵێ گەردن ئەلەكترۆنەكانیان ئەجووڵێنەوەو ئەسووڕێنەوە بەدەوری ناوكەدا زۆر زۆر بەخێرایی و مادە لەگەردەكان پێك هاتووەو ئەم گەردانە لەئەلەكترۆن و برۆتۆن و نیوترۆن و ناوكە پێك هاتوون، جیاوازی مادەكان لەجیاوازی ئەلەكترۆنەكانیان دایە.

بەڵام جیاوازی كێشی مادەكان لەجیاوازی ژمارەی پرۆتۆنەكاندایە ژمارەی ئەلەكترۆناتی هەرگەردێك لەمادەكان((ژمارەی گەردی ی)) ئەومادەیە نیشان ئەدات.

بێجگە لەئەلەكترۆناتی دەوری ناوك، هەندێ ئەلەكترۆنات لەناوك دا هەیە.

ئەگەر ژمارەی هەردوولایان كۆبكەینەوە ((كێشی گەردی ئەو مادەیە دەرئەكەوێ، كەوابوو ئەلەكترۆن ژمارەی((گەردی)) نیشان ئەدات پرۆتۆن ((كێشی گەردی)) نیشان ئەدات.

بۆ نموونە:

ژمارەی گەردی لەئاسن دا/ ٢٦بیست و شەشە.

بەڵام کێشی گەردی لەئاسن دا/ ٥٦پەنجاو شەشە.

کەوابوو ٢٦بیست و شەش ئەلەکترۆن لەدەوری ناوك دا هەیەو ٣٠سی ئەلەکترۆن لەناوك داهەیە لەگەردێکی ئاسن دا.

هەرچەندە لە پڕۆتۆنەکانی ناوك دا مادەی جۆری ئاسنی واهەیە ژمارەی پڕۆتۆنەکانی ٣١سیویەکە یان ٢٩بیست و نۆیە.

ئەگەر هەر مادەیەکمان دی ژمارەی پڕۆتۆنەکانی بەم شێوەیەبوو ئەوە ئەتوانین پیێ ی بڵێین ئاسن.

زانای بەناوبانگ / سێر ئۆلیڤەر لۆدج/ لەکتێبەکەی دا (ألأَثِير وَالْحَقيقة) ئەڵێ:

((بەکورتی ئەتوانین بڵێین: دووشتی جیاواز لەبارگەی کارەبایی دایە + و — واتە ئەلەکترۆن و پرۆتۆن کەزۆر زۆر بچووکن...

بەڵام قەبارەی هەردووکیان زانراوە بەتەقدیری.. گەرد لەهەموو شتەکان بچووك ترەو ئەمانیش لەگەرد زۆر بچووکترن کەپێوانە ناکرێن هەموو مادەکان لەگەردەکان پێك هاتوون و گەردەکانیش لەئەلەکترۆن و پرۆتۆن پێك هاتوون.

بێ گومان لێرەدا ئەزانین ئەلەکترۆن چیيە؟ بەڵام ئایا ئەزانین پرۆتۆن چی یە؟ بێ گومان نەخێر، چونکە لێرەدا کێشەیەکمان دێتەڕێ ئەویش بارستایی ئەلەکترۆنە لەبارستایی پرۆتۆن گەورەترە بەڵام نازانین بۆچی؟؟...

بەئەقڵی ئێستای زاناکان و تەقدیری خۆیان ئەڵێن:

ئەلەکترۆن ناوەکەی بۆشە وەکوو بڵقی ئاوە، بەڵام مادە لەناوی دانیيە تەنها پاڵەپەستۆی ئەثیرە راگیری کردووە.

کێشی پرۆتۆن لەکێشی ئەلەکترۆن زیاترە..... زاناکان ئەڵێن کێشی یەك پرۆتۆن بەرامبەر بەکێشی (١٨٤٠) ئەلەکترۆن کەپیێ ی ئەڵێن کێشی گەردی ـ کەوابوو کێشی گەردی بەندە بەژمارەی پرۆتۆنەکانیيەوە.

**بۆنموونە :**

گەردی هیدرۆجینی یەك پرۆتۆنی تێدایە، هیلیۆم ٤پرۆتۆن، ئۆکسجین ١٦پرۆتۆن لەهەموویان قورس تر گەردی یۆرانیۆمە ٢٣٨پرۆتۆنی تێدایە.

بەڵام ئەوەی نەزانراوە ئەوەیە:

بۆچی پرۆتۆن ئەم کێشەی هەیەو ئەلەکترۆن ئەوەندە لەپرۆتۆن سووکترە؟

بێجگە لەکێش لەبارگەی کارەبایی دا وەکوو یەك وان و دژی یەکن کەوابوو بەرامبەرن لەکارەبایی‌داو دژی یەکن.

هەروەها لەهەمان سەرچاوەدا هاتووە:

((ئێمە هەڵەمان نەکردووە کەگوتوومانە کێشی هەر مادەیەك لەسەر ژمارەی پرۆتۆنەکانی وەستاوە، واتە لەسەربارگە کارەبایی یە + موجەبە گەرمەکان کەناوکی گەرد پێك ئەهێنن)).

بەڵام خاصیەتی کیمیاوی ووریاو بەکار، ئەنجامی دیارو بەرزی هەیەو گەرد جیائەکاتەوە بەشەوق و بەخاسیەتی کیمیاوی بەڵام کارناکاتەسەر کێشی بەهیچ جۆرێك، ئەمەش زۆر جێگەی سەرسوڕمانە بەڵام تاکوو ئێستا زانست و زاناکان هەرئەوەندەی لێ ئەزانن!!!.؟

لەڕاستی دا مادەی فیزیاوی شەبەکەیەکی کراوەی ئەلەکترۆنات و پرۆتۆناتەو ئەوماوەیەی لەنێوانیان دا هەیە لەگەردێکدا زۆر زۆر فراوانە بەگوێرەی قەبارەکەی.

.......

ئەگەر خۆربکەین بەناوك و ئەستێرەکان و زەوی کەبەدەوری دا ئەسووڕێنەوە هەروەکوو ئەلەکترۆنەکان و پرۆتۆنەکان ئەبێت، کەواتە گەردێك وا دروست کراوە هەروەکوو بچووك کراوەی کۆمەڵەی خۆرە.

ئەلەکترۆن و پرۆتۆنەکان ماوەیەکی زۆر فراوان هەیە لەنێوانیان داو بەخێرایی یەکی ڕێك و پێك ئەسووڕێنەوەو لەنێوانیاندا مادەی ئەثیری هەیە کەزۆربەی ناوەوەی گەردەکە پڕئەکاتەوە.

**زاناكان ئەڵێن:**

مادەی ئەثیری مادەی سەرەكی یە لەدروست بوونی گەردوون دا.

ئەثیر هەموو بۆشایی گەردوونی پڕكردوەتەوەو لەناو گەردەكانیشدا هەیە كەوابوو لەناو هەموو مادەدا هەیە.

زاناكان بۆیان دەركەوتووە شەپۆلەكانی ئەثیر لەبۆشایی گەردوون دا بەخێرایی ١٨٦,٠٠٠میل پانیە ئەجووڵێنەوە.

ئەم شەپۆلانە ڕووناكیمان ئەدەنێ. كەوابوو ڕووناكی ئەگەیەنن بەم جۆرە لەبارودۆخێكی تر دا ووزە ئەگۆڕێ بۆ گەرمی و بۆكارەبایی، ئێمە هەرچەندە ئەثیر نابینین بەڵام ئەتوانین دەریخەین ئەم مادەیە هەیە، چونكە گەرمی و ڕووناكی و كارەبا لەبۆشایی دا بەخێرایی یەكی دیاری كراو ئەڕۆن لەبۆشایی گەردوون دا تاكوو بەرشتێك ئەكەون و شەپۆلەكانیان ئەگەڕێنەوە.

**زانایانی فیزیا ئەڵێن:**

ئەثیر بۆشایی گەردوونی پڕكردووەتەوە، ٥٠٠س°پێنج سەد پلەی سەدی لەزەوی ساردترە.ئەثیر بەردەوام ئەجووڵێتەوە، بەردەوام پاڵەپەستۆی زۆری هەیە بەجۆرێك ملیۆنەها تەن پاڵەپەستۆی لەسەریەك پێ چوارگۆشە هەیە(١قدم٢). ئەم مادە ئەثیری یە نابینرێ و هەستی پێ ناكرێو دەنگی نی یە و ڕەنگی نی یە و بۆنی نی یەو دەستی لێ نادرێ و ناگیری.

ئەگەر ئەم مادە ئەثیری یە نەبێت، لەبەر سەرما ژیان نامێنێ لەسەر زەوی چونكە گەرمای خۆرمان پێ ناگات بەهۆی ئەوشەپۆلە ئەثیری یانەوە نەبێت، واتە ڕووناكی بەهۆی شەپۆلە ئەثیرییەكانەوە ئەگاتە لامان و ئەگەر ئەثیر نەبێت گەردوون تاریكەو هیچ دیارنی یە..... لێرەدا پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ مَثَلُ نُورِهِ كَمِشْكَاةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ الْمِصْبَاحُ فِي زُجَاجَةٍ الزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّيٌّ يُوقَدُ مِنْ شَجَرَةٍ مُبَارَكَةٍ زَيْتُونَةٍ لا شَرْقِيَّةٍ وَلا غَرْبِيَّةٍ يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِيءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ نُورٌ عَلَى نُورٍ يَهْدِي اللَّهُ لِنُورِهِ مَنْ يَشَاءُ وَيَضْرِبُ اللَّهُ الْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ (النور:٣٥) .

**واتە: (پەروەردگار رووناکی ئاسمانەکان و زەوی یە) لێرەدا دیارە دروست کەری ئەو شەپۆلە ئەثیری یانەیە کەئاسمانەکان و زەوی و هەموو گەردوونیان رووناک کردوەتەوە.**

**زاناكان ديسانەوە ئەڵێن:**

لەبەرئەوە مادە بەئەثیرەوە بەندە( ئەثیر مادەیەو مادەیش ئەثیرە) هەرچەندە مادە هەستی پێ ئەكرێ‌و ئەثیر هەستی پێ‌ناكرێ، گرنگ ئەوەیە تێ بگەین كەئەثیر هەیەو لەئێمەوە دووریی‌یە!! هەروەكوو زانای بەناوبانگ خاوەنی تیۆری رێژەیی(النظرية النسبية) ئەنیشتاین لەساڵی ١٩٢٠ لە زانكۆی لیدن لەوانەیەكدا كە ئەیووتەوە بەم جۆرە باسی ئەثیری كرد:

بەگوێرەی تیۆری رێژەیی گشتی بۆشایی گەردوون رەوشتی فیزیاوی هەیە، مانای ئەوەیە ئەثیر هەیە، بەم جۆرە هەرگیز ناكرێ بۆشایی گەردوون ئەثیری تێدا نەبێت، چونكە ئەگەر ئەثیر نەبێت نەك تەنها گەرمایی و رووناكی خۆرمان ناگاتێ بەڵكو هیچ پێوانەیەك بۆكات نامێنێ!!!.

زانایانی فیزیاوی تاكوو ئەم ساڵانەی دوایش دوودڵ بوون لەبوونی ئەثیر.

بەڵام ئەمڕۆ ئەڵێن: گەردوون پڕە لە ئەثیر و دروست بوونی گەردوون لەسەر ئەثیرە نەك لەسەر مادە.

لەبەرئەوە ئێستا ئەتوانین بڵێین مادەی ئەثیر لەبۆشایی گەردوون دا ئەڵقەی بەیەك گەیشتنە لەنێوان جیهانی فیزیاوی‌و جیهانی رۆحی دا. چونكە ئەثیر مادەیەكی هاوبەشە لەنێوان ئەم دووجیهانەدا.

هەریەكە لەم دووجیهانە چواردەوری گیراوە بەم مادەیەو هەردووكیان بەشێكن لەم مادەیەو هەردووكیان لێ ی دروست بوون.

ئەم دووجیهانە (رۆحی و مادی)یە بەشێكن لەگەردوون. ژیان لەهەریەكێكیان دا بەجۆرێكی جیاوازەو سنووری خۆی هەیە.

لەجیهانی مادی فیزیاوی دا ئەژین هەست بەلەرینەوەكان ئەكەین بەپلەیەكی نزم ، لەجیهانی رۆحی‌و ئەثیری‌دا هەست بەلەرینەوەكان ئەكەین بەپلەیەكی بەرزتر.

كەوابوو ژیان لەجیهانی مادی دا زۆر هێواشەو سنووری هەیە بەڵام لەجیهانی رۆحەكان دا زۆر فراوان‌و بێ سنوور و خێرایە.

کەوابوو کاتیٚ ئەو ڕۆحە ئەثیری یە لەناو لەشی فیزیاوی دا رزگاری بوو هاتە دەرەوە بەرگە فیزیاوی یەکەی فڕیٚ ئەدات و بەرەو جیهانی رۆحی ئەڕوات. بیٚ گومان لەویٚ هەست بەژیانی ئەثیری ئەکات و زۆر ژیانیٚکی خۆش و باشە ئەگەر ئەو رۆحە لەچاکەکان بیٚت.

تەنها نەزانەکان ئەڵیٚن: هەرچی شتیٚك هەستی پیٚ بکریٚ راستەو لەدەرەوەی سنووری هەست پیٚ کردن شتیٚکی تر نی یە.

**زاناکان ئەڵیٚن:**

هەستی ئیٚمە تاڕادەیەکە بینین یان بیستن یان بۆن کردن ئەگەر لەو ڕادەیە بەدەربوو ئیتر هەست ناکەین.

چونکە دوورە یان زۆر بچووك ئەبیٚتەوە.

هەروەکوو لەبەکارهیٚنانی ئامیٚری رووناکی (الأسبکتروسکوب) بۆمان دەرئەکەویٚ ماوەی بینین مان زۆر کەمەو دیاری کراوە چونکە لەم لاولەولای هیٚڵی رووناکی یەکەوە لەرینەوەی زۆرتر دەرئەکەویٚ و لەوانەیە ڕەنگاورەنگیش بیٚ، لیٚرەدا دەرئەکەویٚ شویٚنەواری ژیانی تر هەیە لەدەوروبەری ئەم جیهانەدا بەڵام زۆر دوورە لەئەندامەکانی هەستەکانمانەوە.

کەوابوو بۆمان دەرکەوت، شتیٚك هەیە نابینریٚ و هەستی پیٚ ناکەین و ئەتوانیٚ ویٚنەکان لەزەوی بیٚ گیان دروست بکات، لەبەرئەوەیە ئەم کارە ئەثیر ئەتوانیٚ ئەنجامی بدات چونکە ئەثیر توانای بەرزکردنەوەی مادەی هەیەو هەرچەندە هیٚزی راکیٚشانیش هەبیٚت.

هەروەکوو بەرزکردنەوەی رۆحە ئەثیریەکان بۆ جیهانی ئەثیری دوور.

**بۆ نموونە:**

ئادەمیزاد ویٚنەی خۆی هەیە، گیان لەبەرەکان و باڵندەکان و بیٚ گیانەکانیش ویٚنەی جیاوازی خۆیان هەیە کەوابوو مادە لەناویا ژیان هەیەو ژیانیش پیٚویستە بۆ ڕیٚك و پیٚکردن و بەردەوامیان.

هـەموو یـەکێك لەوانـەش بـەگوێرەی قـاڵبی لەشـە فیزیاویيەکـەی وێنـەی ئـەثـیری تێدایە.

گیان لەبەرەکان بەهۆی رۆحە ئەثیری یە کانیانەوە ئەڕۆن یان ئەفڕن، کەوابوو ئـەثیر مادەی بەرزکردنەوەیە هەرچەندە هێزی راکێشانیش هەبێت. توانای ئەثیر زیاترە. ئەگەر ئـەثیر وازبێنـیٚ لەمادەیـەك ئـەوەهێزی راکێشان دەسەڵاتی زیاترئـەبێت بەسـەر مادەکەدا.

بۆنموونە: ئەگەر باڵندەیەك لەسەرداریك رۆحی ئەثیری راگیری کردووەو ناکەوێت. بەڵام ئەگەر کوشتمان یەکسەر بەرئەبێتەوە چونکە رۆحـی ئـەثیری دەرئەچـیٚ و لەلەشە فیزیاویەکەیدا نامێنیٚ و هێزی راکێشان رای ئەکێشیٚ بەرەو خوار بۆ سەرزەوی.

واتـە هێـزی راکێـشان دەسـەڵاتی ئەبێتـەوە بەسـەر مادەکـەدا. بـەڵام هێـزی ئـەثـیر زیاترە.

مادە کاری تیٚ ئەکریٚ بەهەموو هێزە سروشتی یەکان....

بەڵام ئادەمیزادو گیان لەبەرو رووەك ئەتوانیٚ بەرامبەری بوەستن کاتیٚ ئەم هێزە کاریان تیٚ ئەکات، کەوابوو ژیان هێزێکی ڕێك و پێکەو بەرەنگاری مادەبووەتەوە، ژیان هێزێکە مادە ڕێك و پێك ئەکات ئەگەر ژیان نەبێت مادە تێکەڵ و پێکەڵ ئەبێت....

کەوابوو ژیان بەشێك نـی یـە لـەمادە.... چونکە دروست کـەری کورسـی یـەك خـۆی بەشێك نی یە لەودارەی کورسی یەکەی لیٚ دروست ئەکات.

هەروەها ژیان کەسایەتی خـۆی هەیـە واتـە هـەموو زینـدەوەرێك جیاوازە لـەویتر.. ئەمەش ئەوە ئەگەیەنیٚ کەژیان هێزی پیٚ دراوە مادە ڕێك بخات و مادە دەسەڵاتی نی یە بەسەر ژیاناو دروست کەری هەردووکیان بەم شێوەیە بڕیاری داوە کەپەروەردگارە.

لێرەدا بۆمان دەرئەکەویٚ مردن چوونە دەرەوەی هێزی ژیانـە کـەڕۆحی ئـەثیریيـە لـەمادەدا. ئەمـەش ئەوەئەگەیـەنیٚ کـەمردن کۆتـایی ژیـان نـی یـە و ژیـانیش دوای مردن بەردەوامە.

چونکە مادە نافەوتیٚ و ئەمێنیٚ بـەڵام لەشـێوەیەکەوە ئەگۆڕیٚ بـۆ شـێوەیەکیتر یان لەدۆخێکەوە بۆ دۆخێکی تر.

**هەروەکوو ئەقڵ و ڕۆحی ئەثیری جیاوازن لەمێشك و لەشی فیزیاوی.**

**دوای چوونە دەرەوە یان لەلەشی فیزیاوی ئەڕۆنە شوێنێکی لەبار کەئەگونجێ لەوێ کاری خۆیان ئەنجام بدەن تاکوو رۆژی ((قیامەت)).**

**زاناکان ئەڵێن مادە نافەوتێ ئاینی ئیسلامیش ئەڵێ مادە نافەوتێ چونکە هەموو بوون و بوونەوەر مادەیەو مادە نافەوتێ چونکە ئەقڵ فەرمانڕەوای مادەیەو فەرمانڕەوای هەموو ئەقڵەکانیش پەروەردگارە!!!.**

**دیسانەوە مادە نافەوتێ چونکە فەرمانڕەواکەی رۆحی ئەثیری و ئەقڵی ئەثیری‌یەو فەرمانڕەوای ئەوانیش پەروەردگارە کەبەوشێوەیە دروستی کردوون.**

**ژیان واتە رۆح و ئەقڵی ئەثیری لەلەشی فیزیاوی دا لەسەرزەوی ماوەیەك ئەباتەسەر. بەمردن کۆتایی ژیان نایەت بەڵکو ئەقڵ و رۆحی ئەثیری لەجیهانی ئەثیری‌دا (بەرزەخ)دا ئەمێننەوە تاکوو ئەوکاتەی بەفەرمانی پەروەردگار هەموو رۆحەکان ئەکرێنەوە بەبەری لەشە فیزیاوی یەکاندا کەبوون بەخۆڵ لەزەوی دا هەروەکوو یەکەم جار چۆن لەخۆڵ پێغەمبەرمان ئادەم(عليه السلام) دروست کراو رۆحی کرایەبەر.**

## ‹مردن هەروەکوو نووستنە›

**هەروەکوو زانایانی رۆحی دڵنیابوون لەوەی رۆحی ئەثیری لەناو لەشی فیزیاوی دایە بەمردن و پەك کەوتنی لەشی مادی فیزیاوی کۆتایی ژیان نایەت بەڵکو رۆح و ئەقڵی ئەثیری ئەڕۆن بۆ جیهانی ئەثیری و ژیان بەردەوام دەبێت.**

**کەوابوو مردن هەروەکوو نووستنە. کاتێ نووستین رۆح و ئەقڵی ئەثیری ئەڕۆنە دەرەوەی لەش بەڵام لەشی فیزیاوی پشوو ئەدات و ئاگای لەخۆی نی‌یە تاکوو ئەوکاتەی ئەقڵ و رۆحی ئەثیری دێنەوە بۆلای و بەخەبەر ئەبێتەوە .. کەوابوو چوونەدەرەوەی ئەقڵ و رۆحی ئەثیری بەشەپۆلە ئەثیری‌یە زۆر خێراکاندا هاتووچۆئەکەن هەر لەبەر ئەمەیە خەوێك ئەبینن ماوەی خەوەکەمان لەڕاستی‌دا لەنیو دەقیقە زیاتر نی‌یە بەڵام کەبیرئەکەینەوە لەخەومانمدا زۆرمان دیوەو زۆر درێژەی**

کێشاوه. هەروایه ژیانیش لەلەشی فیزیاویدا هێواشەو زەحمەته بەڵام لە ئەثیردا زۆر خێراو ئاسانه.

## (زانایانی رۆحو ئەثیر)

**ئەڵێن:** پاش مردنی لەشی فیزیاوی، رۆحه ئەثیرییەکان ئەرۆنه جیهانی ئەثیر لەو جیهانەدا پێشوازی ئەکرێنو رێنومایی ژیانی نوێی ئەثیری ئەکرێن لەلایەن رۆحی ئەو خزمو کەسو کارو هاورێ یانەوه کەپێش ئەوان چوونەته جیهانی ئەثیری (واته پێش تر مردوون).

هەروەها ئەم زانایانه ئەڵێن: رۆحه چاكو پاکەکان ئەوانەی کرداریان باش بووه لەجیهانی مادی فیزیاویدا واته لەسەر زەوی ئەڕۆنه لای رۆحه پاکەکان لەجیهانی ئەثیریداو بەدەس خۆیان نیيه کەلەلەشی فیزیاوی هاتنه دەرەوه ئەبرێن بۆئەوێ

بەپێچەوانەوه رۆحه خراپەکان ئەبرێن بۆ شوێنی رۆحه خراپەکانی جیهانی ئەثیری و بەدەس خۆیان نی يه ئەوانیش بۆجێ ی تایبەتو شیاوی خۆیان رەوانەئەکرێن. چونکه هەرگیز ئەم ئادەمیزاده بەگاڵته دروست نەبووەو لێ پرسینەوەهەیه.

پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿قَالَ فِيهَا تَحْيَوْنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنْهَا تُخْرَجُونَ﴾ (لأعراف:٢٥)

﴿وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاءَ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لاعِبِينَ﴾ (الانبياء:١٦)

لێرەدا بۆمان دەرئەکەوێ کەئاینی ئیسلام چەند راستو دروسته....

زانایانی زانستی نوێو زانایانی رۆحو ئەثیر شوێن کەوتووی ئەم دەستوورەی ئیسلامن چونکه هیچ ئاینو کتێبێکی ئاسمانی وەکوو ئیسلامو قورئان باسی ئەم جیهانەو جیهانی دوایی هەتا هەتایی نەکردووه.

لەبەرئەوه سەدان لەو زانا بەڕێزانه باوەڕی یەکجاری یان هێناوه بەپەروەردگارو شوێن کەوتووی ئاینو دەستووری ئیسلامن.

**زانایانی رۆحی و ئەثیری ئەڵێن:**

**((ئادەمیزاد لەجیهانی ئەثیری‌دا کەسایەتی خۆی هەیەو کێشی هەیەو توانای هەیە))**

**زانایانی زانستی نویٚ بۆیان دەرکەوتووە:**

**کەرووناکی کێشی هەیە(ئەثیر لەڕووناکی زۆر رووناك ترو خێراترە)**

**زانا رۆحی یەکانیش ئەڵێن:**

**لەسەر زەوی کێش بەهۆی هێزی راکێشانەوەیە.**

**بەڵام لەجیهانی ئەثیری‌دا هێزی راکێشان نی‌یەو پەروەردگار خۆی ئەزانیٚ چی لەجێگەی هێزی راکێشانە.**

**کەوابوو لەجیهانی رۆحی ئەثیری‌دا وێنەو کەسایەتی و کێش و توانای خۆمان هەیە. هەروەها ئەقڵی ئەثیری ئەمان بات بەڕێوە.**

**کەئەوئەقڵە ئێستە لەمێشکی فیزیاوی دایە!!!.**

**هەندیٚ کەس پرسیارئەکەن و ئەڵێن:**

**ئایا دوای مردنی لەشی فیزیاوی و مادی.. رۆح و ئەقڵی ئەثیری بەهەمان کەسایەتی و تواناو شێوەو کێش ئەبێت لەجیهانی ئەثیری‌دا؟**

**ئایا ژیان چۆنە؟**

**ئایا زیندەوەرەکانی تریش لەگەڵمان دان لەجیهانی ئەثیری‌دا؟**

**ئایا رووەکەکان بەهەمان شێوەن لەئەثیردا؟**

**ئەم پرسیارانەو پرسیاری زۆرتریش لەم بارەیەوە هەیە....**

**زانا رۆحیو ئەثیری یەکان ئەڵێن:**

بۆ وەلامی ئەو پرسیارانەی سەرەوە بەڵێ بەلام بەشێوەیەکی جیاوازو لێرەدا هەندێکی روون ئەکەینەوە لەسەر رۆشنایی ئەو زانستانەی کەبەقسەکردن و پرسیارکردن لەرۆحەکان دەستمان کەوتووە.

لێرەدا ئەگەینە مەبەستێك ئەویش ئەوەیە کەگەردوون ئەثیرەو ئەثیر لەهەمووشوێنێك دا هەیەو لەشی ئادەمیزادیش مادیو فیزیاویو ئەثیری‌یە.

بەڵام ئایا بۆچی رۆحە ئەثیری‌یەکان لەجیهانی ئەثیری خۆیانەوە جارێکی تر ناگەڕێنەوە بۆ جیهانی مادیو فیزیاوی لای ئێمە.

زانایانی رۆحی ئەڵێن، ئەم کارە پەیوەندی هەیە بەتوانای لەرینەوە، ئەورۆحانەی جیهانی رۆحی هەندێکیان توانای لەرینەوەیان هەیەو ئەتوانن بگەڕێنەوە بۆسەرزەوی ئەمەش دەسەڵاتی پەروەردگارەو ئەم کارەش لەزۆر شوێن دا ڕووی داوەو هەندێ لەو رۆحانە بەلەشی فیزیاوی‌یەوە واتە وەکوو شێوەی پێش مردنی لەشە فیزیاوی یەکەی گەڕاوەتەوە سەرزەویو قسەی لەگەڵ خەڵك کردووەو پاشان گەڕاوەتەوە بۆ جیهانی رۆحی ئەثیری.

هەروەها بەرزبوونەوەی گەورەمان عیسی بۆ ئاسمانە رۆحی یەکان لەم جۆرە رۆحانەیەو کەپەروەردگار توانای لەرینەوەی پێ بەخشیون.

ئەم جۆرە توانایە چۆن لەجیهانی رۆحیو ئەثیری‌دا هەیە بۆ هەندێك هەروەها لەم جیهانە فیزیاوی‌یەدا هەندێ کەسانیش توانای هەستیان زۆر بەرزە هەروەکوو ئەوان جیهانە ڕۆحی‌یەکان ئەبینن بەڵام نایانگەنێو توانای دەست لێ دانیان نی یە.

واتە زۆر لەدوورەوە شت ئەبینن و شت ئەزانن و هەروەها شتی زۆر دوور ئەبیستن بەڵام توانای دەست لێ دانی جیهانی ئەثیریو رۆحیان نی یە.

زۆرجار زانا رۆحی یەکان قسەیان لەگەڵ رۆحەکان کردووەو پرسیاری ئەوەیان لێکردوون چۆن ئەژین و ئێمە بۆچی ئەوان نابینن واتە ئەوانی ئەثیریو جیهانە ئەثیری‌یەکەیان بۆ لەئێمەوە دیارنی یە؟

**ئەوانیش لەوەڵامدا گوتویانە:**

ئەثیر ئەوەندە رووناکە نابینریٚ چونکە رەنگی نییە، وەئەگەر ئێمە بمانەویٚ خۆمان دەرخەین ئەبیٚ لەشێکی فیزیاوی بۆ خۆمان دابین بکەین ئینجا دەرئەکەوین.

ئێمەی ئیسلامیش ئەڵێن راستە هەموو توانایەك پەروەردگار ئەیبەخشیٚ.

وخوای گەورەش رۆحەکان ئەگێڕێتەوە بۆ لەشەکان لەهەر کات و شوێنێکدا بێت.

**هەروەها رۆحە ئەثیری یەکان ئەڵێن:**

ماسی چۆن لەدەریایەك دا مەلەئەکاو بەئاسانی ئەجووڵیٚ ئێمە بەوجۆرە لەناو ئەثیردا جووڵان و ژیان بەسەرئەبەین.

دیسانەوە ئەم رۆحانە دووپاتیان کردووەتەوە بەمردن و لەناوچوونی لەشی فیزیاوی رۆحی ئەثیری ئەگاتە لامان.

کەوابوو هەروەکوو چۆن گیان لەبەری ئیسفەنج لەدەریایەك دا لەناو ئاودا ئەژی، بەوجۆرە زەوی لەهەموو لایەکەوە ئەثیر دەورەی داوە ، تەنها جیاوازییەك هەیە ئەویش ئەوەیە ئیسفەنج بەشێکی ئاوەکە هەڵ ئەمژیٚ بەڵام جیهانی ئەثیر لەدەوروبەری و لەناوەوەی و لەناو هەموو گەردەکانیدا ئەثیر هەیە.

زانای رۆحی بەناوبانگ(ئۆلیفر لۆدج) لەکتێبەکەیدا ((الأثير وَالْحَقيقة))دا ئەڵیٚ:

((ئەگەر بۆشایی گەردوون پڕبێت لەمادەیەك ((هەرمادەیەك بێت)) ئەم مادەیە چڕیەکی خەستی زۆری هەبێت، ئایا جووڵانەوەئەبێت واتە ئەو چڕی و پڕییە ڕێگە ئەدات بەجووڵانەوە؟

**ئەم زانایە خۆی وەڵام ئەداتەوە ئەڵیٚ بەڵیٚ:**

چونکە جووڵانەوە پەیوەندی بەچڕی یەوە نی یە بەڵکو پەیوەندەی بەلینجی و خلیساندنەوە هەیە، ئەثیر لینج نی یە وەکوو رۆحی هەنگوین بەڵکو رووناك و خاوێن و سووك و خێراو بیٚ وێنەو بیٚ ڕەنگەو جووڵانەوەیشی زۆر زۆرە.

پەروەردگار ئادەمیزادی بەشێوەیەك دروست کردووە کەبگونجیٚ لەگەڵ مادە فیزیاوییەکاندا لەم جیهانەدا، چونکە رۆحی ئەثیر یمان لەناو لەشی

فیزیاوی‌دایە..... کاتی مردن هەروەکوو کراسێك لەبەرمان دابێت و فڕێ ی بدەین بەوجۆرە رۆحی ئەثیری‌مان ئەڕوا بۆ جیهانی رۆحی ئەثیری واتە ((بەرزەخ)).

کەوابوو مردن گواستنەوەیەکە نەوەك کۆتایی ژیان، ژیانی ڕاستەقینەو هەمیشەیی دوای ئەم گواستنەوەیە کەپێی ئەڵێن مردن دەست پێ‌ئەکات.

لەجیهانی فیزیاوی‌دا تەنها هەست بەمادە فیزیاوی‌یەکان ئەکەین و ئەژین بەڵام لەجیهانی ئەثیری‌دا هەست بەژیانی رۆحی و ئەثیری ئەکەین.

کەوابوو مردن گواستنەوەی شوێنە (تغير الأقامة)یان (تغير السكن).

ژیانی مادی و فیزیاوی ئەم جیهانە ماوەیەکی زۆرکەمەو کۆتایی دێت.

ژیانی جیهانی رۆحی و هەتا هەتایی کۆتایی نایەت.

دیسانەوە زانای رۆحی (لۆدج) ئەڵێ:

لەشە ئەثیری‌یەکان هەندێکیان توانای گەڕانەوەو خۆپیشان دانیان هەیە لەم جیهانەدا بەڵام بەشێوەیەکی کاتی.

رۆحە پاکەکان و چاکەکان توانای قسەکردنیان هەیە بەگشتی لەگەڵ ئێمەدا و هەست ئەکەن بەهەڵس و کەوتمان تاماوەیەك پاشان ئێمەیان لەبیرئەچێتەوە تاکاتێ ئەڕۆین بۆلایان و ئەوکاتە لەپێشوازیمان دان و ڕێنومایی ژیانی ئەثیری مان ئەکەن.

ئێمە ناتوانین ئەوان هەمیشە ببینین بەڵام ئەتوانین گوێ بگرین بۆ قسەکانیان ئەمەش لەڕێگەی ناوەندێکەوە ئەبێت و ئەوناوەندە ئەبێ توانای ئەوەی هەبێت قسەیان لەگەڵ بکات و قسەیان لێ‌وەرگرێ.

بەڵام ئێمە تەنها دەنگیان ئەبیستین و گوێیان لێ‌ئەگرین و ناتوانین قسەیان لەگەڵ بکەین تەنها ناوەندنەبێت و ناوەندیش کەسێکە مادەی (ئەکتۆپلازمی) لەشی زۆر زۆربێت هەروەکوو زانایانی رۆحی ئەڵێن چونکە لەرینەوەو جووڵانەوە دەنگی زۆر زۆرەو هەستەکانیان زۆر زۆر بەهێزن.

**دیسانەوە/ لۆدج / ئەڵێ:**

رۆحە ئەثیری‌یەکان ئاگاداریان کردووم کەگەورەترین و پێش کەوتووترین زانای جیهانی ئەثیری و رۆحی هیچ شتێك دەربارەی ئەم گەردوونە فراوانە نازانێت و زانستی نی یە!!!

**هەروەها ئەوانەی ئەڵێن بۆشایی گەردوون چۆڵەو ژیانی تێدانی‌یە من ئەڵێم چۆڵ نی یەو ژیانی تێدایە، وێنەو ڕەنگ یان هەیە چونکە دانیشتوانی ئەوشوێنانە ئاگاداریان کردووم واتە ((رۆحەکان)).**

**کەوابوو جیهانی رۆحی راستی‌یەکە لەڕاستی‌یەکانی جیهانی مادی زۆر زۆر راسترە)).**

**لێرەدا ووتاری لۆج کۆتایی دێت.**

## ((ئەقڵ و مادە))

زانای بەڕێز ((شیشرون)) ئەڵێ:

((هەرچۆنێك بێت ئەوشتەی بیرئەکاتەوەو تێ ئەگات و ئیش ئەکات ئەوەشتێکی ئاسمانی و پیرۆزە)).

تاکوو ئێستا هەندێ زانیاریمان زانی دەربارەی گەردوون زانیمان گەردوون فراوانەو کۆتایی نی یە گەردوون جووڵانەوەیە، جووڵانەوەکانی بەپلەیەو ڕێك و پێکە، یاساو ڕێکخستنە، تواناو دەسەڵاتە، مادەیەو ئەثیرە ، جێگەی بوون و بوونەوەرە لەسەر زەوی و لەشوێنەکانی تر، فیزیاوی و رۆحی یە، هەرگیز ناتوانین گەردوون بەتەواوی باس بکەین نەبەزمان نەبەنووسین نەبەزانست بەهەموو جۆرەکانی یەوە.

هەندێ کەس گەردوون تەنها بەمادە ئەزانن بەڵام زۆر هەڵەن و تێ ناگەن.

چونکە زۆرشت هەیەو هەستیشی پێ ناکەین!!.

تەنها ئەوەندە بزانن ئەوهەوایەی هەڵی ئەمژین ئەچێتە ناوسی یەکانەوە پڕە لەزۆرشت وەکوو چی؟ بێگومان ڕەگەزە جۆراوجۆرەکان و پێکهێنەرەکانی هەوا.

قسە لەهەوادا ئەمێنێتەوەو بزرنابێت، وێنەکان لەکەناڵەکانی تەلەفزیۆن و سەتەلایتەوە بەهەوادا دێن، واتە هەوا پڕە لەقەڵەبالغی وێنەو دەنگ سەرەڕای میکرۆبات و گەردی هەمەجۆرو تیشکی هەمەجۆر، ئێمە تەنها رووناکی ئەبینین ئەویش بەرۆژ، بەڵام بەشەو هیچ نابینین و هەستیان پێ ناکەین. کەوابوو تەنها بەبوونی دەنگ و رەنگ و وێنەو تیشك و گەرد لەهەوادا بۆمان دەرئەکەوێ ئەوانەیش هەن و هەستیان پێ ناکەین بەڵام شتی مادی و رەق هەست پێ ئەکەین. لێرەدا کۆتایی بەفەلسەفەی مادی ئەهێنین و ئەو رایە دوورە لەراستی یەوە.

هەروەکوو باسمان کرد لەئەشکەوتە رەشەکان دا هێزی راکێشان ئەوەندە زۆرە ئەستێرەی گەورەی واقووت ئەدەن هەزاران ملیۆن جار لەزەوی گەورەترەو مادەکەی نامێنێ و تاکوو ئێستا زانست نازانێ مەسەلە چی یە...؟ بەڵام لەئەشکەوتە سپی یەکاندا سەرلەنوێ ئەستێرە دروست ئەبنەوە بەمەرجێ ئەشکەوتە رەشەکان ئەوەندە

دوورن لەم ئەشکەوتە سپییانەوە زاناکان بەخەیاڵیش ناتوانن ئەم دووری‌یە باس بکەن.

چونکە ئەشکەوتە ڕەشەکان لەناوەندی گەردوون دان لەناو گەلە ئەستێرەکاندا _ بەڵام ئەشکەوتە سپی یەکان ئەکەونە لێوارەکانی کۆتایی گەردوون ئەگەر کۆتایی هەبێت!!!.

**زاناکان ئەڵێن:**

مادە جووڵانەوەیەو جووڵانەوەش مادەیە، لەگەردوون دا بۆشایی نی‌یە، هەروەکوو لەرابوردوودا ئەیانووت بۆشایی ئاسمان یان بۆشایی گەردوون. (فضاء الخارجي _ فضاء الكوني).

ئەم مادەیە ئێمە هەستی پێ‌ئەکەین و هەست بەجووڵانەوەی ئەکەین هەروەها ڕۆحەکانی جیهانی ئەثیری هەستی پێ‌ئەکەن.

کەوابوو ئەوانیش هەست بەجیهانی خۆیان ئەکەن. وەئێمەش هەست بەجیهانی خۆمان ئەکەین.

ئێمە هەست بەجیهانی فیزیاوی و مادی ئەکەین ڕۆحەکان هەست بەجیهانی ئەثیری ئەکەن.

بەڵام ئەگەر ئەقڵ نەبێت ئەم دووجیهانە هیچیان نین و هەستیان پێ‌ناکەین،

کەوابوو لەجیهانی مادی‌دا هەر بەئەقڵ هەست بەبوونی مادەکان ئەکەین.

هەروەها لەجیهانی ئەثیری‌دا بەئەقڵ هەست بە ئەثیر ئەکەین و لەهەردوو جیهانەکەدا بەئەقڵ کاروبارمان ئەبەین بەڕێوە، کەوابوو مادەنی‌یە ئەگەر ئەقڵ نەبێت و ئەقڵیش بێ‌مادە بێ‌سوودەو هەردووکیان تەواوکەری یەکترن

وەکوو گەرم و سارد + و −.

گەردوون لەم دووانە پێك هاتووەو ئەقڵی گەورەو خاوەن دەسەڵات فەرمانڕەوای هەموو گەردوون و بوون و بوونەوەرە.

ئەقڵ ئەوهێزەیە کارئەکاتەسەر مادەکان و ئەوهێزەیە گەردوون ئەبات بەڕێوە، کەوابوو گەردوون بوو بەپێك هاتووی مادەو ئەثیر و ئەقڵ.

مێـژووی دروسـت بـوونی ئـەقڵ پـەروەردگار تـەنها خـۆی ئـەزانێ و هـیچ دروسـت کراوێکی فیزیاوی نی یە بتوانێ ئەو مێژووەمان بەڕاستی بداتێ.

## (جووڵانەوە نیشانەی ئەقڵە)

ئایا هەموو جووڵانەوەیەك هەستی پێ ئەکەین ناومان ناوە مادە؟

ئایـا ئـەقڵ فـەرمانڕەوایی ئـەکات؟ هـەروەها لـەکوێ وە وولاتـی ئـەقڵ دەسـت پـێ ئەکات؟ ئایا بەردیش ئەقڵی هەیە؟......

زانـا فیزیاویـەکان ئـەڵێن: بـەرد لەجووڵانەوەیـەکی بـەردەوام دایـە، چـونکە ئەلەکترۆنات و پرۆتۆنات لەجووڵانەوەی بەردەوامن لەگەردەکانیدا. بەخێرایی و ڕێك و پێکی. بـەڵام ئەگـەر بڵـێین ئەقڵی هەیـە... بێگومـان نـەخێر ئەم بـەردە شـوێنی ئەقڵـە چونکە دەستکردی ئەقڵی گەورەیە کەپەروەردگارە.

شـوێنی ئەقڵـە چـونکە ئـەم بـەردە بەسـەرماو گـەرماو بـاران و شـێ وورده وورده ئەڕزێ و ئەبێ بەخۆڵ بۆ خـۆراکی رووەك و رووەکیش خۆراکە بۆ ئاژەڵ و ئاژەڵیش گۆشت و شیری خۆراکە بۆ ئادەمیزاد کەخاوەنی ئەقڵە!!! و خانـەکانی لـەش و مێشك بەوخۆراکە ئەژین.

کەوابوو ئەقڵ لەوکاتەوە چووەتە ناومێشکی ئادەمیزادەوە کەباپیرەمان ئادەم(عليه السلام) دروست کرا لەقوڕ، لەو قوڕەدا ئەقڵ دروست بوو بەویستی پەروەردگار.

واتە ئەقڵ لەهەموو شوێنێك دا هەیە بەڵام بەگوێرەی بارودۆخی خۆی و پێویستی خۆی.

هەر لەڤایرۆسـێکەوە کەبەچاو نابینرێ ئـەقڵ هەیـە تاکوو ئادەمیزاد کەگـەورەترین ئەقڵی پێ بەخشراوە لەهەموو بوونەوەرەکاندا لەلایەن پەروەردگارەوە.

لێـرەدا بۆمـان دەرئەکـەوێ گـەردوون لەراسـتیدا چـۆنە بـەڵام نهێنیـەکانی نازانین.....

ئەوپاشایەی دەسەڵاتی هەیە بەسەر ئەم ناوچەیەدا کەسنووری نییـە ((مەبەستمان ئەقڵە)) خەریکە زۆر بەباشی روون و ئاشکرائەبێت بۆمان.

لەمەوپێش زۆر بۆچوون هەبوون، زۆر هەڵەیش کراون، زۆرهەوڵیش دراوە بەڵام وورده وورده بەهەوڵ دان و دۆزینەوە گەیشتوونەتە دۆزینەوەی راستی‌یەکان بەشێوەیەکی زۆرکەم.

چونکە تازە خەریکە زانایانی فیزیایی ئەم راستی یە پەسەندئەکەن کەزانا رۆحی‌یەکان سەلماندوویانە، ئەویش گەردوونی و ئەثیری و ژیانی ئەثیری دوای مردنە هەروەکوو (سێرجێمس جینز) لەکتێبەکەی‌دا ((گەردوونی نهێنی)) ئەڵێ:

((لەمەودوا ئەقڵ شتێکی کوت و پڕی نی‌یە لەمادەدا هەروەکوو لەمەوپێش دوودڵ بووین، واتە تووشی دڵەڕاوکێ بووین، ئەگەر بمان ووتایە ئەقڵ دروست کەری مادەیەو فەرمانڕەوایەتی ئەویش پەروەردگارە ((ئەقڵی گەورە))

ئەمە ووتەی ئەو زانا بەرزو بەڕێزەبوو.

زانستی نوێی رۆحی، زۆر بەهێواشی بەرەو پێشەوە ئەڕوا بۆ دۆزینەوەی گەردوونی ئەثیری، بەڵام زانستی فیزیاوی لەمەودوا پاشەکشێ ئەکا لەبیرو بۆچوونی رابووردوو، ئەمیش ئەگەڕێ بۆ جیهانی ئەثیری کەوابوو ئەم دووزانستە یەکگرن باشترە بۆ دۆزینەوەی راستی‌یەکان هەروەکوو ئێستە هەوڵ ئەدەن کەزانستێکی هاوبەش پێك بێنن و پێی بڵێن (زانستی یەکگرتووی سایکۆ فیزیاوی)

مەسیحیەکانی ئوسکتلندە ئەڵێن: ((إنَّ اللهَ روحٌ غیر متناه سَرمَدٌ لایتغیّر))

واتە(پەروەردگار رۆحێکی کۆتایی نەهاتووەو نابڕێتەوەو ناگۆڕێ)

بەڵام ئەمڕۆ ئەتوانین بڵێین ئەقڵ بەردەوامی یەکی کۆتایی نەهاتووە بەردەوام لەگۆڕان کاریدایە و بەردەوام لەفراوان بووندایە.

هەمیشە لەکۆن وێنەی نوێ دروست ئەکات و بەردەوامەو ئارام ناگرێ.

مادەی فیزیاوی و مادەی ئەثیری ئەقڵ فەرمانڕەوایی یان ئەکات و هەردووکیان گەردوون پێك ئەهێنن.

کەوابوو ئەقڵ هەتا هەتایی و بێ‌سنوورە لەبەرئەوە گەردوونیش بێ‌سنوورو ناکۆتایە هەروەکوو ئەقڵ.

ئەقڵ نەبێ مادەنی‌یەو مادە بەبێ ئەقڵ هیچ نی‌یەو ئەقڵیش بێ‌مادە دەوری نی‌یە.

واتە ئەقڵ پێش مادە هەبووەو پەروەردگار مادەی دروست کردو پاشان ئەقڵی بڵاوکردەوە لەناو ئادەمیزادو گیان لەبەرو رووەك و شتەبێگیانەکانیش دا.

بۆ نموونە تەماشای ئەقڵی ئەلەکترۆنی بکەین کەبێگیانە ئیتر بێجگە لە زیندەوەرەکانی تر کەهەرجۆرەی بەگوێرەی خۆی ئەقڵی هەیە.

لەشی فیزیاوی و مێشك ئەمرن... بەڵام ئەقڵ نامرێ و لەگەڵ رۆح دایە لەناو لەشی فیزیاوی دا پاش مردن ئەڕواتە جیهانی ئەثیری رۆحەکان و بەردەوامە لەبەڕێوەبردنی رۆحی ئەثیری. تاکوو ئەوکاتە فەرمانی پەروەردگاری دەرئەچێت بۆ ئامادەکردنی هەموو رۆحەکان و لێپرسینەوەیان و جیاکردنەوەی چاك و خراپیان و دیاریکردنی شوێنی هەریەکەیان.

## (زانست رووناکی یە و نەزانین تاریکی یە)

﴿ هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلَّا اللَّهُ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ﴾ (آل عمران: ٧)

واتە: پەروەردگار ئەو خودایە کەئەم کتێبەی ناردووەتە سەرتۆ، کەهەندێ لە ئایەتەکانی موحکەم و ڕۆشن مانان و بناغەو سەرچاوەی ئەم کتێبەن و هەندێك لە ئایەتەکانیشی موتەشاهن و زیا لەمانایەك هەڵدەگرن، کەچی ئەوانەی کە غەلوغەش لەدڵیاندا هەر دەوروخولی ئەو ئایەتانەیانە کە موتەشابهن و هەربەشوێن ئەوانەوەن، ئامانجیشیان ئەوەیە فیتنەیەکی پێ بنێنەوە یان مانایەکی دووری لێ دەربهێنن کە خوا نەبێت کەس نی یە داهاتووی ئەو ئایەتانە بزانێ، زانا ڕیشەدارەکانیش دەڵێن: ئێمە بڕوامان هەیەو هەموو ئەوانە لەخواوە هاتوون.

مەبەستی ئایەتەکە ئەوەیە لێك دانەوەی تەنها پەروەردگار ئەیزانێ و ئەوانەی زانست خوازن ئەڵێن باوەڕمان بەهەموو شتێك هەیە لەلایەن پەروەردگارەوەبێت، تەنها خاوەن هۆشەکان ئەمە ئەزانن.

هەڵناگریٚ ئەم ئایەتە ئامارژەش بێت بۆ ئەم هەموو گۆڕانكاریە گەردوونیەی كە ڕوودەدات و زانایان ڕەگ و ڕیشەی دەدۆزنەوە.

نەوەی نویٚ ئەمڕۆ، زۆربەی بەهۆی زانستەوە بەتایبەت زانستی ئاینی و ئایەتە پیرۆزەكانی قورئانەوە بۆی دەركەوتووە كەمادە رەق نی یە بەوشێوەیەی ئەیبینین چونكە مادده لەگەردەكان پێك هاتووە هەموو گەردێكیش بریتی یە لەئەلەكترۆن و پرۆتۆن و نیوترۆن و ناوك هەروەها بەدەوری ناوكیش دا ئەپیر هەیە ئەلەكترۆنات و پرۆتۆنات ئەسووڕێنێتەوە بەدەوری ناوك دا، كەوابوو هەموو گەردێك لەگەردەكانی مادە لەجووڵانەوەیەكەی بەردەوام دایەو ئەو مادە ئەثیرییەكە هەستی پیٚناكەین ئەو توندی و رەقیەی پیٚبەخشیوون هەریەكە بەگوێرەی ژمارەی ئەلەكترۆن و پرۆتۆنی خۆی.

ئەم مادە ئەثیرییە ئەگەر پلەی لەرینەوەی زیاتربێت لەئێستای هەستی پیٚئەكەین هەروەكوو هەوا هەستی پیٚ ناكەین بەڵام ئەگەر جووڵایەوەیە هەستی پیٚئەكەین.

تەنها ئەوكەسانە هەست بەم ئەثیریە ئەكەن مادەی ئەكتۆپلازمی لەشیان زۆرترە لەمرۆڤی ئاسایی كەشتی ئەثیری ئەبینن و هەست بە ئەثیر ئەكەن

هەندێكیان خۆیان ئەكەن بەغەیب زان و شێخ و هتد....

دەست ئەكەن بەكاسبی كردن. پاشان بەرەبەرە توانایان كەم ئەبیٚ و نیشانە ناپێكن پەروەردگار ئەودەسەڵاتەیان لیٚئەسێنێتەوە بەلام بەپێچەوانەوە ئەوانەی لەڕاستی و چاكەكاریدا توانایان بەكارئەهێنن رۆژ بەڕۆژ توانایان زیاترئەبێت.

بەڵام بابزانین ئایا گیان لەبەریترەەن هەست بە ئەثیر بكەن؟

ئایا ئەقڵ تەنها لەمێشكی مرۆڤ دا هەیە؟

یان پرسیارەكە بەم شێوەیە بكەین (ئایا ئەقڵیتر هەیە شەپۆلە ئەثیری)یەكان ببینیٚ یان هەستی لەئێمە بەرزتربێت؟

ئەگەر ئەم راستییەمان سەلماند ئەگەینە دۆزینەوەیەكی زۆر گەورە

ئێمـه ئـەزانین ئـادەمیزادی کـۆن چـۆن دەوروبـەری خـۆی ناسـی هـەروەها چـۆن بەئەسـتێرەکان دا ڕێگـەی ئـاوی و  وشکانیـیان دیـاری ئـەکرد هـەروەها بـەهۆی مـانگ و خۆرو ئەستێرەوە کاتیان دۆزییەوە.

دۆزینەوەی پەروەردگار لەلایەن گەورەمان ئیبراهیم (عليه السلام) بەتەماشاکردنی مانگ و خۆرو ئەستێرەکان بوو.

هەروەها دۆزینەوەکانی ((کۆپەرنیکۆ)) و نووسـینەکانی ((بیکـۆن)) لەکتێبەکەیـدا ((پێش کەوتنی زانست))

**De eugmentis scientiarum**

ئەگـەر باسـی لەرینـەوەی مـادەی بکردایـە بـەم شـێوەیەی ئێـستا لەوکاتـەدا کـەس بـاوەڕی نەئـەکردو ئەوکتێبـەی بێبایـەخ ئـەبوو چـونکە لەوکاتـەدا زانـست لـەبارەی گەردوون و ئەثیرەوە نەبوو هەروەها زانست لەبارەی مادەوە کەم بوو.

بـەڵکوو پێویـست بـوو گـەردوونی مـادی بزانـرێ ئینجـا هـەوڵ بـدرێ بۆدۆزینـەوەی گەردوونی ئەثیری، ئەم ماوەیەش ٣٠٠سێسەدساڵی خایانـد واتـە دوای سێسەدساڵ لـەدوای دۆزینـەوەی گـەردوونی مـادی ئینجـا بیرکرایـەوە بـۆ دۆزینـەوەی گـەردوونی ئەثیری.

ئەوەتا ئێستاش ئێمە زۆرگرانە لەلامان بەتەواوی لەهەردوو گەردوون تێبگەین یان زانستی تەواومان هەبێت.

لەڕاستی دا جامی وێنەیەك چۆن ئەشۆێتەوە ئینجا وێنـە راسـتی یەکـە دەرئەکـەوێ گەردوونی فیزیاوی ئێمە جامەکەیەو گەردوونی ئەثیری وێنە راستیەکەیە.

هیوامان زۆرە نەوەی داهاتوو ئەو گەردوونە ئەثیرییەو ئەو نهێنییە بدۆزنەوە یان لێ ی تـێ بگـەن و پەیوەنـدی پێوەبکـەن چـونکە ئـەم گەردوونـە نهێنییـە ئـەثـیرییـە شاراوەیە لەپشتی گەردوونی فیزیاوییەوەیە.

ئـەقڵی ئـادەمیزاد پـەروەردگار وای دروسـت کـردووە بـەخێرایی و یەکـسەری لەمەسـەلەکان تێناگـات بـەڵکو بەهێواشـی و پلەبەپلـەو لەسـەرخۆ هـەنگاو ئـەنێ بـەرەو پێشەوە بۆ تێگەیشتن.

## زاناكان ئەڵێن:

ژیانی ئادەمیزاد زۆر لەكۆنەوە لەسەر زەوی بووەو زۆر هێواش بەرەو پێشەوە ئەڕوا چونكە لەسەرەتاوە هەموو شتێكی بۆ نەڕەخساوە بەكتوپڕی بەڵكو بەپلە پلە زانست فێربووە هەروەها ئاینەكانیشی بەپلەپلەبووەو هەرجیلێك بەگوێرەی هەلومەرجی خۆی نێرراوی ئاینی بۆهاتووە تاكوو ئاینی ئیسلام‌و رابەری مەزن محمد () كۆتایی بەوپلانە هێناوەو ئاینێكە بۆسەرەتای دامەزراندنی هەردوو گەردوون‌و هەتا كۆتایی هەردووكیان دەست ئەدات‌و راست‌و دروست‌و زانستانەیە.

﴿إن ربكُم الله الذي خلق السماوات والأرض في ستة أيامٍ ثُم استوى على العرش يدبر الأمر ما من شفيعٍ إلا من بعد إذْنِه ذَلكُم الله ربكُم فَاعبدوه أفَلا تذَكرونَ﴾ (يونس:٣)

واتە: پەروەردگار لەماوەی شەش رۆژدا ئاسمانەكان‌و زەوی دروست كردو عەرشی دامەزراند. هەروەها ئەم شەش رۆژە گەردوونی‌یە لەسەر گەردوونی فیزیاوی ئێمە زۆرە هەروەكوو فەرموویەتی

﴿ ويستعجِلُونك بِالْعذَابِ ولَن يخلف الله وعده وإن يوماً عند ربك كَألف سنة مما تعدونَ﴾ (الحج:٤٧)

واتە: ئەوحەوت ئاسمان‌و زەوی‌یە كەلەشەش رۆژی گەردوونی‌دا پەروەردگار دروستی كردوون ئەكاتە ٦×٥٠,٠٠٠= ٣٠٠,٠٠٠سێسەد هەزار ساڵی سەرزەوی.

كات: لەگەردوونی فیزیاوی جۆرێكەو لەگەردوونی ئەثیری جۆرێكیترە هەروەكوو پەروەردگار فەرموویەتی لەو ئایەتانەی باسمان كرد رۆژێكی جیهانی ئەثیری بەراوردكردووە بەهەزار رۆژی ئێمە لەلایەكەوە لەلایەكیترەوە بەپەنجا هەزار رۆژی ئێمە.

جیهانی ئەثیری‌و رۆحی ئەقڵ فەرمانڕەوایەتی........

جاران خەڵك بەدرۆو فرۆفێڵی ئەزانی ئەگەر باسمان بكردایە بەڵام ئەمڕۆ بەزانست‌و بەئاین خەریكە ئەوجیهانە رۆحی‌و ئەثیری‌یە دەرئەكەوێ‌و گەورەیی‌و توانای پەروەردگارمان زیاتر بۆ روون ئەبێتەوە... هەرچەندە هەستی پێ‌ناكەین بەڵام

نیشانەو قسەکردن لەگەڵ رۆحەکان دا ئەیسەلمێنن کەئەم جیهانە هەست پێ نەکراوە ئەثیرییە جیهانی راستی و هەتا هەتایی یە.

((زانای گەردوونی ئیدنجتۆن))**Eddington**

ئەڵێ:

((پێویستە رۆحی ئادەمیزاد بگەڕێتەوە بۆ ئەوجیهانەی کەنابینرێ چوونکە پێویستی یەتی)) واتە ئەگەڕێتەوە بۆ جیهانی ئەثیری.

زیاتر لە ١٤٠٠ هەزارو چوارسەدساڵە ئاینی پیرۆزی ئیسلام و قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێشەوامان محمد (ﷺ) رائەگەیەنن بەهەموو موسڵمانان و گەلانی جیهان.

((ئادەمیزاد بەیەکجاری نامرێ و بفەوتێ بەڵکو لەم جیهانەوە کۆچ ئەکا بۆ جیهانێکی تری هەمیشەیی و هەتاهەتایی و ئێستا رۆحەکان لەو جیهانەدان و چاوەڕێی فەرمانی پەروەردگارئەکەن بۆ کۆتایی هێنان بەگەردوون و کۆبوونەوەی یەکجاری و لێپرسینەوەی کۆتایی ئەنجام ئەدرێت لەلایەن پەروەردگارەوە ...))

کەوابوو رۆح لە جیهانی ئەثیری یەوە هاتووەو ئەگەڕێتەوە بۆ جیهانی ئەثیری.

لێرەدا بۆمان دەرکەوت ئەوەی ئەبینرێ و هەستی پێ ئەکرێ دەمێکە ئاینی ئیسلام بەشتێکی کاتی و بێسوودی ئەزانی بەلام ئەوەی نابینرێ و هەستی پێناکرێ هەتا هەتاییەو کۆتایی نایەت و ژیانی راستیمان لەوێ دەست پێ ئەکات و ئەم ژیانە مان تەنها سەفەرێکەو تاقیکردنەوەیەك.

کردەوەکانمان و هەڵس و کەوتمان و رەفتارمان، بیروباوەڕمان ژیانی دوایی مان دیاری دەکات.

کەوابوو زەوی وەکوو شەتڵگەوایە (مشتل) ئەم ئادەمیزادەی لێ بووە بەو بەرگە فیزیاوی یەوە، رۆژێك ئەبێت ئەوبەرگەی فڕێداتەوە ناو زەوی و ڕۆحەکەی بەرەو جیهانی ئەثیری بکەوێتەڕێ.

کەوابوو مردن لەدایك بوونێکی راستی یە و لەو لەدایك بوونەی یەکەم جارمان چاکترو ڕاست ترە ئەگەر لەڕۆحە باشەکان بین.

لێرەدا پێویستە ئەم ڕاستی یە بسەلمێنین لەم بەشەدا بەتاقی کردنەوەو بەقسەکردن لەگەڵ ئەو ڕۆحانەدا کەزۆر دەمێکە لەشی فیزیاویان فڕێ داوەو چوونەتە جیهانی ڕۆحی و ئەثیری‌یەوە هەروەها پرسیاریان لێ بکەین و وەڵامەکانیان بەدەنگی خۆیان و بەناوونیشانی راستەقینەی خۆیان وەرگرین.

تاکوو زۆربەئاشکرا هەردوو گەردوونمان لێ دەرئەکەون و راستی یەکان ئەسەلمێنین إنشاء الله.

## (راستی یە سەرەکی یەکان)

(( بیرك )) ئەڵێ:

(ڕاستی یەکان بۆ مێشك وەکوو خۆراکن بۆلەش، بۆ هەرس کردنی راستی یەکان ئادەمیزاد توانای ئەقڵی و لەش ساغی پێویستە، لەش ساغی بەندە بەخۆراکەوە وەهەر کەسێکیش ئەقڵی زۆرتر لەراستی یەکان هەرس کات ئەوە ئاقڵ ترەو توانای رووبەڕووبوونەوەو قسەکردنی زۆرترە لەکۆمەڵ دا، وەباشترین هەڵس و کەوتی ئەبێ لەتێکەڵاوی خەڵکدا).

ئێمە هەمووومان لەوانەیە لەووڵاتی خۆمانەوە بۆ ووڵاتێکی بێگانە رۆیشتبین یان هەر هیچ نەبێ لەشارێکەوە بۆ شارێکی تری ناوخۆی ووڵاتەکەمان بۆ کارێك یان بۆ گەڕانێك رۆیشتبین کاتێ ئەگەینە ئەو ووڵاتە یان ئەوشارە مەبەستمانە چەندخۆشە یەکێکی ناسراو ئەبینین پێش ئێمە رۆیشتووەو ماوەیەکە لەوێ یە دوای هەواڵ پرسینی خۆی بەکورتی ئینجا بەدرێژی دەیان پرسیاری لێ ئەکەین لەئاوو هەوای ئەو شوێنە لەو جل وبەرگانەی پێویستمانە لێرە لەبەری بکەین. خۆراکیان چی یە، قسەکردنیان، شوێنە خۆشەکانیان. هاوینەهەوارەکانیان هتاد...

لەم پرسیارانەو زۆرتریش.

پێویستە هەموومان ئەو راستی یە بزانین ئەو کۆچ کردنە کە لە ڕێگەماندایە پێ ی ئەڵێین مردن رۆژێك دێت و ئەبێ ئامادەبین بۆی چونکە ئەم ژیانەی جیهانمان زۆر جیاوازە لەو ژیانەی جیهانی رۆحی ئەثیری.

لەبەرئەوەی لەشمان دووانەیە لەشێکی فیزیاوی هەستی پێ‌ئەکەین لەشێکی ئەثیری ناواخنی یەتی هەستی پێ ناکەین لەشە فیزیاوی‌یەکەمان راهاتووی جیهانی فیزیاوی یە بەڵام لەشە ئەثیری و رۆحە ئەثیری یەکەمان ئەبێ بڕوا بۆ جیهانی خۆی و رانەهاتووە لەوێ لەلایەن ئەوانەی پێشتر لەئێمە رۆیشتوون واتە مردوون و لەوێن ڕێنومایی شوێنی تازەمان ئەکەن لەجیهانی ئەثیری دا.

لەم جیهانەدا چۆن خۆمان راهێناوە لەسەر ئەم ژیانەو هەموو رۆژێ خۆمان ئامادەئەکەین بۆ رۆژی دوایی تر هەروا ئەبێ خۆمان ئامادەبکەین بۆ رۆژیی دوایی هەتا هەتایی کەکۆچی بۆئەکەین.

لەم جیهانەدا هەمووشتێك فیزیاوی یە لەش و مێشك فیزیاوین پیرئەبن و ئەمرن بەڵام رۆح و ئەقڵ ئەثیرین پیرنابن هەرگیزو هەتا هەتایە نامرن.

لەجیهانی ئەثیری دا ژیان جۆرێکی تایبەتە، کەم ئەندام نی یە چونکە رۆح و ئەقڵ تەواون، ئەگەر کەم و کوڕی یەك لەلەشی فیزیاوی هەرکەسێك دابووبێت لەجیهانی ئەثیری‌دانامێنێت، کوێری و کەڕی و دەست و قاچ پەڕی و شێتی هتد... هەر نەخۆشی و ناتەواویەك بووبێت لەجیهانی ئەثیری‌دا نامێنێ (جیهانی بەرزەخ).

هەروەها پیربوونیش نی یە و هەمووکەس لەتەمەنی لاوی دایە.

لەجیهانی ئەثیری دا هەموو شتێك ئامادەکراوە بۆئەو رۆحانەی کۆچ ئەکەن بۆئەوێ....

(پێغەمبەرمان محمد (د.خ) لەکاتی مردنی تاکە کوڕەکەی دا (ئیبراهیم) کەتەمەنی ساڵ و نیوێك بوو (١٨ هەژدە مانگ) ویستی دڵ تەنگی خۆی و دایکی لابەرێ و رووی کردە دایکی ئیبراهیم (ماریە) فەرمووی (غەمت نەبێ لەبەهەشتا دایەنیان بۆدابین کردووە))

(بڕوانە کتێبی (حیاە محمد) دانەری دکتۆر (محمد حسین هیکل) کەوابوو ئەومنداڵانە کۆچ ئەکەن ئەوانیش تەنها لەشی فیزیاویان فڕێ ئەدەن و رۆحیان ئەڕوا بۆ جیهانی ئەثیری و لەوێ پەروەردەئەکرێن تاکوو ئەگەنە تەمەنی لاوی لەگەڵ ئەو پیرانە کەگەڕاونەتەوە تەمەنی لاوی هەموو لەتەمەنی لاوی‌دا ئەبن لەجیهانی رۆحی دا ئەبن

واته (بەرزەخ) تاکۆتایی هەمووشتێك دێت ئینجا لەجیهانی دوایی و هەتا هەتایی دا حەشرئەبێت و جیاکردنەوەو لێ پرسینەوە ئەبێت و بڕیاری یەکجاری و هەتا هەتایی جێ بەجێ ئەکرێ لەلایەن پەروەردگارەوە...

لەجیهانی ئەثیری دا تەمەن وەکوو تەمەنی جیهانی فیزیاوی نی یە چونکە کات لەسەر زەوی بەگوێرەی سووڕانەوەی زەوی بەدەوری خۆی‌داو خۆردا دیاری ئەکرێت هەردووکیان مادی و فیزیاوین یان بەهۆی مانگەوە مانگیش فیزیاوی یە.

بەڵام لەجیهانی ئەثیری و ڕۆحی دا کات وەکوو خەوبینین وایە ئێمە زۆرجار لەخەومان دا کارێك ئەنجام ئەدەین کەبەچەندساڵێك تەواونابێت لەجیهانی فیزیاوی دا بەڵام لەخەومان دا کەنیو دەقیقە ڕەنگە کەمتربێت لەخەوەکەدا ئەو هەموو کارانە ئەنجام ئەدەین.

**زانای بەناوبانگ خاوەنی تیۆری ڕێژەیی (ئەنیشتاین) ئەڵێ:**

**کات ڕێژەیی یە، پاشەڕۆژ ئەبەستریٚ بەئێستاوە، لەوانەیە بگاتەوە بەرابردوو، چونکە ئێمە لەهەموو چرکەیەکدا بەشێك لەپاشەڕۆژ ئەبڕین و ئەیخەینە سەر ڕابوردوو هیچیان کەم و زیاد ناکەن چونکە هەردووکیان بێ کۆتاین (نە ڕابوردوو ئەزانین سەرەتای کامەیە و نە پاشەڕۆژیش ئەزانین کۆتایی کەی ئەبێت)[1].**

**شاعیری کوردی پایەبەرز مامۆستا (مەولەوی لەعەقیدەی مرضیە دا) باسی ئەزەلیەتی پەروەردگار ئەکات**

**فەرموویەتی:**

**ئەزەلی و ئەووەڵ بەبێ بیدایەت**

**ئەبەدی و ئاخر بەبێ نیهایەت**

**واتە: پەروەردگار سەرەتای نی یە و کۆتایشی نی یە، ئەوەڵ و ئاخرە، ئەزەلی و ئەبەدی یە**

**هەروەها ئەفەرمووێ:**

**ئەزەل پەیمانی لەگەڵ ئەبەدکرد**

**ئەزەل هەڵبگرد، ئەبەد دابگرد**

**ئەو سەربەرەو ژوور تاقووەتی بوو**

**ئەم سەربەرەو ژێر تاتاقەتی چوو**

**ئەو دەڵێ فەریاد: أَینَ إبتداء؟**

**ئەم دەڵێ هەی داد: أَینَ إنتهاء؟**

---

**(١) ئەگەر ئەنیشتاین وەك زۆرێك لە فەیلەسوف و زانا گەورەکان لەمەدا سەرگەردانیەکی هەبوو بێت، ئەوە ئێمەی موسوڵمان وەك مامۆستا هەژار موکریانی دەڵێت دوورین لەو سەرگەردانیەو ئەزانین دونیا سەرەتای هەیەو کۆتایشی هەیە، دونیا هەیەو قیامەتیش بەدوایدا دێت و ئەو سەرگەردانیەشی پێ ناوێت، مامۆستا هەژار دەڵێ: ڕۆشنبیرانی زۆرزانی خوا نەناسیش ئاتاجی یان بەخوایەك هەیە، بەڵام دەڵێن بەداخەوە نی یە!! لایان وایە ئەگەر ببوایە کار لە جێ یەکی ترەوە دەبوو.. سەرنج بدە ئەمان دەڵێن: ئەگەر خودا هەبا باش بوو، عیرفانەکەی خۆمان دەڵێ: ئەگەر هەبوایەی پێ ناوێ، هەیەو.. باشە. بڕوانە کتێبی ژمارە٣٦ی پرۆژەی تیشك.**

واتـە ئـەزەل و ئەبـەد پـەيمان و گرەويـان كـرد كەھەريەكـەيان لـەلای خۆيـەوە خـاڵی دەست پـێ كـردن و كۆتـايی پـەروەردگار بدۆزنـەوە، ئـەزەل سـەربەرەوژوور ھەڵگـەڕاو ئەبەديش سەربەرەوخوار، پاش مانـدووبوونيان ئـەزەل ھـاواری لێ ھەڵساو ئـەی ووت ئەی ھاوار سەرەتا لە كوێ يە؟ ئەبەديش ھـاواری كـرد ئـەی ھـاوار كۆتـايی لـە كـوێ يـە؟ بـەم جـۆرە ھـەردووكيان بەناچـاری دەگەڕێنـەوە ئـەڵێن سـەرەتاو كۆتـايی پـەروەردگار لەووزەی هيچ شتێكدا نی يە!!

ئـەبينن پاشـەڕۆژ وەكـوو بازنەيـەك سـووڕئەخواتەوەو ئەچـێتەناو رابـووردووەوە (ھـەروەكوو وتمـان لەھـەموو چـركەيەكدا لەپاشـەرۆژ ئەخەينەسـەر رابـوردوو) بازنـە نيشانەی ھـەتا ھـەتايی يـە ئـەو رۆحـەی جووڵانـەوەی لـەخێرايی روونـاكی خێراتـرە ئـەتوانێ بگاتـەوە بـەو تيـشكە روونـاكی يـەی كـەزەوی بـەجێ ی ھێـشتووە لەدێرزەمانـەوەو ئـەتوانێ پـێش بكەوێتـەوەو بـەم جـۆرە وێنـەكان ھەڵـەو گێـڕاو دەرئەكەون، كەوابوو رۆح رابوردوو ئەبينێ و لەپاشەڕۆژدا ئەگەڕێتەوە وئێستا ئامادە ئەبێتەوە.

لێرەدا بۆمـان دەرئەكـەوێ كەلەشـی راسـتيمان رۆحـەو ئـەثيری‌يـە بـەرگی فيزيـاوی تـێگيراوە ھـەموو ئەندامـەكانی لـەشمان بـەرگی فيزيـاوين بـۆ ئەنـدامی لەشـە ئەثيری‌يەكەمان ھـەروەكوو چـۆن دەسـتكێش ئەكرێتـە دەس ئابـەوجۆرە لەشـی ئـەثيری بەلەشـی فيزيـاوی بـەرگی گـيراوە، كـەی لەشـە فيزياوی‌يەكـە لەناوچـوو لەشـی ئـەثيری ئازادئەبێت و ئەڕوا بۆ جيھانی ئەثيری واتە جيھانی(بەرزەخ)

## تێبينی:

(لـەم باسـەدا تـەنھا باسـی جيھـانی فيزيـاوی ئەكـەين و لەگـەڵ جيھـانی ئـەثـيری) ناكۆتـايی و لـەكۆتايی دا باسـی ئەوجيھانـە ئەكـەين پرسـيارو وەڵامـەو جياكردنـەوەی يەكجاری چاك و خراپ و بەھەشت و دۆزەخ ھتد باس ئەكەين.

لەوكاتەوە بەفەرمانی پەروەردگار ئەو رۆحە ئەكرێتە نـاو ئـەو ھێلكەيـەوە (البيـضة المخـصبة) لـەڕەحمی ئـافرەت داو مـێ ی گيـان لەبـەران و رووەك دا ئـەو رۆحـەو ئـەقڵی ئەثيری دەوری ئـەگيرێ بەمادەی فيزيـاوی ھـەتا لـەدايك ئـەبێت و ژيـان بۆمـاوەی ديـاری

كـراوى خـۆى ئەباتەسـەر ئـەو رۆح و ئەقلـە ئـەثـيرىيـە وان لەوبەرگـە فيزياوىيـەدا مێـشكمان فيزياوىيـەو ئـەقڵى ئـەثـيرى تێدايـەو كارئەكاتەسـەرى كـەوابوو ئـەقڵ هەردوودەور ئەبينێ لەجيهانى فيزياوى و ئەثيرداو هەرگيزپيرنابێت.

ديسانەوە ئـەبێ ئـەوە بـزانين ئەوانـەى بـەرگى فيزيـاوى فڕێئـەدەن و پێيـان ئـەڵێن مردوون ئەوان ئەثيرين و ئێمە بەئەثيرى ئەبينن واتە رۆح و ئەقڵى ئەثيرى ئێمە ئـەبينن. هەروەها ئەتوانن ئەو وێنانە ببيـنن لەناومێشكى ئەثيرى و رۆحى ئەثيرى ئێمـەدان تەنانەت وێنەى ئەوكارانەى كەهێشتا نەمانكردوون.

كـەوابوو ئـەتوانن ئـەقڵى ئێمـە بخوێننـەوە بـەڵام توانـاى لەرينـەوەيان نىيـە تـاكوو قـسەمان لەگـەڵ بكـەن چـونكە زۆر دوورن هەنـدێكيان نـەبێ لەلايـەن پـەروەردگارەوە بەهرەى تايبەتيان پێ بەخشراوە ئەتوانن بێنەوە سەر زەوى و بڕۆنەوە.

لەڕاستيدا ئێمـە زۆر زۆر گـەورەو بـەڕێزترين لـەوەى كـەخۆمان ئـەيزانين بـەڵێ زۆر زۆريش چاكەمان لەگەڵ كراوە لەدروست بوونماندا.

لەلايەن پەروەردگارەوە هەروەكوو لەقورئانى پيرۆزدا فەرموويەتى:

**ولقد كرمنا بني آدم وحملناهم في البر والبحر ورزقناهم من الطيبات وفضلناهم على كثير ممن خلقنا تفضيلاً﴾ (الاسراء: ٧٠)**

ئەگەر ئێمە وابزانين ئەقڵمان ئەومێشكە فيزياوىيەيە ناتوانين گەورەيى ئەقڵ بزانين تاكوو رزگارمان نەبێت و ئەقڵى ئەثيرىمان ئازادنەبێت لەوبەرگە فيزياوىيە.

ئێمـە ئـەقڵى سـەرزەوى مـان ناونـاوە ئـەقڵى راسـتى ((واعـى)) خـاوەن هـۆش و تێگەيشتوو، بەڵام ئەوئەقڵەو ئەقڵى نهێنى ((باطني)) بەهەردووكيانەوە ئەقڵى گەورەو تەواومان پێك ئەهێنن.

ئـەقڵى سـەرزەوى مـان لەسـەر زەوى كارئـەكات بـەڵام ئـەقڵى تـەواومان لـەجيهانى ئەثيرى و رۆحىدا كارئەكات.

هەردووئـەقڵى(واعـي و بـاطني)واتـە ئـەقڵى فيزيـاوى و ئـەثـيرى پـێش بڕكـێ ئـەبێ لـەنيوانيان دا هەنـدێ جار ئـەقڵى (بـاطني) نـاوخۆيى يـان نهێنـى سـەرئەكەوێ بەسـەر ئەقڵى ظاهرىدا.

لەوكاتەدا پێش بینی ڕووداوەكان ئەبێت و ئەوكەسە ئەزانێ پاش ماوەیەكی تر چی ڕووئەدات!!!

هەروەها ئەبینین یەكێك ئەیەوێ كارێك ئەنجام بدات بیرئەكاتەوە واتە هەردوو ئەقڵەكەی ئەخاتەكار ئەقڵی (باطني) شتێك بەبیری دا ئەهێنێ بەڵام ئەقڵی ظاهری جۆرێكیتر ئەبینی بەقسەی ئەقڵی ظاهری ئەكات ئەوكەسە زیاتر وایە لەهەموو كاتێك دا بەڵام باش دەرناچێت لەكارەكەی دا دوایی پەشیمانەو ئەڵێ هەرئەمزانی بەم جۆرە ئیشەكەم سەرناكەوێ!!!! واتە ئەقڵی باطنی ڕاستی كردووە.

زۆرجار كەسانێك هەڵئەكەون نهێنی خەڵكی تر ئەزانن هەروەها هەندێ نهێنی جیهانی ئەثیری ئەزانن و گوێ یان لەقسەی زۆر زۆر دوورئەبێت ئەمەش سەركەوتنی ئەقڵی باطنی یە (ناوخۆیی)بەسەر ئەقڵی (ظاهري) دەركەوتوودا و كاتی‌یە لەهەندێ كەسان داو پاش ماوەیەك وەكوو خۆی لێ دێتەوە!!.

ئەم گۆڕانە ئەقڵی یە لەژمارەیەكی زۆركەم لە ئادەمیزاد دائەبێت.

بەم جۆرە تاكۆچ كردنمان بۆ جیهانی ئەثیری ڕۆحی ناوخۆی نهێنی و ڕۆحی دەرەوەی ئاشكرا جیاواز كارئەكەن و لەجیهانی هەتا هەتایی دا ئەقڵی گەورەمان كارئەكات.

**هەندێ لەزانا ڕۆحی یەكان ئەڵێن:**

ڕۆح تەنها ناوێكە لەسەر زەوی باسی ئەكرێ بەڵام لەجیهانی ئەثیری‌دا بەلەشی ئەثیری ناو ئەبرێ واتە وێنەیەكی تەواو یان قاڵبێكی تەواوی ڕێك و پێكی لەشی فیزیاوی‌یەو پیرنابێ، كەم ئەندام نابێت ( نامرێ هەرگیز ) لەخۆشی دابێت هەمیشە خۆشیەتی و لەناخۆشی دا بێت هەمیشە ناخۆشی یەتی هەروەكوو لەدۆزەخ دا ئەسووتێ و نامرێ هەرگیز بەردەوام ئازارو ناخۆشی ئەچێژێ بەپێچەوانەوە لەبەهەشت دا تێربوونی نی یە لەخۆشی هەمیشە لەخۆشی دایە!!!.

((زاناكان كاتی خۆی بەرلەچەند ساڵێك دەیانووت: مادە نافەوتێ بەڵام لەشێوەیەكەوە ئەگۆڕێ بۆ شێوەیەكی تر و لەبارێكەوە ئەگۆڕێ بۆ بارێكیتر، هەرچەندە

ئێستا واناوترێ‌و بەڵکو دەوترێ مادە بەردەوام لەئەشکەوتە ڕەشەکاندا کۆتاییان پێدێت‌و دەبنە وزەو ئەشتوانرێ وزەکان بکرێنەوە بەماددە.

بۆ نموونە: ئەگەر جامێ ئاو بکوڵێنین پاش ماوەیەك ئەبێ بەهەڵمێکی دیارو بەرزئەبێتەوەو پاشان ئەبێ بەهەڵمێکی نادیار (رتوبەت) دوای ئەوە ئەتوانین ئەو رتوبەتە لەناو هەوادا بکەینەوە بەئاو کەبەچاو نابینرێ!!!!

کەوابوو پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿ مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَى﴾ (طه:٥٥)

﴿ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلاً وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَنْ يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ﴾ (يّس:٧٨)

ئەوە راستی‌یەکە لەوە راست تر هەرگیز نی یە.

کەوابوو لەشی فیزیاوی مان لەشی ئەثیری‌مان نابینێت  چونکە وەکوو هەڵمی ئاوەکە لەهەوادا کەرتوبەتە نابینرێ‌و ئەوەی نابینرێ لەشە ئەثیری‌یەکەیە. ئەوەی ئەبینرێ ئاوەکەیە واتە لەشە فیزیاوی یەکەیە.

ئەوەی لەشی فیزیاوی ئەمرێ لەشی ئەثیری لەو قەفەزە رزگاری ئەبێ‌و ئەو لەشە ئەثیری‌یە گوێی لەدەنگی لەشە فیزیاوی‌یەکان ئەبێ‌و هەروەها وێنەکانی مێشکیان ئەبینێ لەگەڵ کردەوەکانیان‌و گوێیان لەدەنگیان ئەبێ‌و ئەتوانن قسە لەگەڵ لەشە فیزیاوی‌یەکان بکەن ئەگەر ناوەندێك هەبێ، واتە ئادەمیزادێك مادەی ئەکتۆپلازمی زۆربێت بەهۆی ئەوناوەندەوە لەجیهانی رۆحی یەوە قسەکردن دروست ئەبێت لەگەڵ جیهانی فیزیاوی‌دا.

## ( لەبەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا ووتمان بۆشایی گەردوون بەتاڵ نی یە )

چونکە هەموو گەردوون بەبوون‌و بوونەوەرەوەو لەهەموو شوێنێکدا پڕە لەمادەی ئەثیری ناسك کەبەچاونابینرێ.

لەم مادە ئەثیری‌یەدا هەزاران ملیار رۆحی ئەثیری نیشتەجێن ئێمە پێ یان ئەڵێین مردوون!!!

بەڵام لەئاینی ئیسلام دا ئەم نیشتەجیٚ بوونە لەم جیهانە ئەثیری و رۆحی یەدا پیێ ی دەووتریٚ (بەرزەخ) ، ئەوجیهانەی دەکەویٚتە نیٚوان ئەم جیهانەو جیهانی دوایی و زیندووبوونەوەی یەکجاری واتە لەکۆتایی دا گەردوون تیٚك چوو هەرچی زیندوو هەیە لەسەر زەوی هیچی نامیٚنیٚ و لەگەلٚ هەموو رۆحەکانی تردا رۆژیٚك کۆبوونەوەی فراوان ئەبیٚت و پیٚی ئەلیٚن (حشر)لیٚپرسینەوەو جیاکردنەوە ئەبیٚت و دۆزەخ و بەهەشت شویٚنی دووجۆرە رۆحن چاك و خراپ.......هتد.

لەکۆتایی ئەم کتیٚبەدا باسی ئەورۆژە ئەکەین و بەئایەتە پیرۆزەکانی قورئانی پیرۆزەوە....

﴿ لَعَلِّي أَعْمَلُ صَالِحاً فِيمَا تَرَكْتُ كَلَّا إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَائِلُهَا وَمِنْ وَرَائِهِمْ بَرْزَخٌ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴾ (المؤمنون:١٠٠)

واتە: لەدوایانەوەیان لەپشتیانەوە جیهانی تایبەتی رۆح (بەرزەخ) هەیە تاکوو رۆژی زیندووبوونەوە. جیهانە ئەثیرییەکان حالٚەتن و شویٚنن دەوری گۆی زەویان داوە هەروەکوو ئەلٚقەکانی دەورەی ئەستیٚرەی زوحەل،، دوورنی یە ئەوجیهانە ئەثیرییانە بەدەوری گۆی زەوی‌دا دیار نەبووبن هەروەکوو ئەلٚقەکانی زوحەل و بەرابوردنی کات کالٚ بوونەتەوەو ئیٚستا دیارنین و نابینریٚن!!!.

**بڕوانە ویٚنەی ژمارە (٢٢) زەوی‌و جیهانە ئەثیرییەکان**

لەم ویٚنەیەدا جیهانی راستی دەرئەکەویٚ بازنەی ژمارە(١) زەوی یە و لەبازنەی ژمارە(٢) تاکوو (٨) حەوت ئاسمانی ئەثیرین بۆحەوت جیهانی ئەثیری و هەر حەوتیان چووەنەتەناویەك بەدەوری زەوی دان. دووریان لەیەکترەوە جیاوازە هەرچەند لەویٚنەکەدا وەك یەك دەرئەکەون.

جیهانە ئەثیرییەکان حالٚەتن و شویٚنن گۆی دەوری گۆی زەوی‌یان داوە هەروەکوو ئەلٚقەکانی دەورەی ئەستیٚرەی زوحەل، دوورنی یە ئەو جیهانە ئەثیرییانە بەدەوری گۆی زەوی‌دا دیارنەبووبن هەروەکوو ئەلٚقەکانی زوحەل و بەرابوردنی کات کالٚ بوونەتەوەو ئیٚستا دیارنین و نابینریٚن!!!.

ئێمە لەناو جووڵانەوەی یان لەرینەوەی شەپۆلە فیزیاوییەکاندا ئەژین لەم جیهانە فیزیاوی یەداو بەم لەشە فیزیاوی یەمانەوە ، بەڵام رۆحەکان لەجیهانی ئەثیری بەلەشی ئەثیرییەوە لەناو شەپۆلە ئەثیرییەکاندان چونکە رۆح و ئەقڵی ئەثیری لەجیهانی ئەثیریدا ئەگونجێن.

هەروەکوو ئێمە بەلەشی فیزیاویمانەوە لەم جیهانە فیزیاوی یەدا گونجاوین.




وێنەی ژمارە ( ٢٢ ) زەوی و جیهانە ئەثیریەکان

**زانایانی رۆحی ئەڵێن:**

لەجیهانی ئەثیری دا کارکردن بۆ پارەو سامان و پلە هیچ نی یە و بایەخی نی یە، بەڵام کردەوەو بیروهۆشی پێشوو لەجیهانی فیزیاویدا دەوری سەرەکی هەیە بۆ دیاریکردن و جیٚ و شوێنی خۆی لەجیهانی ئەثیریدا باش بێت یان خراپ.

هەموو زانایانی ئەم باسە لەسەرووی هەموویانەوە (فندلای) ئەڵێن:

(ئەقڵە نزمەکان و بیروهۆشە خراپەکان و کردەوە پیسەکان و دەست درێژی کەران و زاڵمەکان و زۆردارەکان حاڵیان زۆر زۆر خراپە بەڵام ئەقڵ بەرزەکان و پاک و چاک و تێگەیشتووەکان و کردەوە چاکەکان و بیروهۆشە پاکەکان حاڵیان زۆر زۆرباشە).

لەبەرئەوە بایەخ دان بەرەوشت بەرزی و یەکتاپەرستی و.... بیروهۆش پاکی و کردەوە چاکی زۆر زۆر پێویستە لەم جیهانە فیزیاوی‌یەدا بۆ خۆئامادەکردن بۆ جیهانی رۆحی ئەثیری.

دیسانەوە زانایانی رۆح ئەڵێن:

ئەگەر ماوەیەك خراپەت کرد لەجیهانی فیزیاوی‌دا پاشان پەشیمان بوویتەوە ئینجا مردیت واتە بەکردەوە چاکی مردیت ئەوە شێوەی چاکەکەت پیٚیەو بەو شێوەیەوە لەجێگەی چاك دائەبیت لەجیهانی ئەثیری‌دا.

وەئەگەر چاك و پاك بووبیت لەسەرەتای تەمەنەوەو لەناوەراست و کۆتایی تەمەن دا لەجیهانی فیزیاوی دا لات دا لە ریٚ ی چاکەوە بۆ رێگەی خراپ ئەوە بەشێوە خراپەکەوە جێگەت دیاری ئەبێت لە ئەثیرداو جێگەت خراپە.

کەوابوو رای ئەوزانا رۆحی یانە و زانستیان هەرچەندە زۆربەیان ئیسلام نین لەگەڵ باوەڕی ئیسلامی‌دا ئەگونجیٚ (من جاء بالحسنة فله عشر أمثالها ومن جاء بالسيئة فلا يجزي الامثلها).

چاك بۆ بەهەشت و خراپ بۆ دۆزەخ بەدرێژی بەئایەت و حەدیثەوە باسی ئەکەین لەداهاتوودا.

(لێرەدا تەماشای بیروباوەڕی زانای ئەثیری: ج ـ ئارثەر ـ فەندلای j.Arthar Findilay ئەڵێ:

(ئەگەر بیروهۆشی بەرزوپاکمان لەم جیهانە فیزیاوی یەدا نەبێت لەجیهانی ئەثیری دا هەربەوجۆرە بیروهۆشی بەرزو پاکمان نابێت کەوابوو بۆچی لەم جیهانە فیزیاوی و کاتی یەدا بەهەموو جۆرێك باش نەبین تاکوو لەجیهانی رۆحی و ئەثیری هەتا هەتایی دا شادو سەرکەوتوو بین........هەروەها ئەم زانایە بەردەوامەو ئەڵێ:

ئێمە رۆژ لەدوای رۆژ ئەتوانین جێگای پاشە رۆژمان چاك بکەین بەهەڵس و کەوتی چاك و کردارو رەوشتی چاك لەم جیهانەدا بۆئەوەی لەجیهانی ئەثیری و رۆحیدا لەگەڵ چاکەکان و پاکەکان بین و لەجێگەی خۆش دابین بەڵام ئەگەر لەم جیهانەدا خراپەکاربووین لەجیهانی ئەثیری دا لەگەڵ خراپەکاران و لەجێگەی خراپ دائەبین.

لەبەرئەوە پێویستە لەسەر هەمووکەسێك لەسەر ئەم زەوی یە هەوڵی چاکەبدات و هیچ گومانی تێدانی یە بەکردەوەکانی خۆیدا ئەزانێ لەو جیهانە ئەثیری یە دا جێگەی چۆنە.

واتە بەرەو چاکەکاری و چاکەخوازی و دوورکەوتنەوە لەهەموو خراپەکاری تاکوو سەرکەوتووبین لە تاقی کردنەوەی جیهانی فیزیاوی و پلەی باش بەدەست بێنین بۆ ژیانی ئەثیری هەتا هەتایی. لێرەدا ووتەی ئەم زانایە کۆتایی هات.

بەڵام ئایا ئاینی ئیسلام هەزاران هەزارجار زیاتر لەم زانایە داوای چاکەکاری ناکات؟

ئایا قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی رابەری مەزنمان محمد (د.خ) هەموو باسی چاکە نییەو دوورکەوتنەوە لەخراپە.....

ئایا زانایانی ئیسلام لەهەموو شوێنێکدا باسی چاکە ناکەن؟

ئایا باسی دوورکەوتنەوە لەخراپەناکەن.

کەوابوو ئەگەر کردەوەمان باش بوو هەروەکوو ئەو موسڵمانەی لەکاتی سەرەمەرگ دا بۆ دواجار فەرمووی:

﴿ قَدْ أَفْلَحَ مَنْ تَزَكَّى ﴾ (الأعلى:١٤)

چونكه لەجيهانى ئەثيرى دا جێگەى خۆى بينى لەوكاتەدا رۆحى دەرچوو!!!.

كەوابوو ئەوانەى ئێمە ناومان لێ ناون مردوو هەموويان زيندوون و لەجيهانى ئەثيرى دان.

ئەگەر يەكێك مادەى ئەكتۆپلازمى زۆربێت لە لەشى دا ئەوە بەهۆى ئەوكەسەوە ئەتوانين قسە لەگەڵ رۆحەكانى جيهانى ئەثيرى بكەين.

لە كتێبى (ژيانى محمد * حياة محمد) (ﷺ) نووسينى هيكل پاشا ئەڵێ: لەجەنگى بەدر موسڵمانەكان ژمارەيان زۆر كەم بوو هەرەوەها چەكيشيان بەراووردنەئەكرا لەگەڵ چەكى گەورەو چاكى دوژمنەكانيان لەگەڵ ئەوەشدا موسڵمانەكان سەركەوتن بەسەر قورەيشى يەكاندا!!!

شەوداهات و كوژراوە قورەيشى يەكان نێژران پێغەمبەرمان محمد (د.خ) لەگەڵ هاوڕێكانى دا ئاگادارى ديلەكانيان ئەكردو ئێشكى ناوچەكەيان ئەگرت.

لەتاريكى شەودا هاوڕێيانى پێغەمبەر محمد (د.خ) گوێيان لێ بوو كە پێغەمبەرمان محمد(د.خ) قسە لەگەڵ كوژراوە قورەيشى يەكان ئەكات لەسەر قەبرەكەيان و ئەيفەرموو :

(يا أهل القُليب : عتبة بن ربيعة ويا شيبة بن ربيعة ويا أمية بن خلف ويا أبا جهل بن هشام ...هتد) بەم جۆرە بانگى يەكەيەكەى كوژراوەكانى ئەكردو ئەيفەرموو :

ئايا ئەوەتان دى پەروەردگار بەڵێنى دابوو بۆمان بكات ئەويش سەركەوتنمان بوو ئێمە واديمان بە ڕاستى . لەم كاتەدا موسڵمانان و يارانى زۆر بە سەرساميەوە پێ يان ووت ئەى پێغەمبەرى خودا قسە لەگەڵ ئەو كوژراوە بۆگەنانە ئەكەى لەناو ئەو گڵەدا چۆن گوێيان لێ يەو چۆن وەڵامت ئەدەنەوە ..ئەويش فەرمووى گوێيان لێ يە بەلاّم ناتوانن وەڵام بدەنەوە واتە ڕۆح و ئەقڵى ئەثيريان دەنگى ناگاتە لاى ئێمە بەهۆى ناوەندێكەوە نەبێت هەروەكو باسمان كرد .

ئەمانە هەندێ لەو بەڵگەو نیشانەو ڕاستیانەن کە باسی ژیانی پاش مردن ئەکەن ..ئیتر هەرکەس ڕەخنەو تێبینی پێچەوانەی هەبوو من وەکو زانای ناودارو بەرز (لویس پاستۆر) وەڵامی ئەدەمەوە :

(ئەمەی باسمان کرد مەسەلەی دین و فەلسەفەو بێ دینی نی یە مادی و ڕۆحی نی یە ، بەڵکو ئەمە مەسەلەی کارێکی ڕاستی یە ) ڕاستی دیارەو هەیەو ناگۆڕێ ، هەرکەسێ یاسایەکی پێك هێنا بۆ خۆی دژی ئەم ڕاستیانە بێت پێویستە ئەو یاسایەی بگۆڕێت تاکو لەگەڵ ڕاستی یەکاندا بگونجێت ، چونکە ڕاستی ناگۆڕێت تاکو لەگەڵ یاسای دەستکردو دروست کراودا بگونجێت . لێرەدا ئەتوانین بڵێین ئاین و زانست یەك ئەگرن ئەگەر ڕاستی‌یەکان لە پێشەوە بن وە نەیان گۆڕن . بەم جۆرە ئادەمیزاد زۆر بەرەو پێشەوە ئەڕوا لە تێگەیشتنی ئەقڵیداو یەکێتی وبرایەتی لەهەموو مرۆڤایەتی دا دروست دەبێت و هەموو مرۆڤایەتی بەختیارو ئازاد ئەبێت .لێرەدا ئەتوانم بڵێم زۆر کەس هەیە ئەم ڕاستیانە بەسەرلێشێواوی ئەداتە قەڵەم و باوەڕی پێ ی نی‌یە بەلاَم ڕۆژێك ئەبێت هەردوو زانستی فیزیاوی و پاراسایکۆلۆجی زیاتر هەنگاو ئەنێین و تێگەیشتن زۆر ئەبێت دەربارەی هەردوو جیهان و ڕاستی یەکان زیاتر ڕوون و ئاشکرا ئەبن و هێزو دەسەلاَتی پەروەردگار سەرسامان ئەکات زۆر زۆر لە ئێستا زیاتر ، هەتاکو زانست پێش کەوێ باوەڕ بە پەروەردگارو بە ئیسلام زیاتر ئەبێت ..

ئەوانەی پێشوومان هەندێکیان لە نهێنی یە کانی دوای پەردەیان زانیوە !! هەندێکی تریش لەوانەوە فێر بوون و دووربین بوون هەروەکو زانای بەناوبانگ مستر براون Mrs. Browning ئەڵێ : ئاسمان زەوی بەهەموو کێشی‌یەوە گرتووەتەوە هەموو ووردەکاریەکی هەرچەند سادە بێت ڕووناك ئەبێتەوە بە زکری پەروەردگار بەلاَم ئەوەی ئەیبینێ ئەوەیە کە نەعلەکانی داکەنێ[1] (ص١٤٠– الحیاة بعد الموت) .

---

[1] ئەمە فەلسەفەیکی نادروستەو سەرچاوە لە فەلسەفەکەی (ابن القسی) و(ابن سبعین)ەوە دەگرێت، گوایە بەحسابی خۆیان دەتوانین بەمەشقی ڕۆحی بگەنە پلەی پێغەمبەرایەتی و خوا وەك حەزرەتی موسای کەلیموڵلاَ قسەیان لەگەڵدا بکات، کەدیارە ئەوە هەم درۆیەو هەم ناشەرعیەو هەم سەرگەردانیەکی تێبینیشە، چونکە پێغەمبەرایەتی شتێکی

## ژیان بەردەوامە دوای مردن

زانستی فیزیاو زانستی ڕۆحی هەردووکیان بەرەو یەکبوون ئەڕۆن و پێویستیان بە یەکتر هەیە بۆ تێگەیشتنی تەواو لە مادەی فیزیاوی و مادەی ئەثیری ، هەردوو زانست بە تاقی کردنەوەو پەسەند کردنی بەڵگەی ڕاستی سەلماندویانە کە لەدوای جیهانی مادی ئێمەوە حەوت جیهانی ئەثیری هەیە.

پاش مردنیش ژیان بەردەوامە چونکە لەشی فیزیاوی ئەمرێ بەلاّم ڕۆح هەرگیز نامرێ ، کەوابوو بە مردن ژیان کۆتایی نایەت ، جیهانی ئەثیری دەمێکە زانراوە ، لە پێش زانستی ڕۆحی یان ئەثیری یەوە هەندێ کەس کە مرۆڤی ئاسایی نەبوون بەڵکو هەستی بینین یان بیستنیان بەرزتربووە کەوابوو (نەبینراویان بینیوەو نەبیستراویان بیستووە) .

لەبەر ئەوە زانایان ئەزانن کە ڕۆح و جیهانی ڕۆحی هەیەو ئەثیر هەیە هەروەکو باسمان کرد :

(لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا زۆر دەمێکە ئەو ڕاستی‌یە باس کراوە ئەویش ئەوەیە کە ڕۆح جیایە لە لەش )

باسی ژیانی دوای مردن ئەکات و لێپرسینەوەی ڕۆژی دوایی هەروەها لێرەدا کەمێکی تر باسی جەنگی بەدر ئەکەین هەروەکو قسەکردنی پێغەمبەرمان محمد(د.خ) لەگەڵ کوژراوەکانی قورەیشدا باس کرد .

کاتێ پێغەمبەرمان محمد(د.خ) سوپای موسوڵمانانی ڕێك ئەخست و ئامادەی ئەکرد ، تەماشای کرد سوپای قوڕەیش زۆر زۆرترە لە سوپاکەی هەروەها چەکیشیان زۆرتر بوو ئەم هێزەی موسڵمانان زۆر زۆر کەمترەو نابەرامبەرە ، لەبەر ئەوە ترسی لێ نیشت و لەگەڵ ابوبکر گەڕایەوە بۆ (عریش) چونکە لەوە ئەترسا موسڵمانان سەرنەکەون .

---

(کسبی) نیە بەهەوڵدان مرۆڤ پێی ناگات، بەڵکو هەڵبژاردنی خوداییەو پاش هاتنی حەزرەتی محمدیش ئەو دەرگایە داخراوە وەك خوای گەورە دەفەرموێ (وخاتم النبین) و پێغەمبەریش (ص) دەفەرموێ (الانبی بعدی) ..

لێرەدا پێشەوای ئیسلام ڕووی کردە قیبلە (کەعبە) بەهەموو توانای ڕۆحی ولەشی‌یەوە دەستی بەرز کردەوە وە هانای بردە بەر پەروەردگارو دوعای ئەکرد کە موسڵمانان سەرکەون هەروەکو پەروەردگار بەڵێنی پێ داوە ، زۆر زۆر ئەپاڕایەوەو تەوبەی ئەکرد و ئەو پاڕانەوانەش بەم جۆرە بوو:

(اللّهُمَ هذهِ قُرَيش قدْ أتت بخَيلائها تُحاوِلُ أنْ تَكذِبَ رَسولَكَ ، اللّهُمَ فَنَصرُكَ الذى وَعَدتَني اللّهمَ أَن تُهلِكَ هذهِ العَصابَة اليَومَ لا تعبد) .

بەم جۆرە زۆر پاڕایەوەو دەستی بەرز کردەوە بۆ سەرەوە هەتاکو کەواکەی لەسەر شانی بەربوویەوە ، ئەبوبەکر لە دوایەوە دایەوە بەسەر شانی‌داو فەرمووی : (یانبیَّ الله ، بعض مُناشدَتِكَ ربك فإنَ الله مُنجز لك ما وَعَدَكَ ) بەلاّم محمد(د.خ) بەردەوام بوو لە دوعاکردن و پاڕانەوە چونکە سوپای موسڵمانان کەم بوو لە ژمارەداو خۆیان ئامادەنەکردبوو بۆ شەڕ .

بەردەوام ئەپاڕایەوە هەتاکو وای لێ هات باوێشکی ئەدا وەکو خەوی بێت ، لەپڕدا چاوی کەوت بە سەرکەوتنی موسڵمانان و مژدەی دا بە خەڵکی موسڵمان و فەرمووی (وَالذى نَفسُ مُحمَد بيَدهِ لا يُقاتِلَهُم اليَومَ رَجُل فَيقتَل صابِراً مُحتَسِباً مُقبلاً غير مدبر إلا أدخله الله الجنة) کەوابوو لەو باوێشکەداو لەو ماوە کەمەدا پێغەمبەرمان محمد(د.خ) پەیوەندی کردووە بە جیهانی ڕۆحی پیرۆزەوە (العالم الروحي القدسي) پەروەردگاریش بەهۆی ڕۆحە پاکەکان و مەلائکەوە پەیمانی سەرکەوتنی پێ‌داوە ، ئێستا با تەماشا بکەین و بزانین هیکل پاشا چی ئەڵێ دەربارەی شەڕەکە واتە جەنگی بەدری گەورە ..

ئەڵێ :حمزەو علی پاڵەوانی ئیسلام بوون شەڕیان ئەکرد بە باوەڕێکەوە شەڕیان ئەکرد هەریەکەیان خۆی لەبیر چوبویەوە زۆری سوپای کوفریان لەبیرچووبوویەوە وەکەمی سوپای خۆیان بەبیردا نەئەهات ، هەوا پڕ بوو بوو لە تەپ و تۆز ، سەری سوپای قوڕەیش هەڵئەوەرینە گۆڕەپانی شەڕەکەوە ، موسڵمانان زیاتر باوەڕیان بەهێز ئەبوو هاواریان ئەکرد (احد-احد-احد) واتە یەکە پەروەردگار یەکە.

ئەوەندە باوەڕیان بەهێز بوو بوو چووبونە جیهانی ڕۆحی‌یەوە پەردەی شوێن وکاتیان نەمابوو ، مەلائکە مژدەی سەرکەوتنی ئەدانیٚ ودەست خۆشی لیٚ ئەکردن ، ئەوانیش بە جۆرێك شمشێریان ئەوەشاند لەیەك لێداندا چەندەها سەر ئەپەڕی و موسڵمانان وایان هەست ئەکرد دەستیان بە هێزی پەروەردگار بەرز ئەکرێتەوە ئەو هەموو کوشتارە ئەکەن لە سوپای کوفر .

پێغەمبەری پێشەوامان (د.خ) لە ناوەڕاستی ئەم شەڕە گەرمەدا وەستا بوو ، مەلائکەی گیان کێشان لەویٚ وەستا بوون زۆر بە خێرایی گیانی کافرەکانیان ئەکێشا ، بەم جۆرە هێشتا سوپای کوفر زۆر زۆرتر بوو لەسوپای موسڵمانان ئەوەی ئەکوژرا ئەکوژرا ، ئەوەی ئەومایەوە بەدیل ئەگیرا .

کەوابوو داواکاری پێغەمبەرمان محمد(د.خ) لە پەروەردگار بەهاتنی وەحی لە جیهانی ڕۆحی یەوە و مژدەی سەرکەوتن و بەرزبوونەوەی وورەی موسڵمانان هەمووی بە پەنابردن بوو بۆ پەروەردگار .

بەرزبوونەوەی وورەی ڕۆحی و یارمەتی دانی موسڵمانان لەلایەن ئەو ڕۆحانەوە لە جیهانی ڕۆحی یەوە هاتبوون مژدەی سەرکەوتنیان ئەدانیٚ و ئەم دوو ئایەتە پیرۆزە هاتنە خوارەوە :

﴿إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلائِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا الَّذِينَ آمَنُوا سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ فَاضْرِبُوا فَوْقَ الْأَعْنَاقِ وَاضْرِبُوا مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ﴾ (الأنفال:١٢)

﴿فَلَمْ تَقْتُلُوهُمْ وَلَكِنَّ اللَّهَ قَتَلَهُمْ وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ رَمَى وَلِيُبْلِيَ الْمُؤْمِنِينَ مِنْهُ بَلاءً حَسَناً إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ (الأنفال:١٧)

ئا بەم جۆرەیە پەنا بردن بۆ جیهانی ڕۆحی پیرۆز بەم جۆرە بۆمان دەرئەکەویٚ ئاینی پیرۆزی ئیسلام لەگەڵ زانستی ڕۆحی و فیزیاوی دا ئەگونجیٚ و هەردوو زانستەکە ڕاستی ڕای ئیسلامی پەسەند ئەکەن و دەری ئەخەن .

زانستی قورئانی پیرۆز فەرموودەی پەروەردگارەو پێشەوای هەموو زانستەکانە و لەهەموویان پیرۆزو بەرزترو ڕاسترە.

زانایانی رۆحی و زانایانی مادی ئەو راستی یە ئەڵێن کەهێزێکی گەورەو زۆر زۆر دوورو نهێنی و بەدەسەلأت هەیەو ئەم گەردوونە بەم شێوە ڕێك و پێکەی ئەبا بەڕێوەو ئێمە هەستی پیَ ناکەین ئێمەیش ئەڵێین ئەوهێزە پەروەردگارەو نەك تەنها بەڕێوەبەری گەردوونە بەڵکو دروست کەری گەردوون و بوون و بوونەوەرە.

زانستی گەردوون ناسی و زانستی فیزیا هەردووکیان باسی راستی یەکانیان و یاساکانیان ئەکەن بۆمان کەبەهەردووکیانەوە زانستێکیان پێك هێناوە پیَ ی ئەڵێن: زانستی (فیزیا فەلەکی) یان (فیزیا گەردوونی) ئایا باسی ((سبع سماوات طباقاً)) ئەکەن بۆمان؟ هەروەکوو پەروەردگار لەقورئانی پیرۆزدا باسی کردووە!

گومانی تێدا نی یە لەسەر ئەستێرەکان و مانگەکان و خۆرەکان هیچ ئاسمانێك دەرناکەویَ کە بەدووربین یان تلسکۆب تەماشای بکەین هەرچەندە پێش کەوتووبێت.

ئەگەر پێش کەوتنی زانستی فیزیاوی لەلایەکەوە و دەرکەوتن و دۆزینەوەی نویَ لەزانستی رۆحی نویَ لەلایەکی ترەوە نەبووایە ئەقڵی زانستی نەی ئەتوانی لەحەوت ئاسمانەکان تیَ بگات تێگەیشتنێکی زانستی یانەی راستەقینە کەبەسەلماندنی ڕاست و دروست بێت بەم جۆرەی خوارەوە هەروەکوو باسمان کرد؟ جیهانی ئەثیری لەزۆر دەمێکەوە زانراوە بەتایبەتی لەوانەوە کەڕاستی بینین و بیستنی خۆیان ئاشکراکرد کەلەتوانای مرۆڤی ئاسایی دا نی یە.

واتە چەندەها جار ئەو دووهەستەیان لەئادەمیزادی ئاسایی بەهێزترە، شتی زۆر زۆر دوور کەلەئێمەوە دیارنی یە و نابینریَ ئەوان ئەیبینن و زۆر زۆر دووریش ئێمە هەرگیز گوێمان لیَ ی نی یە ئەوان ئەیبیستن.

پاشان ئادەمیزاد دڵنیابوو لەڕاست بێژی ئەمانە بەهۆی قسەکردنیان لەگەڵ رۆحەکان دا لەجیهانی ئەثیری رۆحی دا.

دواتریش وێنەگرتن و نووسینەوەو دەرخستنی تەواوی رۆحەکان واتە نواندنیان دوای ماوەیەك بەسەرچوون بەسەر ئەو گواستنەوەیەدا کە پیَ ی ئەڵێن مردن لە شێوەی راستەقینەی پێش مردنیاندا.

وێنەگرتنەوەی ڕۆحەکان زۆرجار لەژوورەکانی ئامادەکردنی ڕۆحەکاندا ئەبێت و وێنەی زۆر لەوڕۆحانەی دەمێك بووە مردوون گیراوەتەوە دەقاو دەقی وێنەکانی خۆیان بووە پێش مردنیان!!!.

آ) وێنەی ڕۆح بەبێ ناوەند ناگیرێتەوە، واتە ئەبێ کەسێك ئامادەبێت ناوەندبێت لەنێوان جیهانی فیزیاوی و جیهانی ئەثیری ڕۆحەکاندا کەمادەی ئەکتۆپلازمی لەشی زۆرتربێت لەمرۆڤی ئاسایی.

ب) بەڵام نووسین و ئیمزا کردن لەسەر کاغەزێك لەلایەن ڕۆحەکانەوە پێش مردنیان چۆن بووە بەهۆی ناوەندەوە داوایان لێکراوەتەوە ئەو نووسینە بەخەتی خۆیان و بەئیمزای خۆیان بنووسنەوە.

بێ گومان نووسیویانەتەوەو بەئیمزای خۆیان ئیمزایان کردووە بەراوردکراوە وەکوو یەك وابوون.

ج) دەرکەوتنی تەواو ئەو ڕۆحە هەروەکو پێش مردنی دەرئەکەوێ و خەڵك ئەیبینێ و لەبەشەکانی داهاتوودا ئەم سێ جۆرە چالاکی یە ڕۆحیانە باس ئەکەین.

ئەمانە هەمووی بەڵگەی ڕاست و دروستن کەژیان دوای مردنیش بەردەوامە (مردن تەنها گۆڕانێکە لەژیانێکەوە فیزیاوی یەو گرانە بۆ ژیانێکی ئەثیری ئاسان کە ((ئەگەر پاك بێت)) و خواپەرست بێت.

ئەوەی لە تەڵقینی مردوودا ئەووترێ پڕ بە پڕی خۆی ڕاستە هەروەکوو :

خَرَجْتَ مِنْ دار الْدُنيا وَوَصَلْتَ إلى دار الْعُقبَى

خَرَجْتَ مِنْ دار الْفناءْ وَوَصَلْتَ إلى دار الْبقاءْ

خَرَجْتَ مِنْ دار الْغرور وَوَصَلْتَ إلى دار الْسرور

خَرَجْتَ مِنْ دار الْمحنة وَوَصَلْتَ إلى دار الْرَّحْمة

خَرَجْتَ مِنْ دار الْفانية وَوَصَلْتَ إلى دار الأبدية الْباقية

هتد هەروەکوو باسمان کرد.

لێرەدا باسی دوو ڕووداو ئەکەم کەلەکتێبی ((صخرة الحق)) دانەری .ج. أ أرثر فندلای هاتووەو ئەڵێ:

( ڕووداوی یەکەم ) :

بێوەژنێك کەپێشتر خێزانی: (سێرڤینسینت کیلارد بوو **Vincent Caillard**) ئەم بێوەژنە چووەتە هۆدەیەکەوە لەهۆدەکانی ئامادەکردنی رۆحەکان ((لەبەشەکانی داهاتوودا باسی ئەم هۆدانە ئەکەین))

یەکێ لەئامادەبووان پێ ی ئەڵێ: مێردەکەت لەتەنیشتت وەستاوە!!! بێوەژنەکە تەماشا ئەکا راستەو مێردەکەی کەدەمێکە مردووە بەزیندوویی لەتەنیشتیەوە راوەستاوەو بەهۆی ئامێرە ئەثیری یەکەی ناو هۆدەکەوە نامەیەکی بۆ نووسیوە پاش سلام و هەواڵ پرسین هەندێ شتی نهێنی باس کردووە تەنها خۆی و ژنەکەی ئاگادارن و نهێنی نێوان هەردووکیان بووە خەتەکەی و ئیمزاکەی وەکوو خەت و ئیمزای پێشووی کەزیندووبووە لەجیهانی فیزیاوی دا وابووە لەپڕێکدا ئەم رۆحە هۆدەی ئامادەکردن بەجێ ئەهێڵێ!!.

لە دانیشتنی داهاتووداو لەهەمان هۆدەی ئامادەکردن ئەم بێوەژنە ئامادە ئەبێت و مێردەکەی بانگی ئەکات بەناوێك کەتەنها خۆیان ئەزانن و ناوێکی نهێنی بووە. ئەمیش وەلامی ئەداتەوە و ئەڵێ چیت ئەوێ؟

((ئەڵێ هاتووم خۆم دەرخەم بۆتان ئەگەر بتووانم!!!!))

پاش ماوەیەکی زۆر کەم لەبەردەم ژنەکەی دا ڕائەوەستێ و دەرئەکەوێ و بەئاسانی یەکتر ئەبینن، دەست ئەخەنە ناودەستی یەکترەوە هەواڵی یەکتر ئەپرسن پاشان وورده وورده پیاوەکە دەستی ژنەکەی بەرئەدات و دەستی بەرزئەکاتەوەو ئەڵێ لەیادی ساڵڕۆژی مردنی دا ئەگەڕێتەوە بۆلایان پاشان پرسیارمان کرد لەو بێ وەژنە و رای گەیاند بەڵێ لەیادی ساڵرۆژی مردنیدا هاتەوە ناومان ژمارەمان دەکەس بووین بەهەمان شێوەی پێش مردنی و پرسیارمان کرد بۆچی ئەو مردووانەی تریش ناگەڕێنەوە، وەلامی داینەوە لەجیهانی رۆحی و ئەثیری دا هەروەکوو جیهانی فیزیاوی هەندێ کەس ئەکتۆپلازمی زۆرە توانای بەرزبوونەوەو قسەکردنی هەیە لەگەڵ رۆحەکانی جیهانی ئەثیری دا بەهەمان شێوە لەجیهانی ئەثیری دا بەدەگمەن رۆح هەیە ئەم توانایەی هەبێت وەکوو من.

**ئەم رۆحە لەم دەرکەوتنەیشدا باسی شتی زۆر نهێنی ئەکات بۆ ئامادەبووان و هەموویان دڵنیا ئەبن کەخۆیەتی و لێرەدا بێوەژنەکە بەئامادەبووانی ووت دڵنیام ئەمە مێردەکەمە.**

**پاش ماوەیەکی کەم دیسانەوە وورده وورده دوورئەکەوێتەوەو بەرەو جیهانی ئەثیری رۆحی ئەکەوێتە ڕێ و لەبەرچاو گوم ئەبێت.**

**زانای رۆحی فندلای ئەڵێ: ئەم رووداوەم زۆر بەلاوە سەیربوو چونکە بێجگە لەوێنەو دەنگ و ڕەنگی بەتەواوی خۆی دەرخستەوە هەروەکوو پێش مردنی.**

**لێرەدا بابزانین کافرەکان بەپێغەمبەریان محمد(ﷺ) ئەووت**

**﴿ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلاً وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَنْ يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ ﴾ (يّس:٧٨) کێ ئێسقانی رزیو زیندووئەکاتەوە**

**پەروەرگار ئەیفەرموو بڵێ:**

**﴿ قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنْشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ﴾ (يّس:٧٩)**

**ئەوە زیندووی ئەکاتەوە یەکەم جار دروستی کرد!!!.**

**ئیتر ئەم کابرایە کەهاتووەتەوە ناو خێزانەکەی لەگۆڕەکەیدا ئێسقانەکانی لەژێر خاك دا بوون کەچی ئەوەتا هاتوەتەوە لەجیهانی رۆحی یەوە ئەمەش بەفەرمانی پەروەردگارە.**

**لێرەدا پرسیار ئەکەین لەخوانەناسەکان ئایا ئەمە ئاماژە نی یە بۆ زیندووکردنەوە ئایا ئەمە بەردەوامی ناگەیەنێت بۆ ژیان دوای مردن؟ بۆ لێ پرسینەوە لە جیهانی ((بەرزەخ)) و لەجیهانی کۆتایی (یوم القیامة)دا ئایا ئەمە راستی قورئان و ئاینی ئیسلام ناگەیەنێت؟؟**

**بەڵگەی زۆرتریش هەن لەم بابەتانە هەندێکیان لەداهاتوودا باسی ئەکەین.**

( ڕووداوی دووەم ) :

زانای رۆحی بەناوبانگ قەشە ((تۆیدیل)) لەساڵی ١٩٤٤کۆچی دوایی ئەکات لەجیهانی فیزیاوی بۆ جیهانی ئەثیری و رۆحی، پاش ٣٦ سی وشەش سەعات لەماڵی خۆیان دەرئەکەوێ و ژن و کچەکەی چاویان پێ ئەکەوێ!!!.

پاش ماوەیەکی تر کاتێ کۆمەڵەی لیدز لەهۆڵی فەلسەفە کۆبوونەوەیەك ئەکەن دەربارەی جیهانی رۆح دیسانەوە ئەم قەشەیە دەرئەکەوێ و لەهۆڵەکەدا لەپشتی سەرۆکی کۆبوونەوەکەوە (جۆن أسکلي) ئەوەستێ و دەست ئەخاتە سەرشانی و قسەیان بۆئەکات و ئەڵێ:

((دڵنیابن ژیان دوای مردن بەردەوامە))

لێرەدا کۆتایی بەم دوو ڕووداوە هات و لەباس کردنی هۆدەکانی ئامادەکردنی رۆحەکاندا چەند رووداوێکی تر باس ئەکەین...

# (جیهانی ئەثیریو زانستی نویٚ)

**زانستی نویٚ ی فیزیاوی ئەلیٚ:**

ئەگەر بمانەویٚ بەئاشکرا دەوروبەری خۆمان ببینن پێویستمان بەپێنج شت هەیە کەئەمانەن:

١-ئەقلٚ: دروست کەری وێنەکانە.

٢-مێشك: مادەیەکی فیزیاوی و ئەثیری یە ئەقلٚ لەناویا کارئەکات.

٣-چاو:دەرگای چوونەژوورەوەی وێنەکانە بۆ مێشك کەبارەگای دروست کردنی وێنەکانە

٤-مادەی لەرینەوە، کەوێنە ئەقلّی یەکانی لیٚ دروست ئەبێت.

٥-ڕووناکی: بەهۆیەوە مادە ئەبینریٚو ئەم ڕووناکی یە ئەدا لەچاو، لەوێوە بۆ مێشك و پاشان بۆئەقلٚ.

ئەگەر ئەو پێنج شتەی سەرەوەمان هەبوو ئەوە بەڕاستی دەوروبەری خۆمان ئەبینین.کەوابوو پێویستی بینین لەسەر زەوی گرنگە چونکە پێش ئەوەی هەست پیٚکراوەکان ببینین(واتە جیهانی مادیو فیزیاوی) ناتوانین جیهانی ئەثیری ببینین.

بڕوانە وێنەی ژمارە (٢٣) بەم جۆرە ئەبینین

ئەم وێنەیە لەکتێبی (الكون المنشور) دانەری أرثرفندلای وەرگیراوە




**هەروەها بڕوانە وێنەی ژمارە (٢٤)**

بازنە گەورەکە خۆرەو بازنە بچووکەکە زەوی یە هەرچەندە بەوێنە شێوە ڕاستی یەکەمان بۆ دەرناخریٚ چونکە خۆر لەسەد ملیۆن جار زیاتر لەزەوی گەورەترەو دووری نێوانیان ٩٣ نەوەدوسیٚ ملیۆن میلە بەگوێرەی  زانستی نویٚ.

بەردەوام خۆر شەپۆلی ڕووناکی ئەدات و خێرایی ئەم شەپۆلانە لەچرکەیەکدا ١٨٦,٠٠٠سەدوهەشتا هەزار میلە کەوابوو: ٤٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠ چوارسەد هەزار ملیۆن شەپۆلی درێژ بەیەك خاڵ دا ئەڕوا لەچرکەیەکداو ٧٥٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠حەوت سەدو پەنجا هەزار ملیۆن شەپۆلی کورت بەیەك خاڵ دا ئەڕوات لەچرکەیەکدا.

هەروەها ئەم شەپۆلانە بەهەموو لایەکدا بڵاوئەبنەوەو بەشێکی کەمیان بەرزەوی ئەکەون، ئەم شەپۆلانە ٣٤,٠٠٠ سی وچوار هەزار تاکوو ٦٤,٠٠٠ شەست و چوارهەزار یان رووبەری یەك مەتر دووجا ئەگرنەوە ( ١م٢).

هەوەکوو باسمان کرد مادده لەگەرد پێك هاتووەو گەرد ئەلەکترۆنات و پرۆتۆناتی تێدایە.

پرۆتۆن کێشی گەردەو ئەلەکترۆن جەوهەری گەردەو رەنگ دیاری ئەکات.

ئێستا باسی ئەلەکترۆنەکان ئەکەین چونکە رەنگ دروست ئەکەن واتە ئەبنەهۆی رەنگی مادده!!! (ص ١٦٩ هەمان سەرچاوە)

بەگوێرەی خێرایی و هێواشی سووڕانەوەیان.

ئەلەکترۆنەکان لەگەردی مادەکان دا ئەسووڕێنەوە بەخێرایی یەکی جیاواز

ئەلەکترۆنەکان بەخێرایی سووڕانەوەیان شەپۆلە کورتەکانی رووناکی ئەگەڕێننەوە بۆمان ئەو رووناکیانە پێ یان ئەڵێن رەنگی وەنەوشەیی ، ئەلەکترۆنەکان بەسووڕانەوەیان بەخێرایی یەکی هێواش تر شەپۆلەکانی رووناکی ئەگەڕێننەوە بۆمان پێ ی ئەڵێن رەنگی سوور. لەنێوان ئەم دووخولگەی ئەلەکترۆنی جیاوازەدا خولگەی تر هەیە رووناکی ئەگەڕێننەوە بۆمان رەنگەکانی ترمان پیشان ئەدەن.

ئەوشەپۆلانەی ڕووئەدات لە ئەلکترۆنەکانی خۆر پێ ی ئەڵێن ڕوناکی، ئەم ڕوناکی یە ئەبێتە هۆی دروست بوونی ڕەنگەکان .کاتێ تیشکی خۆر ئەدات لە خشتێکی سوور ئەو تیشکە ئەگەڕێتەوە بۆمان و ئەدات لە چاومان، لەدەماری دیتنەوە ئەڕوات بۆ مێشك و پاشان ئەقڵ وێنەی سووری خشتەکەمان پیشان ئەدات ، ئینجا ئەتوانین بڵێین ئەو خشتە سوورە کەوابوو ڕەنگی سوور بەکۆمەڵێ جولاّنەوەی تیشك ئەڵێن کەلەمادەوە ئەگەڕێتەوە بۆ لامان .ئەو کۆمەڵە جولاّنەوەی ڕوناکیانە هەریەکە

بەگوێرەی خێرایی تایبەتی خۆی جۆرە ڕەنگێکمان بۆ دەرئەخات . هەموو شەپۆلە ڕووناکیەکانی خۆر بەهەمان ڕێگەی باسمان کرد ڕەنگەکانمان پیشان ئەدەن ، ئەو شەپۆلانەی ڕەنگی سوورمان نیشان ئەدەن درێژترین شەپۆلن هەروەها هێواش ترین شەپۆلن، لە درێژی و خێرایی شەپۆلەکاندا پەیژەی ڕەنگەکان دروست ئەبێت واتە شەپۆلی کورت ترو خێراتر ڕەنگی پرتەقاڵی وپاشان لەو خێراتر زەردو ئینجا سەوزو شین و نیلی وهەروەها وەنەوشەیی ئەم ڕەنگی وەنەوشەیی‌یە خێراترین شەپۆلی ڕووناکی پیشانمان ئەدات .

کەوابوو بۆمان دەرکەوت کۆمەڵێ شەپۆلی ڕووناکی ئەم ڕەنگە سەرەکیانەمان پیشان ئەدات و بەتێکەڵ کردنی هەموویان ڕەنگی سپی و بە تێکەڵەی جۆراوجۆر ڕەنگەکانی ترمان پیشان ئەدات .




وێنەی ژمارە ( ٢٤ ) جهانی گەورەو خۆری گەورە

زانای بەناوبانگ (اسحاق نیوتن) ئەم زانایە بەهۆی ئاوێزەی سێ ڕووەوە لە ژوورێکی تاریکدا تیشکی خۆری تێپەڕ کرد بە ئاوێزەکەداو ڕەنگەکانی جیاکردەوە ڕەنگی سپی لە تێکەڵ بوون و یەکگرتنی هەموو ڕەنگەکانی پەلکە زێڕینە دروست بووەو تیشکە تێکەڵەکان ڕوناکی سپی دەوری خۆر پێك دێنن ، ئەم زانایە توانی ئەم ڕەنگانــــــە جیابکاتــــــــەوە بــــــــەم جـــــــۆرە (ســـــــــوور،پرتەقاڵی، زەرد،سەوز،شین،نیلی،وەنەوشەیی)ئەمانە ڕەنگە سەرەکیەکانن ئەم زانایە وای ئەزانیڕووناکی مادەیەو لە گەردی زۆر بچووك پێك هاتووە بەلاّم زانستی نوێ ئەڵێ جوولاّنەوەیەکی شەپۆلی یە لە ئەثیردا .

بەلاّم زانای بەناوبانگ (ادنجتون) ئەڵێ :لە ڕاستی دا ڕووناکی گەردی زۆر بچووکی تێدایە پێیان ئەڵێن (فۆتۆنات) و هەروەها جوولاّنەوەی شەپۆلیە لەئەثیردا.

واتە ڕووناکی هەردوو حاڵەتەکەیەو دوانەیە.(گەردی مادەو شەپۆل)

کەوابوو بۆئەوەی دەوروبەری خۆمان بەڕاستی ببینین پێویستمان بەتیشکی ڕووناکی، مادە، مێشك، ئەقڵ،هەیە تاکوو ئەو وێنانەو ئەو رەنگانە بەهۆی تیشکی ڕووناکی یەوە ڕووئەدەن بیان بینین.

کەوابوو ژیان ئەوەیە کەهەست بەرەنگەکان بکەین بەلاّم بێجگە لەڕەنگەکان هەستیش بەکێش و رەقی و نەرمی ئەکەین.

چونکە ئەگەر بەئەقڵ تەماشای مادەکان بکەین بێجگە لەڕەنگەکانیان جیایان ئەکەینەوە بەبێ دەست لێ دان بۆ نموونە:

تەماشای بەردێك بکەین بەبێ دەست لێ دان بەرەنگەکەی دا ئەزانین رەقەو قورسە، هەروەها ئەگەر تەماشای گوڵێك بکەین رەنگەکەی ئەزانین و ئەزانین نەرمەو سووکە.

هەروەها بەنزیك کردنەوە ئەتوانین کێشی تەنەکان بزانین

بۆ نموونە ئەڵێین ئەوبەردە چوارکیلۆئەبێت، لەوانەیە یان ڕێك وابێت یان تۆزێ کەم یان تۆزێ زیاتربێت.

ئەمە تەنها بەتەماشاکردن.

بەڵام بەدەست لێ دان توانامان زیاترئەبێت لەدیاریکردنی کێش کەوابوو کاری پڕۆتۆن کەکێشی مادەیە بەدەست لێ دان بۆمان دەرئەکەوێ بەڵام کاری ئەلەکترۆن کەرەنگی مادەیە بەتەماشاکردن بۆمان دەرئەکەوێ.

هەموو گەردەکانی مادە لەئەلەکترۆن و پڕۆتۆن پێك هاتوون لەبەرئەوە کێشی مادده پرۆتۆن دیاری ئەکات چونکە کێشی یەك پرۆتۆن بەرامبەرە بەکێشی ١٨٤٠ هەزارو هەشت سەدوچل ئەلەکترۆن.

گەردی هیدرۆجین یەك پڕۆتۆنی تێدایە بەڵام گەردێکی هیلیۆم چوار پڕۆتۆنی تێدایەو ئۆکسجین شانزەو بەم جۆرە تاقورسترین گەرد کە یۆرانیۆمە ٢٣٨پڕۆتۆنی تێدایە، ئەلەکترۆن و پڕۆتۆن دووبارگەی کارەبایی جیاوازن ئەلەکترۆن بارگەی ساردە (−) و پڕۆتۆن بارگەی گەرمە (+).

کەوابوو چۆن بەهۆی ئەلەکترۆنەکانەوە رەنگەکان ئەبینین بەهۆی پڕۆتۆنەکانەوە کێشی مادەکان ئەزانین. بەبێدەست لێدان قورسی و سووکیان ئەزانین.

لەراستی دا بینین و دەست لێ دان دووشتی پێویستن بۆزانین و هەست کردن بەلەرینەوەی ئەلەکترۆن و پرۆتۆن لەئەثیرداو بەبوونی ئەلەکترۆن و پڕۆتۆن لە لەشمان دا.

لەبەرئەوەی ئەقڵمان هەیە توانامان هەیە هەست بەو لەرینەوانەبکەین، ئەگەر ئەقڵ نەبێت هەست بەهیچ ناکەین.

کەوابوو زانیمان بۆچی هەست بەبوونمان ئەکەین لەسەرزەوی ئەویش بەهۆی ئەقڵەوەیە.

ئەقڵیش دوورە لەمادەی فیزیاویەوە لەبەرئەوە هاوکاری هەردوولا یارمەتیمان ئەدات بۆئەوەی هەست بەبوونمان بکەین لەسەر زەوی. تاکوو کاتی گواستنەوەمان دێت لەسەر زەوی کەپێی ئەڵێین(مردن) بۆ جیهانی نوێ کەجیهانی ئەثیری یە و مادە نامێنێت کەفیزیاوی بێت و هەمووشتێك ئەثیری یە و جیهانی (بەرزەخە) و ئامادەبوونە

بۆجیهـانی هـەتا هـەتایی و لێ پرسـینەوەو جیاکردنـەوەی چـاك و خـراپ لەلایـەن پەروەردگارەوە.

کەوابوو ئێمە لەمادەیەکی فیزیاوی‌یەوە ئەگۆڕێین بۆ مادەیەکی ئەثیری ، چونکە لەشمان دووانەیە، لەشێکی مادی فیزیاوی‌و لەناویا لەشێکی ئەثیری یە.

ئەم دوولەشە (ئەثیری و فیزیاوی)ە کەلەیەك ئادەمیزاددایە هەردووکیان شەپۆلی رووناکیان هەیەو لەرینەوەیان هەیە

بەلاّم مادە فیزیاوی‌یەکە لەرینەوەی شەپۆلە رووناکی‌یەکەی هێواش ترە لە لەرینەوەی شەپۆلە رووناکی یە ئەثیری یەکە.

واتە لەرینەوەی شەپۆلی رووناکی ئەثیری زۆر خێراترە لە لەرینەوەی شەپۆلی رووناکی فیزیاوی.

خێراترین شەپۆلی رووناکی فیزیاوی سەرووی وەنەوشەیی یە.

بەلاّم خێرایی شەپۆلی رووناکی ئەثیری زۆر زۆر زۆرترە.

هەرلەبەر ئەم خێرایی یە زۆرەیە ئەو شەپۆلە رووناکی یە ئەثیریانە نابینرێن و هەستیان پێ ناکرێ.

لەبەرئەوە زۆر راستە ئەگەر بڵێین مادەیەکی تر یان جیهانێکی تر هەیە بێجگە لەم جیهانەو لەم مادەیەی هەستی پێ ئەکەین، ئەوجیهانە ئەثیری‌یەو نابینرێ و هەستی پێ ناکرێ لەو جیهانە ئەثیری یەدا ئەقڵ و رۆح ئەثیرین و لەلەشێکی ئەثیریدان. ئێستا پرسیارئەکەین و ئەڵێین:

((ئایا بەمردن چی بزرئەکەین یان چی گوم ئەکەین؟))

ئەگەر نەزانێك وەلاّم بداتەوە ئەڵێ: گیان (یان رۆح) یان ئەقڵ لەگەڵ ئەوەشا ئەوەی گومی ناکەین گیان و رۆح و ئەقڵە!!!.

بەمردن تەنها بەرگێکی فیزیاوی یان لەشێکی فیزیاوی لەکارئەکەوێ و ئەخرێتە ناو گڵەوەو ئەبێتەوە بەگڵ هەروەکوو یەکەم جار لەگڵ دروست کراوە.

دوای ئەو کۆچ کردنەی پێ ی ئەڵێین((مردن)) ئەقڵ و رۆح ئەمێنن و ژیان لەجیهانی ئەثیری بەردەوام ئەبێت.

لەم جیهانەدا کە ئەثیری یە و ئەقڵ و رۆحی ئەثیری ئەڕۆنە ئەویٚ کەم ئەندام نی یە چونکە لەشی فیزیاوی هەرچی ئەندامیٚکی کەم بووبیٚت لەشی ئەثیری هیچی لیٚکەم نابیٚتەوەو پەروەردگار چۆنی دروست کردووە هەروا ئەمیٚنیٚتەوەو لەجیهانی ئەثیری نابیناکانیش چاوە ئەثیری یەکانیان ئەبینن.

چونکە تەنها لەلەشی فیزیاویان دا چاوی فیزیاویان نابینابووە.

ئەقڵ لەمیٚشکی ئەثیری دا کاری خۆی ئەکات کەوابوو لەشی ئەثیری قاڵبیٚکی تەواوی لەشی فیزیاوی یە و هەموو ئەندامەکانی لەشی فیزیاوی هاوشیٚوەیان هەیە لەلەشی ئەثیری و لەجیهانی ئەثیری دا.

مادەکەیان هەروەکوو مادەکەمان وایەو بریتی یە لەلەرینەوەو ناسک ترە.

رووناکیان بریتی‌یە لەلەرینەوە بەلاٚم زۆر رووناك ترە بۆیە لەرینەوەیان زۆر زۆر خیٚراترە لەلەرینەوەمان.

هەرلەبەرئەوەیە ئیٚمە هەستیان پیٚ ناکەین و جیهانی ئەثیری نابینین.

ئەثیری‌یەکان هەندیٚکیان ئەقڵیان بەرزترەو توانای زۆرشتیان هەیە لەوانی‌تر. هەروەکوو لەجیهانی فیزیاوی دا هەندیٚ ئادەمیزاد توانای جیاکردنەوەی لەشی فیزیاوی و ئەثیری خۆی هەیە.

وەکوو کۆمەڵەی (یۆگا) yogis .

لەجیهانی ئەثیری دا هەندیٚکیان ئەم توانایەیان هەیەو زۆر زۆریش ئەم جۆرە رۆحە ئەثیری یانە ئەتوانن زۆر زۆر بەخیٚرایی لەشویٚنیٚکەوە بڕۆن بۆ شویٚنیٚکی تر بەئاسانی و بیٚ ماندووبوون.

بەپیٚچەوانەی ئیٚمەوە کەلەگواستنەوەمان دا زۆر ماندووئەبین.

رۆحەکانی جیهانی ئەثیری ئارەزووەکانیان تەنها بەبیرکردنەوە دیٚتەدی.

کەوابوو ئەثیری یەکان هەموویان لەیەك پلەدانین و پلەبەرزەکان پیٚغەمبەران و پیاوچاك و زانا بەرزەکانی پیٚشتر وتمان. لەئاسمانە ئەثیری یەکاندان.

جیهانی ئەثیری حەوت جیهانن و حەوت ئاسمانیان هەیەو وەکوو تۆپێك لەناو حەوت بەرگ دابێت.

ئەم حەوت جیهانە دەورەی زەوییان داوە بەم شێوەیە:

**بڕوانە وێنەی ژمارە ( ٢٥ )**

کاتێ گەردوون کۆتایی هات خۆریش ئەتەقێتەوە ئەبێت بەجیهانێکی تری ئەثیری و جیهانە ئەثیری یەکان ئەبن بەهەشت و هەشت ئاسمانی ئەثیری یان ئەبێت و عەرشیان لەسەرە هەروەکوو پەروەردگار ئەفەرمێ:

﴿وَالْمَلَكُ عَلَى أَرْجَائِهَا وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَانِيَةٌ﴾ (الحاقة: ١٧)

لەوەئەچێ کوردەواریش ناوی بەهەشتی لەمەوە وەرگرتبێت.

بەم جۆرە بۆمان دەرئەکەوێ چۆن خۆر رووناکی وگەرمی ئەدات بەزەوی هەربەوجۆرەیش خۆرە ئەثیری یەکان رووناکی و گەرمی ئەدەن بەجیهانە ئەثیریەکان.

لەئاینی پیرۆزی ئیسلام دا ئەم جیهانە ئەثیری یانە بە (بەرزەخ) ناوبراون.

لەزانستی رۆحیدا جیهانی ئەثیری بەجیهانی سەرەوە یان جیهانی ئەستێرەیی ناودەبرێ astral

لەجیهانی ئەثیری دا گەردی مادەی ئەثیری هەیەو بەرامبەری گەردی مادەی فیزیاوی یە و ئەلەکترۆن و پرۆتۆنی فیزیاوی بەرامبەرەکەیان هەیە لەجیهانی ئەثیری دا لەناو گەردە ئەثیری یەکاندا زانایانی رۆحی و جیهانی ئەثیری ئەڵێن:

٣ئاسمان ٣جیهانی ئەثیری یەکەم و دووەم سێیەم گەرما و رووناکیان تایبەتەو لەگەڵ ئاسمانە ئەثیری یەکان و جیهانە ئەثیری یەکانی سەرەوە جیاوازە، واتە ئەو چوارجیهانە ئەثیرییەی سەرەوە رووناکی و گەرما و کەشیان زۆر باشترەو خۆشترە.

لێرەدا ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ ئەو جیهانە بەرزانە جێگەی پیاوە زۆر زۆر چاکەکان بن واتە چاکەکاران و پێغەمبەران و زانایانی پاکی موسڵمانان و زانایانی بەرزی زانستی کەخزمەتی مرۆڤایەتیان کردبێت و بەئایین و دەستوری خوا ڕازیبووبن.

لەجیهانی ئەثیری دا شەونی یە وەك شەوی جیهانی فیزیاوی ئێمە، لەجیهانی ئەثیری‌دا ترس نی یە، ئیش کردن و ماندووبوون نی‌یە هەموو شتێك بەبیرکردنەوە ئامادەئەبێت.

لەجیهانی ئەثیری دا یاسا تەنها یاسای پەروەردگارەو لادان نی یە زوڵم و زۆرداری نی‌یە هەژاری و دەوڵەمەندی نی یە، تەنها ئەوانەی زیاتر خواپەرستیان کردووە زیاتر لەسەرەوەن و تواناییان زیاترە.

بەڵام رۆحە خراپەکان لەمەینەت و سزایەکی خراپ دان لەشوێنێکی تایبەتی جیهانی ئەثیری داو ئازاریان زۆرە.

رەنگەکان لەجیهانە ئەثیری یەکان دا جوان ترن، چونکە لەرینەوە لەویَ زۆرترەو خێراترە، هەرلەبەر ئەمەیە دیمەن و جوانی ئەو جیهانە ئەثیری یانە زۆر زۆر لەدیمەن و جوانی جیهانی فیزیاوی جوانترو باشترە.

ئەم زانیاریانە لەزانا رۆحی یەکانەوە دەست کەوتووە کەقسەیان لەگەڵ رۆحەکان کردووە لەجیهانە ئەثیری یەکاندا.



وێنەی ژمارە (٢٥) حەوت جیهانی ئەثیری بەدەوری زەویدا

**زانای رۆحی (ج / آرثر فندلای) دەڵێ:**

لەجیهانی ئەثیری دا ژیان بۆئەوانەی لەسەر زەوی چاك بوون و ڕێگەی راستیان گرتووەو سوودیان بۆ مرۆڤایەتی هەبووە، واتە پیاوچاك بوون، جێگەیان زۆر زۆرخۆشە، بەڵام خراپەكارانی سەرزەوی لەجیهانی ئەثیری دا لەدۆڵ و چاڵایی قووڵ و تاریكدان و جێگەیان خراپە، رۆحە خراپەكان ئەڕۆنەلای رۆحە خراپەكان و رۆحەچاكەكانیش بەرەو رۆحەچاكەكان ئەكەونەڕێ و پێكەوە شادئەبنەوە.

كەوابوو جیهانی ئەثیری بەهەشتە بۆ رۆحە چاكەكان و دۆزەخە بۆ رۆحە خراپەكان.

كات لەجیهانی ئەثیری دا وەكوو كاتی جیهانی فیزیاوی ئێمە نی یە كەشەوو رۆژو سەعات و هەفتەو مانگ و رۆژو ساڵە. كات لەجیهانی ئەثیری دا لەوانەیە بەوشێوەیەبێت كەپەروەردگار فەرموویەتی:

﴿تَعْرُجُ الْمَلائِكَةُ وَالرُّوحُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ﴾ (المعارج:٤)

ئێمە لەسەر زەوی رووناكی و رەنگ و سێبەرئەبینین.

ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ تیشكی خۆر پێچەوانە ئەبێتەوە بۆچاومان بەشێوەیەكی ناڕاستەوخۆ، چونكە شتێك هەیە نەهێڵی ڕاستەوخۆبدات لەچاومان ئەویش ئەوتەنە ووردانەیە لەهەوای دەورمان دای هەیە.

بەڵام لەجیهانی ئەثیری دا ئەم حاڵەتە بەتین ترو خێراترەو بەهێزترە چونكە خۆری ئەثیری ئەكەوێتە سەر جیهانە ئەثیری یەكان بۆیە شەو لەجیهانە ئەثیری یەكان دانی یە ئەمەش زانست پەسەندی كردووە.

هەوای زەوی وەكوو ئاوێنە وایە بۆخۆر، لەهەلاتن و لەئاوابوون دا، ئەمەش ئەبێتەهۆی درێژبوونی رۆژ بەپێچەوانەوە رۆژمان زۆر كورت ئەبوو ئەگەر راستەوخۆ تیشكی خۆر بەر زەوی بكەوتایە. ئەوهۆیە ئەگەڕێتەوە بۆ بەرزی ئەو ئاوێنە ئاسمانی‌یە لەسەرووی رووی زەوی یەوە ئەگەر ئەو ئاوێنەیە كە((خۆرە)) بەرزتربوایە ئەوە رۆژ درێژتر ئەبوو شەومان زۆر كورت ئەبوویەوە، بەپێچەوانەیشەوە ئەگەر خۆر بەرزتر بوایە ئەوجیاوازی یە زۆر زۆرتر ئەبوو.

بەڵام لەجیهانە ئەثیری یەکاندا خۆرە ئەثیری یەکانیان زۆر بەرزترن بەم جۆرە شەویان نی یە وەکوو شەوی ئێمە تەنها وەکوو گزنگ وایە، وەکوو پێش خۆرئاوابوون یان پێش خۆرهەڵاتنی ئێمە ، شەویان وایە.

ئێمە لەسەر زەوی شەپۆلی لاسلکیمان هەیە، ئەم شەپۆلانە وەکوو شەپۆلی رووناکی‌یە، تەنها ئەوەیە لەوان ملیۆنەها جار درێژترن، لەبەرئەوە وەکوو شەپۆلی رووناکین لەزۆرشتا لەیەك ئەچن. شەپۆلی رادیۆ کەبۆماوەیەك بەرز ئەبنەوە لەماوەی چرکەیەکدا ئەگەڕێنەوە سەرزەوی، ئاسمانی زەوی بەم جۆرەیە، بەڵام بەپێچەوانەوە تیشکی خۆر رووداني بەرەبەیان و خۆر ئاوابوون شەپۆلەکانی رادیۆ دروست ئەکەن.

بەچینێك لەگاز کەپێ ی ئەڵێن(المتأین) ئەم گازە ئەو هەوایەیە کەگەردیلەکانی ئەلەکترۆنێکی گوم کردووە، یان لەدەستی‌داوە.

یەکێ لەو چینانە کە٦٥–٧٠میل بەرزە لەڕووی زەوی‌یەوە پێ ی ئەڵێن: (کنلی – هفسید Heaviside–Kennelly ).

هەروەها چینێکی تریش هەیە پێ‌ی ئەڵێن ئەپلتۆن. Appleton ٩٠–٢٥٠میل لەڕووی زەوی‌یەوە بەرزە.

لەم ساڵانەی دوایی دا زاناکان بۆیان دەرکەوت کەهەندێ دەنگ دانەوە لەقوڵایی گەردوونەوە لەزۆر دوورەوەدێت لەماوەی ٣–٣٠چرکەدا ئەگاتە زەوی

شەپۆلی ڕادیۆ بەخێرایی ١٨٦,٠٠٠میل لەیەك چرکەدا ئەڕوا، واتە:

بەخێرایی رووناکی لەبەرئەوە ئەبێ بزانین کەچینی پێچەوانەکەرەوە هەیە لەزۆر زۆر دوورەوە لەزەوی، کەزیاتر لە ٣,٠٠٠,٠٠٠سێ ملیۆن میل دوورە، لەبەرئەوە شەپۆلەکانی رادیۆ کەلە(لەندەنەوە) دێن ناچنە ناخی زەوی یەوە بەڵکو بەرز ئەبنەوە بۆسەرەوە تاکوو بەر یەکێك لەوچینانە ئەکەون و ئەگەڕێنەوە بۆزەوی بەم جۆرە لە(ئوسترالیا) گەیەنەرە هەوایی یەکان وەری ئەگرن.

بەم شێوەیە ئەگەر لەلەندەن رۆژبوو لەئوسترالیا شەوە.

مانگ بەرگەبای نی یە، لەبەرئەوە بەرەبەیان و خۆرئاوابوونی نی یە، چونکە چینی پێچەوانەکەرەوە نی یە لەسەروویەوە لەبەرئەوە رۆژی کتوپڕی یە و شەوی کتوپڕیە

بەخێرایی ئەگۆڕێن، ئێمە لەسەر زەوی دوای خۆرئاوابوون رووناکیمان هەیە ماوەی سەعاتێك هەروەها پێش خۆرهەڵاتن رووناکیمان هەیە سەعاتێك بەڵام لەمانگ دا لەماوەی چاوتروکاندنێکدا شەو ئەبێ بەڕۆژو رۆژیش ئەبێ بەشەو.

لەبەرئەوە بوونی بەرگەبای زەوی زۆر گرنگە هەرچەندە نابینرێ بەڵام راستی یە و هیچ گومانی تێدانی یە ئەم بەرگەبایە هەیە.

ئەگەر بەرگەبا نەبووایە بەدەوری زەوی‌دا ئاسمان بەڕۆژدا ڕەش ئەبوو، خۆریش رووناکی زۆرترئەبوو، شین ئەبوو چونکە بەرگەبا بەشێکی زۆر لە بریسکەو شینی کەم ئەکاتەوە هەروەها ئەستێرەکان نەئەدرەوشانەوە بەڵکو بەوێنەی خاڵی ووردی رووناکی دیارئەبوون.

ئەگەر بەرگەبا نەبووایە باران و ئاوو دەریاو رووبار نەئەبوون ژیانیش نەئەبوو، کەوابوو لەجیهانە ئەثیری یەکاندا ئەبێ بەرگەبا هەبێت بۆ ژیانی بەردەوامی هەتا هەتایی دوای مردن لێرەدا وا دەرئەکەوێ

مردن وەکوو گواستنەوەیەکە لەخانوویەکەوە بۆ خانوویەکی تر.

ئێستا هەندێکمان زانستی رۆحی و زانستی فیزیاوی زانی دەربارەی جیهانی فیزیاوی و جیهانی ئەثیری پێویستە شتێکیش بزانین لەبارەی ئەو ژوورانەوە کەئامادەئەکرێن بۆ قسەکردن لەگەڵ رۆحەکان دا لەجیهانە ئەثیری یەکاندا.

# (ژوورەکانی ئامادەکردن)

((ئەم باسە لەکتێبی (مشعل العرفان)ەوە واتە مەشخەڵی عیرفان و خوداناسی لەگەڵ وێنەکەی وەرگیراوە))

لەپەیمانگای جیهانی رۆحی لە (لەندەن) بەم شێوەیەی خوارەوە لەسەر نوێ ترین شێوە ژووری ئامادەکردنی رۆحەکان دروست کراوە:

....ژوورەکە چوارگۆشەیە و درێژی لایەکی ٢٤بیست و چوار پێیەو بەرزی‌یەکەی ١٢دوانزە پێ یە.... دیوارەکانی گەچ کاری کراون بەرەنگی شینی کاڵ. هۆدەکە زۆربەرزنەبێت و زۆر گەورەنەبێت باشترە بۆئەوەی بەشێکی مادەی (تێلیـپلازم) نەفەوتێ (ئەم مادەیە لەتێکەڵەی ئەکتۆپلازمی ناوەندو سیکوپلازمی ئەثیری)یەکان دروست ئەبێت.

کورسی یەکانی ژوورەکە بەجۆرێك دروست کراون ئەوەی دائەنیشێ لەسەریان ئەیکێشن و ئامێری تایبەت ئەینووسێ و بەردەوام ئەبێت لەنووسینی کێشی تاکوو هەڵئەسێ.... واتە لەهەموو دەقیقەیەکدا کێشی ئەنووسرێ لەکاتی کۆبوونەوەکەدا....

کاتێ ئامادەبووان دائەنیشن کورسی یەکان بەرزئەبنەوە بەجۆرێ هەردوو پێ ی دانیشتووان نەدات لەزەوی چونکە ئەگەر پێ یان بدات لەزەوی کێشیان بەتەواوی نازانرێ دانیشتووان بەمە ماندوونابن چونکە قاچیان ئەخەنە سەرتەختەیەك کە بە کورسی یەکەوە بەندە.

لەناوەڕاستی ژوورەکەدا بە سەقفەکەوە جووڵێنەرێکی کارەبایی هەیە بەردەوام هەوای ژوورەکە ئەلەرێنێتەوە لە تەنیشتیەوە ئامێرێکی وێنەگرتنی فۆتۆگرافی هەیە.

لەدوو سووچی (قوشبنی) ژوورەکەدا دووئامێری وێنەگرتنی سینەما تۆگرافی هەیە بەردەوام وێنە ئەگرن لەکاتی کۆبوونەوەکەدا یان دانیشتنە رۆحی یەکەدا.

دوو تیشکی رووناکی ژێرسوور لەژوورەکەدا هەیە تیرەی یەکێکیان کەگەورەیە پێنج بستەو تیرەی بچووکەکەیان دووبستە.

ئەم دووتیشکە یەکێکیان چوارپێ بەرزەو ئەوی تریان هەشت پێ بەرزە بۆئەوەی تێکەڵ نەبن.

لەژوورەکەدا دووزوڕنا هەڵواسراون بەردەوام ئەجووڵێن....

ئەم دووزوڕنایە تیشکی بچووکیان بەرئەکەوێ ئامێری وێنەگرتنی سینەماتوگرافی دەست ئەکات بەوێنەگرتن..

(واتە ئەوەیان تیرەکەی دووبستەو چوارپێ لەزەوی یەوە بەرزە) هەروەها زوڕناکان بۆ سووچەکەی تر ئەڕۆن ئامێری وێنەگرتنەکەی تر کەبەتیشکی گەورە کارئەکات دەست ئەکات بەوێنەگرتن واتە ئەوتیشکەی تیرەکەی پێنج بستەو هەشت پێ لەزەوی یەوە بەرزە بەڵام ئامێری سێ هەمی فۆتۆگرافی بە سەقفەکەوەیە لەهەردوو حاڵەتەکەدا وێنەئەگرێ.

لەسەریەکێ لەدیوارەکانی ژوورەکە وێنەگرێکی فوتوگرافی تر هەیە کەرووناکی سەرووی وەنەوشەیی لێ ی ئەدا، کارئەکات و رووناکی ژێر سوور کاری لێ ناکات، دانیشتوان زۆر حەز ئەکەن وێنەی رۆحە ئەثیری یەکان بگرن کەدێنە ژوورەکەوە.

تاکوو ئێستا ئەم کارەیان بۆ ئەنجام نەدراوە، بەڵام هەندێ لەو زانایانە دەڵێن توانیویانە رۆحی گیان لەبەرانی تر وێنەبگرن کاتێ رۆحەکەیان لەلەشەکانیان جیائەبێتەوە، هەر وێنەیەك پێچەوانەبێتەوە بەتیشکی ژێر سوورو بەتیشکی سەرووی وەنەوشەیی ئامێرەکان ئەتوانن وێنەی بگرن واتە توانایان لەچاوی ئادەمیزاد زیاترە، بەم ئامێرانە وێنەی مادەی تێلیپلازم ئەگیرێ کاتێ دەرئەکەوێ و ئەبێتە هۆی جیابوونەوەی کۆئەندامی دەنگ و لەرینەوەی هەوای ژوورەکە.

لەسووچی سێ یەمی ژوورەکەوە تۆمارکەرێکی دەنگ هەیە هەرچی دەنگێك لەجیهانی ئەثیری رۆحی یەوە دێت تۆماری ئەکات و ئەیدات بەدانیشتوان بەهۆی ئامێری وەرگرتن کە بە کورسی یەکانەوە بەندە...

کەوابوو ئەم تۆمارکەری دەنگە هەرچی دەنگێك یان قسەیەك ئەبێت لەلایەن دانیشتوانەوە یان رۆحە ئامادەبووە ئەثیری یەکانەوە تۆماری ئەکات و لەدانیشتنەکەدا

دانیشتوان گوێ یان لێ ی ئەبێ و پاشان لەسەر شریت لێ ئەدرێتەوەو گوێ یان لێ ئەبێت چی رووی داوە.

جوولانەوەی زوڕناکان و مادەی تێلیپلازم کەزوڕناکان ئەجوولێنێتەوە، هەروەها مادەی ئەکتۆپلازم کەلەلەشی ناوەندەکە دێتە دەرەوە لەکاتی دانیشتنەکەدا و پاشان ئەچێتەوە ناو لەشی هەمووی تۆمارئەکرێ.

ناوەندەکە کەسێکە توانای ئەوەی هەیە ئەکتۆپلازم لەلەشی دەرکاتە دەرەوە چونکە ئەم مادەیە لەهەندێ ئادەمیزاددا زۆرەو توانایان هەیە بیکەنە دەرەوە پاشان ئەیگەڕێننەوە بۆناو لەشی خۆیان.

کاتێ ئەکتۆپلازم لەلەشی ناوەندەکە دێتە دەرەوە ئەثیری یەکان بەسیتوپلازمی خۆیان تێکەڵی ئەکەن و مادەیەك پێك ئەهێنێ ئەویش (تێلیپلازمە) کە ئەبێتە هۆی پەیوەندی کردنیان لەگەڵ دانیشتوانی ژوورەکە.

پلەی گەرمای ژوورەکە بەهۆی تێرمۆگرافێکەوە پێوانەئەکرێ لەکاتی دانیشتنەکەدا، ئەوپلەی گەرمایە ئەبێت ٦٠ شەست پلەی فهرنهایت بێت...

لەوکاتەدا هێشتا پەیوەندی نەکراوە بەڕۆحەکانەوە کاتێ پەیوەندی کردن دەستی‌پێ‌کرد، بیست پلەی تر نزم ئەکرێتەوە ئەمەش زانا رۆحی یەکان خۆیان ئەزانن بۆچی ئەبێ وابێت بەڵام زانایانی زانستی نوێ خەریکن لێکی ئەدەنەوەو تاقی کردنەوەی لەسەرئەکەن بۆئەوەی لەم نهێنی یە تێ بگەن.

دیوارەکانی ژوورەکە بەجۆرێك دروست کراون کەدەنگ ناچێتە دەرەوەو نایەتە ژوورەوە.

هەروەها رووناکی سپی لەژوورەکەدا هەیەو کاتی پێویست هەڵ ئەکرێ و تەلەفۆنیش لەژوورەکەدا هەیە بۆکاتی پێویستی بەکاردێت لەگەڵ دەرەوەدا.

ئەمە ژووری ئامادەکردنی رۆحەکانە بەنوێترین شێوەو ئامێر.

**بڕوانە وێنەی ژمارە ( ٢٦ )**




وێنەی ژمارە ( ٢٦ ) ژووری ئامادەکردنی ڕۆحەکان

## (باسی هەندێ ڕووداوی سەر سوڕهێنەر)

### لەژوورەکانی ئامادەکردن دا

سـلۆن یەکێکـە لەناوەنـدە ناسـراوەکان لەکۆمەڵـەی ئامـادەکردنی ڕۆحـەکان لـە ((گلاسکۆ))

ج- آرثر فندلای زانایـەکی ڕۆحـی یـە و لـەزۆر دانیـشتن دا لـەژووری ئامـادەکردنی ڕۆحەکان دا بەشداری کردووەو لەکتێبەکەی دا (على حافة آلعالم الأثيرى) ئەڵێ:

زۆرجـار لـەژوورەکانی ئامادەکردنی ڕۆحـەکان دا، دانیشتووم بەتایبـەتی زۆربـەی دانیشتنەکانم لەکۆمەڵەکەمان دا لـە ((گلاسکۆ)) لەگـەڵ ناوەنـدی بـەناوبانگ ((سـلۆن)) دانیشتووم گەلێ ڕووداوی گرنگم دیوە هەندێکیان باس ئەکەم:

١- هـاوڕێ یـەکی خۆشەویـستم لـەخێزانێکی بـەناوبانگ کۆچـی دواییکـردو لەڕۆژنامەی / گلاسکو هرالد/ هەواڵی کۆچ کردنەکەم خوێندەوە.

پاش هەفتەیـەك دوای ناشـتنی لەگۆڕسـتان. مـن و سـلۆن و هەنـدێ لـەهاوڕێیانمان لەژووری ئامادەکردنی ڕۆحەکان لەکۆمەڵەکەمان دانیشتین.

لەڕاستی دا سلۆن نەی ئەزانی من ئەو ئافرەتە هاوڕێم بووەو ئەیناسم.

کاتێ دانیشتنەکە دەستی پێ کرد و سلۆن ی ناوەنـد چـووە حـاڵی بێ هۆشـی یـەوە (چـونکە ڕۆحـی لەلەشـی جیائەبێتـەوە) کـوڕی ئـەو ئافرەتـەی هـاوڕێم کەماوەیـەکی زۆرپێشی مردنی دایکی لەشەڕی بەرگری لەنیشتمانەکەی کوژرابوو بانگی کـردم ووتـی ئێستا من بەختیارم!!! چونکە دایکم هاتەلام (ئەم کوڕە کوژراوە ناوی سیسل بوو).

منیش وەڵامم دایەوە ئایا ئێستا دایکت ئامادەیەو لەلاتە؟ وەڵامی دایەوە بەڵێ!!

ووتم ئایا ئەتوانم قسەی لەگەڵ بکەم ووتی بەڵێ!!!

ئافرەتـە کـۆچ کردووەکـەی هـاوڕێم کـەدایکی سیـسل بـوو قـسەی لەگـەڵ کـردم. لەوقسانەش ئەوەبوو ووتی بۆچی لەڕۆژنامەکەدا هـەواڵی مـردنم بڵاوتـان کـردەوە بـەڵام جۆری نەخۆشی یەکەم نەنووسرابوو!!! (لێرەدا ئەوەمان بۆ دەرئەکەوێ ڕۆحەکان پـاش مردن ئاگادارن).

پاشان تەماشام کرد راست ئەکات لەڕۆژنامەکەدا نەنووسراوە بەچ نەخۆشی یەك مردووە.

هەروەها ئەم ئافرەتە پێ ی ووتم ئێستا لەجیهانی ئەثیری دایە.

واتە لە((بەرزەخ))دایەو لەجیهانی رۆحەکان دایەو ئەو گۆڕانەی بەسەری داهات بۆی باس کردمو گوتی من تەنها بەرگی فیزیاوی واتە لەشی فیزیاویم فڕێ داوەو ئێستا بۆ هەتا هەتایە ژیانی رۆحی بەسەر ئەبەم و هەتا هەتایە جارێکی تر ناتوانم جیهانی فیزیاوی ببینمەوەو بەو گۆڕانەدا کەپێ ی ئەڵێن مردن تێپەڕبووم هەرچەندە مردن نی یە بەڵکو لەدایك بوونێکی نوێ یە لەجیهانێکیتردا.

پاشان ووتم: ئایا ئەوەکێ یە لەلاتەوە، وەستاوە؟ ووتی هیچ کەس نابینم لەلامابێت، لەم کاتەدا کوڕەکەی وەڵامی دامەوە، ووتی دایکم هیچ نابینێ چونکە تازە هاتووەتە ئەم جیهانەوە، ماوەیەکی کەمی ئەوێ تاکوو رأدێت و هەموو شتێك ئاسایی ئەبێت لەلای.

پاش ماوەیەکی کەم بانگی ژنەکەم کردەوەو گوتم کوڕەکەت (سیسل) نابینی لەلاتا وەستاوە؟ ووتی نەخێر کوا؟ کوانێ؟ هتد لەپڕێکدا دەنگی گۆڕا لەدەنگی غەمباری یەوە بۆ دەنگی خۆشی گوێمان لێ ی بوو هاواری ئەکرد ئەوەتا ئەوەتا کوڕی خۆشەویستم ((سیسل))؟!!.

نزیکەی دووسەعات قسەمان کردوو دایك و کوڕەکەی بەیەکتر شادبوونەوە لەجیهانی رۆحی و ئەثیری دا

منیش هەموو قسەکانم وەرگرتن و هەموویان راست بوون ئەوەی من ئەمزانی لەنێوانمان دا پێش مردنیان هەموومان باس کرد کەهیچ کەسێکی تر نەبوو ئەوشتانەبزانێت.

لەم جۆرە رووداوو قسەکردنانە لەگەڵ رۆحەکانی جیهانی ئەثیری دا تاکوو ئێستا لەگەڵ ٨٣ هەشتاوسێ دەنگی جیاواز واتە رۆحی جیاوازدا قسەم کردووە.

ج–آرثر فندلای (على حافة العالم الأثيري).

٢- ((رووداوێکی تر)) مسترماك كولى: ئەم زانا رۆحی یە ١٨هەژدەساڵ زیاتر هاورێ ی ناوەندی بەناوبانگ (سلۆن) بووە.... بەهۆی ئەم هاورێیەوە بۆی دەرکەوت کەجیهانی رۆحی هەیەو لە ئەثیردایە.

**مسترماك كولی ئەڵێ:**

برایەکی بچووکم هەبوو ناوی ((جونی)) بوو تەمەنی ١٢دوانزەساڵ بوو لەپڕێك دامرد. دایکم زۆری خۆشدەویست دوای مردنی ئەوبرایەم دایکم رۆیشت بۆ ئوستراليا زۆر دڵتەنگ و پەشێوبوو.

لەدانیشتنێکی رۆحی دا لەگەڵ هاورێم ((سلۆن)) توانیم پەیوەندی بکەم بەرۆحی برا بچووکەکەمەوە و قسەی لەگەڵ بکەم و پرسیارم لێ کرد ئایا ئەزانی دایکم ئێستا لەکوێ یە؟

وەڵامی دامەوە ووتی بەڵێ ئێستا لەکەشتی یەکی گەورەدایە چایی ئەخواتەوە!!!...

منیش لەدڵی خۆمدا وامزانی دایکم لەئوسترالياوە ئەگەڕێتەوە لەم کاتەدا برا بچووکەکەم خێرا ئەقڵی ئەثیری خوێندمەوە ووتی:

نەخێر ناگەڕێتەوە بەڵام بۆی بنووسن ئەوەندە خەفەت نەخوا بەمردنی من چونکە هەرچەندە ئەو دڵتەنگ بێت منیش لێرە زۆردڵتەنگ ئەبم خەفەت ئەخۆم و بەختیارنیم!!!!.

پاشان منیش نامەیەکم نووسی بۆبراکەی ترم کە لە ئوستراليابوو دایکم چووبوو بۆلای.

باسەکەم هەمووی بۆ نووسی چۆن قسەم لەگەڵ جۆنی برام کردبوو؟!!

ئەویش وەڵامی دامەوە بەڵێ لەوکاتەدا دایکم لەناو کەشتی یە کەدا بووەو چایی خواردووەتەوە لەبەر خەفەتی دڵی خۆی ئەوگەشتەی کرد لەو کەشتی یەدا بۆ لای خوشکەکەمان لە((سدنی)) **Sydney** .

لەوێ خوشکەکەمان بردبووی بۆلای ناوەندێکی رۆحی بەهەمان شێوە قسەی لەگەڵ جۆنی برام کردبوو پێی ووتبوو جێگەی خۆشە بەڵام تاکوو ئەو خەفەت بخوا ئەم بەختیارنی یەو دڵ تەنگە.

پاش ماوەیەکی تر نامەیەکم لەئوستڕالیاوە بۆهات کەدایکم مردووە، منیش لای کەس باسم نەکرد، ٣سێ مانگ بوو هاوڕێ ی خۆم ((سلۆن))م نەدی بوو، ئەو ئێوارەیە چووم بۆلای و دانیشتنی رۆحی هەبوو، منیش ئامادەبووم لەدانیشتنەکەدا چوارقەشە ئامادەبوون هەریەکەیان ناوونیشانی مردووەکانی خۆی ئەدا بۆئەوەی قسەیان لەگەڵ بکەن.

هەریەکە لەقەشەکان قسەی خۆی کرد لەگەڵ رۆحی مردووەکانیاندا منیش پاشان بانگی رۆحی هاوڕێ یەکی خۆمم کرد وەڵامی دامەوەو ووتی:

((من نامەوێ قسەت لەگەڵ بکەم))

منیش دووبارە تکام لێ کرد قسەی لەگەڵ بکەم...

خێزانەکەی((سلۆن))ی هاوڕێم کەلەژوورەکەدابوو توانای بینینی رۆحەکانی هەبوو پێ ی ووتم: وازی لێبێنەو ماندووی مەکە ئەونایەوێ هیچت پێ بڵێ!!!

بەڵام من بەردەوام بووم لەداواکاری‌یەکەم، دیسانەوە تکام لێ کرد بەڵام خێزانەکەی سلۆن وێنەی نەبینراوی ئەبینی

واتە وێنەی رۆحەکانی ئەبینی پێ ی ووتم، رۆحی هاوڕێکەت وەڵامت ناداتەوە، چونکە ئافرەتێك لەپشتی کورسی‌یەکەتەوە وەستاوە ئەوە دایکتە، منیش ووتم باشە ئەمەوێ قسەی لەگەڵ بکەم، لەم کاتەدا، دایکم وەڵامی دامەوە بەهێواشی پێ ی ووتم: باوکت ئەڵێ کەبڕۆی بۆلای خزمەکانی ئاشتیان بکەیتەوە، ئەوەی شاییانی باسە دەمێك بوو باوکم مردبوو ئەم هەواڵەی بەڕۆحی دایکمدا ناردبوو بۆم زۆر سەرم سوڕما...چونکە من لەگەڵ خزمەکانی باوکم دا قسەم نەبوو ناکۆك بووم لەگەڵیان لەسەر هەندێ پارە بەڕاستی ئەمە زۆر دەمێك بوو بەجۆرێك لەبیرم چووبوویەوە پرسیم لەدایکم باوکم خۆی بۆچی قسەم لەگەڵ ناکات؟

دایکم ووتی زۆر دڵی لێت ئێشاوە....

تەنها ڕێگە ئەوەیە بڕۆی بۆلای خزمەکانی باوکت ئاشتیان بکەیتەوە باوکت پێی خۆشە ، منیش هەستامو ئەو داواکاریەم جێ بەجێ کرد.

لەئاینی ئیسلام دا گەردن ئازادی هەیەو گوێڕایەڵی دایكو باوك هەیە

ئەمە ڕووداوێك بوو لەهەزاران ڕووداوی تر ئەگەر هەموویان بنووسن لە دەیان کتێب دا باسیان تەواونابێت ئەوەندە ((سلۆن)) دانیشتنی ڕۆحی کردووەو قسەی لەگەڵ ڕۆحەکان کردووە لەجیهانی ئەثیریدا.

## چەند زانیارییەك دەربارەی ڕۆحە ئەثیری یەکان و لەشە فیزیاوی یەکان

لەمەوپێش باسی دەنگی ڕۆحەکانمان کرد لەژوورەکانی ئامادەکردنی ڕۆحەکاندا بەهۆی زوڕناکانەوە، یان بەبێ زوڕناکان لەناو ژوورەکاندا.

((سلۆن)) باشترین ناوەندی ڕۆحی یە کە ئەتوانێ خۆی بێ هۆش بکاتو قسە لەگەڵ ڕۆحەکان بکرێت بەهۆی ئەوەوە.

ڕۆحەکان سەرکەوتوون بەسەر ڕۆحی سلۆن دا، لەبەرئەوە بەهۆی ئەوەوە ئەتوانن قسەمان لەگەڵ بکەن لەژووری ئامادەکردن دا هەر ڕۆحێك نەتوانێ سەرکەوێ بەسەر ڕۆحی سلۆن دا بەهۆی ڕۆحە سەرکەوتووەکانەوە ئەتوانن نامەکانیان بنێرن بۆ کەسوکاریان.

زانای ڕۆحی ج.آرثر. فندلای لەکتێبەکەی دا (على حافة العالم الأثيري). ص٩٣ ئەڵێ:

ئەوەی بۆم دەرکەوتووە گەردوون هەمووی لەگەرد پێك هاتووە بەڵام بەچڕی یەکی جیاوازو جووڵانەوەو لەرینەوەی جیاواز!!!!

ئەم مادەیە هەموو بۆشایی ئەوشوێنانەی پڕکردۆتەوە کەژیانی تێدایە، ئیتر ژیانی فیزیاوی بێت یان ژیانی ئەثیری، شتی دیارو دەرکەوتوو، هەست پێ کراو یان هەست پێ نەکراو، شاراوەو دەرنەکەوتوو.

ئەوەی ئێمە هەستی پێ ئەکەین لەسەر زەوی مادەیەو لەپلەیەکی تایبەتی خۆی دا ئەلەرێتەوەو لەسنوورێکی دیاری کراودا.

بەدەوری زەوی داو لەناو زەوی دا جیهانێکی تر هەیە پێوەی بەستراوەو لەگەڵیا ئەجووڵێتەوە، ئەویش جیهانی ئەثیری‌یە بەڵام بەلەرینەوەیەکی زیاتر، لەبەرئەوە هەستی پێ ناکرێ.

لەشی راستیمان لەشی ئەثیری یەو رۆحی یە لەوکاتەوە لەناو سکی دایك دا ئەو رۆحە دائەپۆشرێ بەمادەی فیزیاوی‌و ئیتر لەگەڵ مادە فیزیاوی یەکەدا ئەبێت هەتاکوو مردن کەجیائەبنەوە رۆح ئەڕواتەوە بۆ جیهانی رۆحی‌و لەشی فیزیاوی بۆناوگڵ، واتە هەریەکەیان بۆجێگەی یەکەم جاری خۆیان.

لەشی ئەثیری، وێنەیەکی تەواوی لەشی فیزیاوی یە و پڕبەپڕی خۆیەتی‌و هیچ جیاوازیان نی یە تەنها مادەکەیان نەبێت (فیزیاوی‌و ئەثیری).

هەرلەبەرئەوەیە رۆحەکان لەجیهانی ئەثیری دا ناتوانن قسەمان لەگەڵ بکەن چونکە ئێمە فیزیاوین‌و ئێستا ئەوان ئەثیرین، ئەگەر ناوەندهەبێت ئەوا رۆحەکان بەهۆی لەشی فیزیاوی ناوەندەکەوە قسەمان لەگەڵ ئەکەن.

هەرلەبەر ئەمەیە ((سلۆن)) خۆی بێ هۆش ئەکات لەژووری ئامادەکردن تاکوو رۆحەکەی جیاببێتەوە لەلەشە فیزیاوی‌یەکەی ئیتر بەم شێوەیە رۆحەکان لەجیهانی ئەثیری یەوە ئەتوانن سەرکەون بەسەر لەشە فیزیاوی یەکەو رۆحەکەی سلۆن‌و بچنە لەشە فیزیاوی یەکەیەوەو قسەمان لەگەڵ بکەن.(زۆرجاریش ئەبینین لەخەودا رۆحەکان قسەمان لەگەڵ ئەکەن چونکە لەخەوتنی تەواودا رۆحی ئەثیری لەلەشی فیزیاوی ئەچێتە دەرەوە).

هەمووکەسێك ئەم توانایەی نی یە وەکوو ((سلۆن)). هەندێ کەسی تایبەت هەن کەمادەی ئەکتۆپلازمیان زۆرەو توانای هەست کردنیان لەئێمە زۆر زۆرترە.

لەشی ئەثیری‌و ڕۆحی ئەثیری لەلەشی فیزیاوی جیائەبنەوە بەڵام ئەوشتانەی پێیان بەخشراوە لەلایەن پەروەردگارەوە لەگەڵ خۆیانی ئەبەن وەکوو بیرکردنەوە، خۆشەویستی، کەسایەتی، رەوشتی باش.

هەندێ لەش و رۆحی ئەثیری بەپێچەوانەوە رەوشتی خراپ و دڵ رەقی و نەبوونی کەسایەتی و بیرنەکردنەوە لەگەڵ خۆیان ئەبەن.

واتە هەرچیت کرد لەسەر زەوی و کەسایەتیت چۆن بوو لەجیهانی ئەثیری دا بەهەمان شێوەئەبیت.

هەرلەبەرئەوەیە پەروەردگار تەوبە قبوڵ ئەکات، تاکوو ئەوخراپەکاریە لەلەشی فیزیاوی دا فڕێ بدەین و بەڕەوشتە باشەکان رەفتاربکەین، تاکوو رەوشتی باش لەگەڵ لەشی ئەثیری بڕوات بۆ جیهانی ئەثیری.

فندلای بەردەوامەو ئەڵێ: ئەو رۆحانەی کەتاکوو ئێستا پەیوەندیم بووە لەگەڵیان هەموویان بەزمان و بەناوی سەرزەوی خۆیان لەجیهانی ئەثیری دا قسەئەکەن و ناویان هەیە.

لێرەدا ئەوە دەرئەکەوێ ئەگەر بمانەوێ قسەلەگەڵ هەر رۆحێك بکەین ئەبێ بەزمانی سەرزەوی چۆن قسەی کردووە هەربەوزمانە قسەی لەگەڵ بکەین و هەر بەوناوەی سەرزەوی یەوە بانگی بکەین.

لەجیهانی ئەثیری دا، لەشە ئەثیری یەکان جوانی یان وەکوویەکە، ناشیرین نین چونکە رۆحەکان پاکن.

لەسەرزەوی کرداروو رەفتاریان باش بووە بۆیە لەجیهانی ئەثیری دا گەش و جوانن.

بەڵام ئەو رۆحانەی لەسەر زەوی خراپەکاریان کردووەو خراپ بوون ناشیرین و نەفرەت لێ کراون لەجیهانی ئەثیری دا.

هەندێ جار قسەم لەگەڵ رۆحەکان دا کردووە لەیەك پلەدا نەبوون بەڵکو هەریەکەیان یان هەندێکیان لەجیهانێکی ئەثیری جیاوازبوون لەوی تریان هەروەکوو باسمان کرد حەوت جیهانی ئەثیری هەیەو لەڕۆژی دوایی‌دا ئەبن بەهەشت.

﴿ وَالْمَلَكُ عَلَى أَرْجَائِهَا وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَانِيَةٌ ﴾ (الحاقة: ١٧)

رۆحە خراپەکانیش وان لەشوێنی خراپ و چاڵایی و نزمایی دا لەجیهانی ئەثیری یەکەم دا کە بە (أسفل) ناوئەبرێ واتە جیهانی ئەثیری خوارەوە. ئینجا لەچاڵایی و

نزمایی جیهانی ئەثیری یەکەم دا کەبە (أسفل السافلین)ناوئەبرێ رۆحە خراپەکان لەحاڵەتێکی زۆرخراپ دان تاکوو رۆژی لێ پرسینەوەی یەکجاری.

هەروەها هەمان زانای رۆحی (ج . آرثر . فندلای) ئەڵێ:

دانیشتوانی رۆحی جیهانە ئەثیرییەکان زمانێکی تایبەتی خۆیان هەیانەو هەموویان قسەی پێ ئەکەن و لێ ی تێ ئەگەن و بەوزمانە خۆیان قسەئەکەن لەگەڵ یەکتر. بێ گومان ئەمەش کاری پەروەردگارە.

ئەثیری یەکان لەجیهانی ئەثیری دا ئەقڵیان لەناو مێشکی ئەثیری خۆیان دا کارئەکات، خواردن و خواردنەوەیان تەنها بە بیرکردنەوەیەو هەموو شتێك ئامادەیە بۆیان و جووڵانەوەیان ئەوەندە خێرایە، زۆر بەئاسانی لەچاو تروکاندنێکا بۆ دوورترین شوێن لەجیهانی خۆیان دا ئەڕۆن.

هەروەها ئەم زانایە ئەڵێ ژیان لەجیهانی ئەثیردا هەمووی ئەمێنێ. ئادەمیزاد و گیان لەبەرەکانی تر لەسەر زەوی تەنها لەشی فیزیاویان فڕێ ئەدەن و لەشی ئەثیریان ئەڕوا بۆ جیهانی ئەثیری و ئەمێنێ، بەڵام رۆحی گیان لەبەرەکان هەست بەڕۆحی ئادامیزادەکان ناکەن چونکە هەریەکەو جێگای تایبەتی خۆی هەیە لەجیهانی ئەثیری داو وەکو جیهانی فیزیاوی نی یە.

هەروەها لەجیهانی ئەثیری و رۆحی دا ئادەمیزاد بە بیرکردنەوە بەزووترین کات هەموو کارێکی بۆ جێ بەجێ ئەبێت.

کەوابوو ژیان کۆتایی نایەت و ڕۆح نافەوتێ و لەهەموو شوێنێك دا هێزێکی گەردوونی هەیە کەدەسەڵات و بەڕێوەبردنی پەروەردگارە هەروەکوو پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الْأُمُورُ﴾

زانستی فیزیاوی باسی مادەی فیزیاوی ئەکات و لێ ی ئەکۆڵێتەوە.

واتە ئەوەی هەستی پێ ئەکرێ بەڵام زانستی رۆحی باسی جیهانی ئەثیری و لەشی ئەثیری ئەکات و لێ ی ئەکۆڵێتەوە.

ئێمە هەست بەمادەی فیزیاوی ئەکەین و هەست بەمادەی ئەثیری ناکەین بێجگە لەوانەی بەدەگمەن هەن لەئادەمیزادا مادەی ئەکتۆپلازمیان زۆرەو شتی ئەثیری ئەبینین و ئەبیسن!!!.

هەروەها ئەثیری یەکانیش بەهەمان شێوە هەست بەجیهانی خۆیان ئەکەن و هەستیان نامێنێ بۆ جیهانی ئێمە ئەوانەیان نەبێ توانای تایبەتیان هەیە کەپەروەردگار پێ ی بەخشیون یان بەهۆی ناوەندێکی فیزیاوی یەوە لەژوورەکانی ئامادەکردنی رۆحەکان دا پەیوەندی ئەکەن فندلای بەردەوامەو ئەڵێ:

ئەثیری یەکان زۆر حەزئەکەن کەس و کاریان لەجیهانی فیزیاوی ئێمەوە کۆچ بکەن بۆلایان و بەیەکتر شادببنەوە!!!

واتە باوکێك لەجیهانی ئەثیری دا حەزئەکات کوڕەکانی یان کچەکانی بەزووترین کات بمرن لەجیهانی فیزیاوی داو بگەنەلای!!!!.

مادەی ئەثیری جیاوازی هەیە لەمادەی فیزیاوی لەدروست بوون و پێك هاتنی دا، مادەی ئەثیری یان لەئەثیر دروست بووە یان لەشتێکی تری وەکوو ئەثیر.

زانستی فیزیاوی و رۆحی دووبڕای (دووانەن) لەسەرەتای دروست بوونەوە (الخلق) پەروەردگار بەیەکەوە دروستی کردوون. لەبەرئەوە هەندێ زانای فیزیاوی رایان وایە پەروەردگار یەکەم جار گەردوونی لەمادەی ئەثیری دروست کردووە.

بەڵام نەزانەکان ئەڵێن راستی ئەوەیە هەستی پێ ئەکەین و هەرچی هەستی پێ نەکرێ هیچ نی یە.

((لەرینەوەی فیزیاوی هێواشەو فیزیاوی هەست بەئەثیری ناکات و ناتوانێ پەیوەندی پێوەبکات.

لەرینەوەی ئەثیری خێرایەو هەست بەفیزیاوی ناکات و ناتوانێ پەیوەندی پێوەبکات)).

لەبەرئەوەیە ئێمە هەست بەئەثیری و رۆحەکان ناکەین و ئەوانیش ناتوانن پەیوەندی بەئێمەوەبکەن.

هەستی ئێمە لەبینین و لەبیستن و لەبۆن کردن تەنها ماوەیەکی کەمە، کاتێ دووربین بەکار ئەهێنین شتی زۆر دوور ئەبینین کەبەتەماشاکردنی ئاسایی نابینرێ یان بەمیکرۆسکۆب شتی زۆر ووردی وەکو میکرۆب ئەبینین بەلاّم بەچاو نابینرێ.

زانا رۆحیەکانیش لەجیاتی دووربین و میکرۆسکۆب ژوورەکانی ئامادەکردن بەکارئەهێنن لەگەلّ ناوەندەکانا بۆپەیوەندی کردن و هەست کردن و بینین و بیستنی جیهانی رۆحی و ئەثیری.

کەوابوو بۆمان دەرکەوت جیهانی فیزیاوی جیهانی ئەثیری و رۆحی لەگەلّدایە و نابینرێ هەروەکو سێبەرێکی نادیارە یان وەکوو فلیمێکی نەشۆراوەیەو مردن شتنەوەی جامی هەموو کەسێکەو وێنە راستی یەکەی ئەثیری یە کەلەدوای مردن دەرئەکەوێ!!!.

لێرەدا زانای رۆحی ج. آرثر . فندلای کۆتایی بەووتەکەی ئەهێنێ.

## (چارەسەرکردنی رۆحی)

لەبەرئەوەی لەش و ئەقڵی راستی ئەثیری یە و لەشی فیزیاوی بەرگێکە بۆی بەهۆی پزیشکە ئەثیری یەکانەوە زۆربەی نەخۆشی لەشە فیزیاوی یەکان چاك ئەبنەوە....... لەکتێبی (الحياة بعدَ المَوتْ) دانەری ج. آرثر . فندلای هاتووە و ئەڵێ:

لەئینگلتەرا باشترین ناوەندی چارەسەرکەری نەخۆشی هەیە ئەویش ف – ج – جۆنزە (F-J-Jones) کەبەهۆی پزیشکێکی جیهانی ئەثیری یەوە . کەناوی خۆی ناوە:(پیاوی پزیشکی) نەخۆشەکان چاك ئەکاتەوە بە چارەسەری رۆحی!!

جونز ئەڵێ:

لەساڵێکدا بیست هەزار ٢٠,٠٠٠ نەخۆشی چارەسەر کردووە بەهۆی ئەم پزیشکە رۆحی یەوە.

لەماوەی سێ ساڵی رابوردوودا ٦٠,٠٠٠ شەست هەزار نەخۆشی چارەسەرکردووە ئەم ناوەندە چارەسەرکەرە تەنها ئەوەندە وەرئەگرێ لە نەخۆشەکان (ئەگەر بیدەنێ) پێ ی بژی و یاریدە دەرەکانی لەژووری ئامادەکردن بەخۆڕایی کارئەکەن لەگەڵیدا.

جۆنز بەردەوام سەردانی بارەگای کۆمەڵەی (ماریلبون)ی رۆحی ئەکات Mary Lebone/ Spiritualist/ Association:

بارەگای ئەم کۆمەڵەیە بووە بەیەکێك لەپەیمانگە رۆحی یە گەورەکانی ئینگلترا...

مستر استیل روبرتس: Mars. Estelle Roberts

ئەمیش ناوەندێکی چارەسەرکەرە، ئەم ئافرەتە تەنها چارەسەرکەر نی‌یە بەڵکوو رۆحەکان ئەبینێ و دەنگەکانیش راستەوخۆ ئەبیسێ ئامادەی هەموو کۆبوونەوەکان ئەبێت بەبێ وەرگرتنی کرێ ی ماندووبوون بەدووهەفتەجارێك لەگەڵ سەرکردەی زانا رۆحی یەکان و هاوڕێ کانیان هەرچی لەم کۆبوونەوانەدا روویدات لەگۆڤاری ((سایك نیوز)) Psychic Neews بەپێنووسی ((مۆریس باربانیل)) Maurice Barbanel (کەئەمیش لەکۆبوونەوەکان دا ئامادەئەبێت) بلاوی ئەکاتەوە.

باربانیل کتێبێکی بلاوکردەوە بەناوی (سَيُنْفَخُ فِي الْصُورِّ)

**واتە: گومانی تێدانی یە فووئەکرێت بە(صور) دا هەروەکوو لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە:**

**﴿ وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَنْ شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنْظُرُونَ ﴾ (الزمر:٦٨)**

**کەوابوو ١٤٢٠هەزاروچوارسەدو بیست ساڵ زیاترە پەروەردگار ئەمەی فەرموو بەرابەری ئیسلام محمد (د.خ) بەلاَم تازە خەریکە زانا رۆحی یەکان بۆیان ئاشکرا ئەبیٚ و باوەڕ ئەهێنن هەروەکوو باوەڕهێنانی ساحرەکانی فرعەون بە پەروەردگار و مووسی.**

**ج. آرثر . فندلای بەردەوامەو ئەڵێ:**

**((ئەوەی ئەیەوێ بزانێ کەدەنگی جیهانی رۆحی گەیشتە جیهانی فیزیاوی و پەیوەندی دامەزراو قسە لەگەڵ ئەم جیهانە هەست پێ نەکراوەدا کرا ئەو کتێبەی باربانیل بخوێنێتەوەو منیش یەکەم کەسم کەباوەڕم پێ ی هەیە!!!..**

**هەروەها ج. آرثر . فندلای ئەڵێ:**

**پێویستە ئەوەبزانین چارەسەری رۆحی هێشتا پێش کەوتوو نی یە چونکە (ناوەند) پێش نەکەوتووە بڕوانە ل١٥٢ علی حافة العالم الأثیري (الحیاة بَعدَ المَوتْ).**

**زۆرجار چارەسەری هەندێ نەخۆشی پزیشکەکانی سەرزەوی لێ ی سەرگەردان بوون و بۆیان چارەسەرنەکراوە بەلاَم بەچارەسەری رۆحی چاك بوونەتەوە....**

**ئێستا ژمارەیەکی زۆر پزیشکی رۆحی هەن هەرچەندە ئەم چارەسەری یە لەسەرەتادایە بەلاَم رۆژێك دێتە پێشەوە زۆر پێش ئەکەوێت و سوودی باشی بۆ ئادەمیزاد ئەبێت لەسەرزەوی.**

**هەندێ جاریش پزیشکە رۆحی یەکان تیشکێکیان بەکارهێناوە بۆ چارەسەری نەخۆشێك پزیشکەکانی سەرزەوی هەوڵیان داوە، ویستوویانە ئەوتیشکە بگرن، بزانن چۆنە بەلاَم نەیان توانیوەو ئازارێك پەیدابووە لە دەستەکانیان، وازیان هێناوە لەوتیشکە!!!.**

لەبەرئەوە پێویستە دەسەڵاتی هەموو وولاتێك لەجیهان دا بایەخ بدات بەناوەندە رۆحی یەکان و ئەم زانستە فراوان بکرێت و پشتگیری بکرێت یارمەتی و هاندانی هەبێت. تاکوو چارەسەرو نەشتەرگەری پزیشکە ئەثیری یەکان سوودیان بگاتە سەرزەوی.

زانا رۆحی یەکان ئەڵێن ئێمە ناتوانین کێشەکانی جیهان و ئادەمیزاد چارەسەربکەین چونکە زانستی گەردوونمان نی یە، تەنها کەمێك زانستی جهانی رۆحی و ئەثیری ئەزانین، بەڵام ئەوە ئەزانین ئەگەر زانست و رۆحانیەت یەك بگرن ئەوە زۆر گیروگرفت چارەسەرئەکرێن.......واتە زۆر کێشەهەن چارەسەرئەکرێن..

مستر پارش: Mr. parish چارەسەرکەرێکی رۆحی یە، لەبەریتانیا پێ ی ئەڵێن ((پیرۆز)) ناوی لەهەرسێ کتێبەکەی ج ـ آرثر ـ فندلای دا هاتووە:

(الکون المنشور ـ المجری الروحی ـ علی حافة العالم الاثیری).

هەروەها مۆریس باربانیل Maurice Barbanell لەکتێبەکەی دا (پارش چارەسەرکەرێکی رۆحی‌یە) باسی مستر پارشی کردووە کەچەند توانای بەهێزی هەیە لەچارەسەرکردنی نەخۆشی‌یە چارنەکراوەکاندا لەنەخۆشخانەکاندا لای پزیشکەکان.

پارش: فەرمانبەرێك بوو لەهێڵی ئاسن دا هیچی نەئەزانی دەربارەی جیهانی رۆحی، هاوسەرەکەی (پیجی)Peggy تووشی نەخۆشی شێرپەنجەئەبێت دوای ئەوەی لەنەخۆشخانە چارەسەری نەشتەرگەری ئەکرێت پاش ماوەیەك نەخۆشی‌یەکەی هەڵ ئەداتەوە پزیشکەکان ئەڵێن دوای شەش مانگی تر ئەمرێت...

هاورێ یەکی رۆحی خۆی پێ ی ئەڵێ کەپیجی بەرێتەلای چارەسەرکەرێکی رۆحی بەڵام پارش گاڵتە بە قسەکانی ئەکات هاورێ کەی زۆری پێ ئەڵێ و داوای لێ ئەکات کەبڕۆن بۆلای چارەسەرکەرێکی رۆحی، چونکە ئەگەر سوودی نەبێ زیانیشی نی یە تەنها ناوەندە رۆحی یە چارەسەرکەرەکە (پیاو بێت یان ژن) هەندێ فووئەکات و هەندێ دەس لێ دان بەکار ئەهێنێ و لەڕاستیش دا لەهۆش خۆی چووە ئەم ناوەندە.

ئەم ژن و مێردە چوونە لای ناوەندێکی رۆحی کاتێ چارەسەرکردن دەستی پێ کرد، رۆحی چارەسەرکەری جیهانی ئەثیری پێش ئەوەی دەست بکات بەچارەسەرکردن ووتی:

(پارش.. تۆخۆت باشترین ناوەندی رۆحی لەبەرئەوە ئەبێ خۆت هاوسەرەکەت چارەسەربکەی.

دیسانەوە پارش گاڵتەی ئەهات بەم قسانە.

لەبەرئەوە لەگەڵ هاوسەرەکەی گەڕانەوە بۆماڵەوە.

رۆژێك پارش بەتەنها لەباخچەکەیدا ئەبێت لەماڵەوە یەکێك دێتەلایەوەو ئەوەستێ: پارش لێ ی ئەپرسێ تۆکێ ی ناوت چی یە بۆچی هاتووی؟

ئەویش لەوەڵاما ئەڵێت: منم برا (ولیەم)**Brotherwilliam** ئەگەر باوەڕناکەی برۆ بۆنەخۆشخانەی پاشایەتی پرسیاربکە....

کاتێك پارش ئەڕوا بۆ نەخۆشخانەی پاشایەتی تەماشائەکات وێنەی ئەورۆحەی کەخۆی دیبووی لەماڵەوە ، لە نەخۆشخانەکەدا هەڵواسراوەو بۆی دەرکەوت ئەو پزیشکێکی بەناوبانگ بووە کاتی خۆی پێش کۆچکردنی بۆ جیهانی رۆحی لەو نەخۆشخانەیەدا خزمەتی کردووەو سەرۆکی نەخۆشخانەکەبووەو ئێستاش لەجیهانی رۆحیش دا خزمەت ئەکات.

پاشان پارش ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوەو خۆی ئەبێت بەناوەندێکی رۆحی لەنێوان هاوسەرەکەی و رۆحی ئەوپزیشکەدا کەزۆردەمێکە مردووە.

لەماوەی نۆمانگ دا بەهاوکاری رۆحی (برا: ولیەم) هاوسەرەکەی لەو نەخۆشی یە چاك ئەبێتەوە کەپزیشکەکان ئەیانووت پاش شەش مانگ ئەمرێت، لەبەرئەوە پارش واز لەفەرمانبەری ئەهێنێ و ئەبێت بەپزیشکی چارەسەرکەری رۆحی لەبەریتانیاو زۆر بەناوبانگ ئەبێت و پاشان هاوسەرەکەشی ئەبێت بەناوەندی رۆحی و بەهەردووکیانەوە خزمەتی مرۆڤایەتی ئەکەن.

پارش بێجگە لەچارەسەری رۆحی راستەوخۆ ئەتوانێ چارەسەری ناراستەوخۆ بکات....واتە لەدوورەوە.

ئەونەخۆشانەی کەلەدوورەوە چارەسەری کردوون وێنەی رۆحی پارشیان دیوە لەکاتی چارەسەرکردن دا.

پارش نەخۆشی زۆری چارەسەرکردووە لەم بابەتانە:

شێرپەنجە، سیل، شەکرە، ئیفلیجی منداڵان، کەڕی، کوێری، خەست بوونەوەی خوێن Thromb ophte bitis هەروەها روماتیزم، الذبحة الصدرية (نەرم بوون و خزانی فەقەرات بڕبڕەکان) ((الإنزلاق)) Spondylo listhesis .

هەروەها هەوکردنی مێشك Neuritis پارش داواکاری هیچ نەخۆشێك رەت ناکاتەوە ئەگەر هیوای چارەسەریشی نەبێت، بەڵام ئەو نەخۆشانەی فەرمانی پەروەردگاریان لەسەرە بۆمردن پارش ئەڵێ تەنها ئەوەندە ئەتوانم ئازاریان کەم بکەمەوە تاکوو جیابوونەوەی رۆحەکەیان لەلەشی فیزیاویان.

## رووداوێکی تریش

پزیشکێك تەمەنی لە٨٠ هەشتا ساڵ زیاتر دەبێ و تووشی نەخۆشی شەکرە دەبێت لەبرمودا Bermoda کە٣٠٠سێ هەزار میل لەلەندەوە دوورە، لەساڵی ١٩٣٦ز دا نامەیەك ئەنووسێ بۆ پارش داوای لێدەکا چارەسەری نەخۆشییەکەی بکات لەدوورەوە.

ئەم پزیشکە ناوی( واتلنجتون Dr. W.H. Watlington ) لە تەلاری مایلز لە هاملتون لە برمودا نیشتەجێ ئەبێت.

پارش نامەکەی پێ ئەگات و دەست ئەکات بە چارەسەرکردنی و چاکی ئەکاتەوە، لەلایەکی تریشەوە برایەکی هەمان پزیشکی نەخۆش، شەکرەی ئەبێت هەرلەخۆیەوە چاك ئەبێتەوە!!!. پارش ئەڵێ رۆحی چارەسەرکەر بەبێ ناوەند ئەویشی چاك کردوەتەوە.

هەروەها چارەسەرکەری رۆحی زۆرن و نەخۆشی زۆریان چاك کردوەتەوە.

## (هەندێ پرسیاری ناوەندەکانو وەڵام دانەوەیان لەلایەن رۆحەکانەوە لەجیهانە ئەثیرییەکاندا)

**پ: پرسیار** **و: وەڵام**

کاتێ ج . آرثر فندلای لەدانیشتنێکی رۆحی دا لەژووری ئامادەکردن بوو ناوەندی رۆحی ((سلۆن)) لەبەردەمی دا بوو دەستی بەدەستیی‌یەوەبوو پاش ۱۰دە دەقیقە سلۆن بێ هۆش بوو رووناکی یەکان کوژانەوە لەم کاتەدا رۆحێك بەناوی (جرینتری) بانگ ئەکاو ئەڵێ ئێوارەت باش فندلاي ئەمیش ئەڵێ ئێوارەت باش (جرینتری) دەنگت ناسیمەوە ئەوەی شایانی باسە فندلای پێشتر (جرینتری) ئەناسی و هاوڕێ ی بوو پێش مردنی بۆیە دەنگی ناسی یەوە!!!.

ئینجا فندلای دەستی کرد بەپرسیارکردن لەڕۆحی ناوبراو:

پ: پێخۆشحاڵم بەئامادەبوونت ئەمشەو ئەی هاوڕێم، ئایا ئەتوانی پێم بڵێ ی جیاوازی نووستنو بێ هۆشی چی یە؟

و: نووستنی ئاسایی پێویستی یەکی لەشی فیزیاوی یە کەپشووئەدات و بێ جووڵانەوە ئەبێت بێجگە لەدڵ کەبەردەوام لێ ئەدات. ئەمە نووستنی ئاسایی یە.

رۆح لەکاتی نوستن دا ئەو لەشە فیزیاوی یە بەجێ ئەهێڵێ. بەڵام لەهۆش چوون دا رۆح ئەملاو ئەولای لەشی فیزیاوی ئەکات و پەتێکی رۆحی ئەمێنێ لەنێوان لەشی فیزیاوی و لەشی رۆحی دا، ئەگەر ئەم پەتە بپچڕێ یەکسەر مردن رووئەدات.

پێش ئەوەی ئێمەی ئەثیری قسە لەگەڵ ئێوەبکەین بەهۆی ناوەندەکەتانەوە (سلۆن) پێویستە لەهۆش بچێ و رۆحی جیابێتەوە لەلەشی تەنها پەتی ژیان بمێنێ لەنێوان رۆحی ئەثیری و لەشی فیزیاوی دا.

(سلۆن) ئێستا رۆحی ئەوەتا لەنێوان تۆو لەشی دا پاشان بەئاسانی ئەم رۆحە ئەچێتەوە ناو لەشی ئەگەر لەم ماوەیەدا کارەساتێکی توندوتیژ روونەدات واتە هێمنی باشترە لەم کاتەدا.

هەرلەبەر ئەمەیە کەسێك خەوتبێت بمانەوێ بەخەبەری بکەینەوە ئەبێ بەهێواشی و لەسەرخۆ بانگی بکەین و بەخەبەری بکەینەوە. نووسەر

ئەگـەر توندوتیژی‌یـەك لـەم كاتـەدا رووبـدات ناوەندەكـە ئـەمرێت واتـە (سـلۆن) ئەمرێت.

هەروەكوو ئەبینین ئێستا من بەهۆی لەشی فیزیاوی ئەوەوە قسەتان لەگەڵ ئەكەم، من لێرەوە دەم ئەجووڵێنم دەمی (سلۆن) ئەجووڵێتەوە بۆئێوە چونكە من بەهۆی لەشی فیزیاوی ئەوەوە قسەتان لەگەڵ ئەكەم كەواتە ئەو رۆحەكەی لەدەرەوەی لەشیەتی من چوومەتە لەشی سلۆنەوەو دەمو قورگی بەكارئەهێنم لەكاتی قسەكردندا سلۆن ئێستا ئاگاداری هیچ نی یە و نازانێ ئێمە چی ئەڵێین. وەئێستا من بەهۆی لەشی سلۆنەوە وام لەگەڵتان.

((لێرەدا پرسیارەكان ئەوەستێنین))

لەكتێبی (حیاة محمد) (ﷺ) بەشی هەشتەم دكتۆر محمد حسنین هیكل پاشا داهاتووە:

لەكاتی نووستن دا رۆح لەلەش جیائەبێتەوەو چوونەدەرەوەیەكی كاتی یە ، بەڵام مردن چوونەدەرەوەیەكی هەمیشەیی یە و ناگەڕێتەوە هەروەكوو پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿اللَّهُ يَتَوَفَّى الْأَنْفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ الَّتِي قَضَى عَلَيْهَا الْمَوْتَ وَيُرْسِلُ الْأُخْرَى إِلَى أَجَلٍ مُسَمّىً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآياتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (الزمر:٤٢)

**شەوڕەوی ( معراج )**

چوونەدەرەوەی رۆح بوو لەلەشی فیزیاوی‌و جیابوونەوەی لەشی ئەثیری بوو بە ئەقڵ‌و رۆحی ئەثیری یەوە بەشێوەیەكی كاتی كەوابوو پێغەمبەر محمد (د.خ) لەشی فیزیاوی پیرۆزی نەچووەتە ئاسمانەكان بەڵام رۆحی پیرۆزی هەموو گەردوون گەڕاوەو لەنزیكەوە قسەی لەگەڵ پەروەردگار كردووەو هەرلەوشەوەدا لەماوەیەكی زۆركەم دا گەڕاوەتەوە بۆناولەشی فیزیاوی پیرۆزی، ئەوەی كەدی هەمووی راست بوو......

زانستی نوێ دانیناوە بەم راستی یەدا.

بەڵام ڕای زۆربەی زانایانی ئایینی ئەوەیە ڕۆح و لەشی پیرۆزی سەرکەوتوون بۆ ئاسمانەکان و ئەمەش بەفەرمانی پەروەردگاربووە، کەهەمووشتێك لەتوانای خۆی دایەو بناغەی موعجیزەکەش لەمەدایە.

تێبینی: ئەمەش ئەوەناگەیەنێ کەپێغەمبەرمان محمد (د.خ) خەوی دی بێت نەخێر بەفەرمانی پەروەردگار بانگ کراوە تەنها لەشی ئەثیری و ڕۆحی ئەثیری و ئەقڵی ئەثیری توانای ئەو ڕۆیشتنەیان هەیە بەڵام ئەگەر پەروەردگار ڕەزامەندی لەسەربێت لەشی فیزیاویش سەرئەخات لە ئەثیر خێراترو چاك تر.

ئێستا با بزانین پرسیاری دووەمی فندلای چی یە لەڕۆحی جرینتری

پ: ئایا بەئاسانی گوێت لێمە؟

و: بەڵێ گوێم لێتە.....بەڵام ئەوەی من بەتۆی ئەڵێم خۆم گوێم لێ ی نی یە و نایبیستمەوە.

پ: ئایا ئەتوانن هۆیەکی تر دروست بکەن بۆ پەیوەندی کردن بەئێمەوە بەبێ ناوەند؟

و: بەڵێ: ئەبێ لەسەرزەوی ئامێرێك دروست بکەن لەمادەیەك لەڕینەوەکانی جیهانی ئەثیری وەرگرێت هەروەکوو دروستتان کردووە لەڕینەوەکانی سەرەوەی زەوی لەهەواداو بەرزتریش وەرئەگرێ بەڵام ئەوئامێرە کەدروست نەکراوە هەوڵ بدەن دروستی بکەن..چونکە ئەبێ ئێوە دروستی بکەن نەك ئێمە لەبەرئەوە ئێمە لەڕینەوەی خۆمان نزم ئەکەینەوە، پێویستە ئێوە لەڕینەوەی خۆتان بەرزبکەنەوە، تاکوو بەیەك ئەگەین و پەیوەندیئەکەین بەیەکەوەو قسە لەگەڵ یەکتر ئەکەین بەئاسانی و بەبێ ناوەند.

# (لێرەدا دیسانەوە پرسیار ئەوەستێنین)

تـاکوو بـەکورتی باسـێکی زانـای بـەناوبانگ ((ئەدیـسۆن ))بکـەین داهێنـەری بەناوبانگی بەریتانی ((ئەدیسۆن)):

زۆر هەوڵیدا ئامێرێك دروست بکات بۆ پەیوەندی کردن بەڕۆحەکانەوە، بەڵام پێش ئەوەی ئاواتەکەی بێتەدی کۆچی دوایی کرد.

لەکتێبی ((رووداوەکانی ژووری ئامادەکردنی رۆحەکان))

باسی ئەوەئەکات کەجارێکیان رۆحی ئەدیسۆن گەڕاوەتەوەو قسەی کردووە لەم بارەیەوە بەدەنگی خۆی بەهۆی ناوەندێکەوە.

ئێستاش ئەگەڕێینەوە سەرپرسیارەکانی فندلای لەڕۆحی (جرینتری)

پ: ناوەند چۆن دەنگی ئێوە ئەگەیەنێ بەئێمە؟

و:هەروەکو ووتم ئێمـەی رۆح ئەچینە لەشـی فیزیـاوی ناوەنـدەوە بـەهۆی زۆری مادەی ئەکتۆپلازمەکەیەوەو کاریش ئەکەینە سەرئەقڵی.

پ:ئەگەر من هاتم بۆ جیهانی ئەثیریو رۆحی ئێوە لەوێ چی بکەم؟

و: کردەوەی خۆت جێگەی خۆت دیاری ئەکات.

پ:کاتێ قسەمان لەگەڵ ئەکەن لەرینەوەکانتان نزم ئەکەنەوە؟

و:کاتێ ئەڵێن حاڵەتی زەوی وەرئەگرین لەرینەوەکانمان هێواش ئەکەینەوە.

پ:چۆن لەرینەوەکانتان نزم یان هێواش ئەکەنەوە.

و:ئـەم کـارە زۆرگرانــە چـونکە ئێـوە پــێ ی هەڵئەســن لەســەر زەوی ئـەویش ئامـادەکردنی ژوورو ناوەنـدەو بـەهۆی ئـەکتۆپلازمی ناوەندەکـەوە ئـەتوانین خۆمـان بگەیەنین بەئێوەو کەئەمەش هاتەدی وائەزانین دانیشتوانی سەرزەوین.

پ: ئێستا کەقسە لەگەڵ ئێمەئەکەن هەست بە چی ئەکەن.

و: پێمـان خۆشـە لـەئێوە زیـاترکـە پێتـان خۆشـە، واهەسـت ئەکـەین ئێـستا لەسەرزەوین.

پ:ئێوە چۆن ئەزانن ئێمە ئەمانەوێ قسەتان لەگەڵ بکەین؟

و: کاتیٚ ئێوە کۆئەبنەوە لەژووری ئامادەکردن و ناوەند لەهۆش خۆی ئەچیٚ هەوای ئێمە ئەلەرێتەوەو ئێمەش خۆمان ئەزانین و ئامادەئەبین بۆ قسەکردن لەگەڵتان...(هەروەکوو زەنگی تەلەفۆن لیٚ بدات یان مۆبایل)

((لێرەدا ج.آرثر. فندلای بەم شێوەیەی خوارەوە کۆتایی بەقسەکانی خۆی ئەهێنیٚ))

(بەم شێوەیە لەم دانیشتنەدا قسەم لەگەڵ چەند ڕۆحێك کرد هەروەها لەگەڵ رۆحی باوکم، دەنگی هەموویانم ناسی و نهێنی زۆرهەبوو کاتیٚ لە ژیانا بوون لێم پرسین بەڕاستی وەڵامیان دامەوە، ئەم کارە مەزنە بەهۆی ناوەند (سلۆن)ەوە توانیم ئەنجامی بدەم.

هەروەها بۆم دەرکەوت ئەم ناوەندە، ئادەمیزادێکی راست گۆیەو هیچ فڕوفێڵێك بەدی ناکریٚ نەلەخۆی و نە لە ژووری ئامادەکردنەکەی.

ئەگەر فڕوفێڵ بوایە کیٚ ئەتوانیٚ دەنگی بگۆڕیٚ بەشێوەی دەنگی خەڵکێکی زۆرو هەندێکیان نەناسراو کە هەرگیز دەنگی نەبیستوون و هەروەها کیٚ هەیە نهێنی هەموو کەسێك بزانیٚ بەتایبەتی نهێنی نێوان کوڕ و باوك.

لەبەرئەوە دڵنیابووم و بۆم دەرکەوت ژیان هەتا هەتایی یە ئەوەی پیٚ ی ئەڵێن مردن فڕیٚ دانی بەرگێکی فیزیاوی یە هەروەکو و کراسە کۆنەیەك لائەبەی و کراسێکی نویٚ لەبەرئەکەیتەوە.

ئەم لەشە فیزیاوی یە لەشێکی ئەثیری زۆر پێش کەوتووی لیٚ ئەچێتە دەرەوە!!

ژیان لەو جیهانە ئەثیری یە دیسانەوە ئەگۆڕیٚ و بەرەو پێشەوە ئەڕوات و رۆحەکان بەرزئەبنەوە بۆ پلەیەکی تر).

لێرەدا ئەوەمان بۆدەرئەکەویٚ لەجیهانی فیزیاوی ئەڕۆینە جیهانی ئەثیری (جیهانی بەرزەخ) و پاشان بۆ جیهانی هەستانەوەی یەکجاری (یوم القیامة)

**بڕوانە وێنەی ژمارە ( ٢٧ ) - آرثر فندلای -**

کەوابوو پێویستە خواناسان زیاتر دڵنیابن کەلەسەر راستین هیواداریین ئەوانەی راستیان لا ئاشکرا نی یە بیربکەنەوەو ڕیٚ ی راست بگرنەبەرو بەگوێرەی زانستی

رۆحی و زانستی فیزیاوی راستی یەکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام لێك بدەنەوە ئەوسا ئەزانن ئادەمیزاد بۆچی دروست کراوە.

﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْأِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ (الذريات:٥٦)

واتە: ئادەمیزادو جنۆکەمان بۆ خواپەرستی و پەروەردگارناسین دروست کرد.

لێرەدا پرسیارێك ئەکەین: ئایا ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەزارو چوارسەد ساڵ زیاترە باسی مردن و زیندووبوونەوە ئەکات و ئەڵێ دوای مردن رۆحەکان ئەچنە جیهانی (بەرزەخ) تاکوو رۆژی هەستانەوەو لێپرسینەوەی یەکجاری هیچ گومانێك و جیاوازی یەکی هەیە لەگەڵ زانستی نوێ و زانستی رۆحی لەم بارەیەوە؟

بێ گومان هەردوو زانستەکەی تر سوودیان لەزانستی ئاینی یەوە وەرگرتووە بەتایبەتی قورئانی پیرۆز.

گومانی تێدا نی یە هێشتا زۆربەی زانستی قورئانی زاناکان ئەیزانن بەڵام بڵاوی ناکەنەوەو لەگەڵ شێوە زانستی یە فیزیاوی یان رۆحی یەکەدا بەراوردی ناکەن. لەبەرهەندێ هۆی تایبەتی و بەرژەوەندی خۆیان.

کەوابوو ئەوانەی وان لەخەوی بێداری دا لەخەو هەستن و راپەڕن و رووبکەنە پەروەردگار و رێگەی راستی ئیسلام بگرنەبەر. وە ئیتر پێویست ناکات ئەو گومڕایانە باسی هەست پێکردن بکەن و بڵێن هەرچی هەستی پێ نەکرێ باوەڕمان پێ ی نی یە چونکە ئەم قسەیە هەڵەیەو هەڵەیەکی زۆر گەورەیە.

ئەوەتا بەزانستی ئاینی و رۆحی و فیزیاوی بۆمان روون بوویەوەو ئاشکرابوو رۆح نابینرێ و هەستی پێ ناکرێ.... لەجیهانێکی نەبینراوو هەست پێ نەکراوەوە هاتووەو ئەگەڕێتەوە بۆ جیهانێکی نەبینراوو هەست پێ نەکراو. واتە شوێنی یەکەمجاری خۆی.



وێنەی ژمارە ( ٢٧ ) أرثر فندلای

## بابەتی ( حوکمی ئەوەی کەناو نراوە بەزانستی ئامادەکردنی ڕۆح )

لەکتێبی (مجموع فتاوی) لەبەرگی سێیەم دا کەخوا لێی خۆش بوو (عبدالعزیز عبدالله کوڕی عبدالرحمن کوڕی باز) نوسیویەتی کە دەڵێ زانستی ئامادەکردنی ڕۆح کەئەمە زانستێکی بەتاڵەو کارێکی درۆی شەیتانیە، بەم جۆرە قسە بەتاڵانە دەیانەوێ بیرو باوەڕو ڕەوشتی موسوڵمانان خراپ بکەن و لە خشتەیان بەرن و بانگەشەی زانینی (غەیب و نەبینراو نەزانراو دەکەن) لەبەر ئەوە دەبێ ئەوە بڵێم:

بێگومان ئەم باس و پرسیارە هەروەکو پرسیارەکانی تر بەگوێرەی قورئانی پیرۆزو سوننەتەکانی پێغەمبەرمان (محمد) (ﷺ) وەلاّم بدەمەوە.

کەوا بوو ئەوەی راست و سەلمێنراو بوو بە قورئان و سوننەت ئێمەش بەڕاست و دروستی دەزانین و پەسەندە لامان و ئەوەی بە ناڕاست باسکرابوو لای ئێمەش ڕاست نیەو فەراموّشی دەکەین.

هەروەکو پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللَّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً﴾. (النساء ٥٩).

زانستی رۆحی یان مەسەلەی رۆح مەسەلەیەکی نهێنی و نادیارە (غەیبیە) کەس نایزانێ تەنها پەروەردگار نەبێت و باسکردنی دەبێت بەشەریعەتی ئیسلامی باسی بکەین.

هەروەکو لەقورئانی پیرۆزدا فەرمووتی:

﴿عَالِمُ الْغَيْبِ فَلا يُظْهِرُ عَلَى غَيْبِهِ أَحَدًا (٢٦) إِلاَّ مَنِ ارْتَضَى مِن رَّسُولٍ فَإِنَّهُ يَسْلُكُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ رَصَدًا﴾. (الجن ٢٦-٢٧).

هەروەها لەسورەتی (النمل) دا فەرموویەتی:

﴿قُل لاَّ يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ الْغَيْبَ إِلاَّ اللَّهُ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ﴾ (النمل ٦٥)

هەروەها لەسورەتی (الاسراء) دا فەرموویەتی:

﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً﴾.(الاسراء ٨٥)

زانایانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام لەسەر ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕای جیاوازیان هەیە، هەندێکیان دەڵێن ڕۆح ئەو گیانەیە کە لە لەشەکاندایە لەبەر ئەوە رۆح فەرمانی پەروەردگاریەو هیچ کەس نهێنی یەکەی نازانێ تەنها ئەوەی نەبێت کەپەروەردگار ئاماژەی پێداوە.

کەوابوو دەبیٚ ئەوە بزانین بە گوێرەی فەرموودەکانی پەروەردگار لە قورئان و فەرمووده ڕاستەکانی پێشەوامان محمد (ﷺ) کە ڕۆح دوای مردنی لەش دەمێنیٚ، ئەمەش بەفەرموودەی پەروەردگارمان کەلە سورەتی (الزمر) فەرموویەتی:

﴿اللَّهُ يَتَوَفَّى الأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ الَّتِي قَضَى عَلَيْهَا الْمَوْتَ وَيُرْسِلُ الأُخْرَى إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾(الزمر ٤٢).

هەروەها پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) قسەی کردووە لەگەڵ ٢٤ کوژراوی ناوداری قورەیشی یەکاندا کەبۆنیان کردبوو بەناوی خۆیانەوەو باوکیانەوە بانگی دەکردن و دەیفەرموو:

ئایا ئەوەی پەروەردگار پەیمانی پێدابوون بینیتان، وا ئێمە ئەوەی کە پەروەردگارمان پەیمانی پێدابووین بەڕاستی دیمان و چاومان پێی کەوت، لەم کاتەدا گەورەمان عومەر فەرمووی (ئەی پێغەمبەری پەروەردگار قسە لەگەڵ ئەو لاشانەدا دەکەی کەبێگیانن یان رۆحیان تێدانی؟).

پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرمووی: بەوەی کە رۆحی محمدی بەدەستە ئەوەی پێیان دەڵێم گوێیان لێیە، بەڵام ناتوانن وەڵام بدەنەوە.

هەروەها فەرموویەتی: دوای ناشتنی مردوو، ئامادەبوان بەجێی دەهێڵن و دەڕۆنەوە، مردووەکە لەناو گۆڕەکەیدا گوێی لەدەنگی پێی ڕۆشتنەوەیان دەبێت.

زانای بەناوبانگ و پایەبەرز (إبن قيم الجوزي) خوا لێی ڕازی بێت.

فەرموویەتی:

مردوو دەزانیٚ بەسەردانی زیندوو بۆسەر قەبرەکەی و پێی خۆشە، ئەمەش ڕای (پێشینان–السلف)ی لەسەرە.

هەروەها ئەم زانایە فەرموویەتی: ابن عباس "خوا لێی ڕازی بێت"

دەربارەی فەرموودەی پەروەردگار لەسورەتی (الزمر) دا فەرموویەتی:

﴿اللَّهُ يَتَوَفَّى الأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ الَّتِي قَضَى عَلَيْهَا الْمَوْتَ وَيُرْسِلُ الأُخْرَى إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ (الزمر ٤٢).

پێی وتم: ڕۆحی مردووەکان لەگەڵ ڕۆحی زیندووەکان لەخەودا بەیەك دەگەن و زیندوو مردوو دەبینێ، لەخەودا مردوو هەندێ هەواڵ ئەدا بەزیندوو، زۆرجاریش بەڕاست دەردەچێ، پەروەردگاریش ڕۆحی مردووەکان دەهێڵێتەوەو ڕۆحی زیندووەکان دەنێرێتەوە بۆناو لەشەکانیان.

ئەمەش وایکردووە (پێشینان –السلف) ڕایان لەسەر ئەوەیە ڕۆحی مردووەکان دەمێنێ و نافەوتێ، بەڵام نەسەلمێنراوە کە دەتوانێ پەیوەندی بکەن بەزیندووەکانەوە، لەبەر ئەوە ڕاست نیە کە هەندێ لە زانایانی ڕۆح و پەیمانگا ڕۆحیەکان دەڵێن: ( ڕۆح ئامادە دەکەن و قسەیان لەگەڵ دەکەن و دەنگ و باسی جیهانی ڕۆحیان لێ دەپرسی و ئەوانیش وەڵامیان دەدەنەوە) ئەمە ڕای ئاینی ئیسلامە بەڕاستی و بێ پێچ و پەنا، واتا بەڕاشکاوی.

تەنها پەروەردگار خۆی دەزانێ ڕۆحەکان لە کوێن و چی دەکەن و کەی دەیانگەڕێنێتەوە بۆ ناو لەشەکانیان.

هەرکەسێ ڕایەکی تری هەبێت لە ئیسلامدا پەسەند نییە.

ئەوانەی باس لە ئامادەکردن و قسەکردن لەگەڵ ڕۆحەکان دەکەن لەبەر ئەوەیە هەندێ دەستکەوتی ئابووریان دەستکەوێ یان هێزی خۆیان بنوێنن لەم بوارەو (بڵێن هیچ کەسێکی تر ناتوانێت کاری وا بکات).

ئەوانەی کە دەتوانن قسە بکەن لەگەڵ ڕۆحەکان و ئامادەیان بکەن ئەوە ڕۆحی جنۆکەو شەیتانۆکەکانن هەردەم وان لە خزمەتیاندان.

پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نِبِيٍّ عَدُوًّا شَيَاطِينَ الإِنسِ وَالْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُورًا وَلَوْ شَاء رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ (١١٢) وَلِتَصْغَى إِلَيْهِ أَفْئِدَةُ الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِالآخِرَةِ وَلِيَرْضَوْهُ وَلِيَقْتَرِفُواْ مَا هُم مُّقْتَرِفُونَ﴾. (الانعام ١١٢–١١٣)

هەروەها لەهەمان سورەت و ئایەتی (١٢٨)

﴿وَيَوْمَ يِحْشُرُهُمْ جَمِيعًا يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ قَدِ اسْتَكْثَرْتُم مِّنَ الإِنسِ وَقَالَ أَوْلِيَآؤُهُم مِّنَ الإِنسِ رَبَّنَا اسْتَمْتَعَ بَعْضُنَا بِبَعْضٍ وَبَلَغْنَا أَجَلَنَا الَّذِيَ أَجَّلْتَ لَنَا قَالَ النَّارُ مَثْوَاكُمْ خَالِدِينَ فِيهَا إِلاَّ مَا شَاء اللّهُ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَليمٌ﴾ .(الانعام ١٢٨)

بەكورتی نزیك بوونەوە لە جنۆكەو شەیتانۆكەكان و پەنابردن بۆیان و قسەكردن لەگەڵیان لەلایەن فاڵچی و ساحرەكانەوە شەرعەن حەرامەو گوناهەو بەشێكە لەكوفر هەروەكو پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) فەرموویەتی:

(من أتى عرافاً فسأله عن شيء لم تقبل له صلاة أربعين ليلة) واتە: ئەوەی چووە لای فاڵچی و پرسیاری لێكرد دەربارەی هەرچی شتێكەوە بێت، چل شەو نوێژی قبوڵ نییە.

هەروەها چەند فەرموودەیەكی تری پێغەمبەرمان لەم بارەیەوە هەیە.

چونكە فەرموویەتی: (باوەڕكردن بەوانە حەرامەو گوناهەو بەتاڵە بەهیچ شێوەیەك نابێت پرسیاریان لێ بكەین، لەبەر ئەوەی ئەمانە واخۆیان پیشان دەدەن كە (نهێنی زانن واتە غەیب زانن) پەروەردگار لەسورەتی (النمل ٦٥) دا فەرموویەتی:

﴿قل لایعلم من في السماوات والارض الغیب الا الله...........﴾

زۆرجار ڕێك دەكەوێ بۆ جنۆكەو شەیتانۆكەكان رۆحی ئەو مردووە بناسن و ئاگاداری هەڵس وكەوتی بووبن لەژیان لەبەر ئەوە هەندێ هەواڵی راستی ئەدەن بەفاڵچی و ساحر لەبارەیەوە.

لەبەر ئەوە پێویستە باوەڕیان پێ نەكەین و پرسیاریشیان لێ نەكەین، چونكە باوەڕكردن بەوانە بەشێكە لە كوفرو دەبێت بەشیرك (نعوذ بالله)

لیژنەی هەمیشەیی باسی زانستی و فەتواكان لەخانەی فەتوای وڵاتی عەرەبی سعودی فەتوای داوە دەربارەی نوستنی موگناتیسی (التنویم المغناطیسی) كە جۆرێكە لە ئامادەكردنی ڕۆحەكان بەم شێوەیەی خوارەوە.

نوستنی موگناتیسی جۆرێكە لەجۆرەكانی سحرو چاوبەسی كردن، چونكە ئەو فاڵچییە جنۆكەیەك بەكاردەهێنێ بەناوی كەسە نوستووەكەوە قسە دەكات واتە ئەوەی

نوستووه ئاگاداری هیچ نی یه و جنۆکەکە ڕانومایی دەکات، ئەگەر ڕاستگۆ قسەی کردو زانیاریدا بەکەسە نوستووەکە، هەندیٚ شتی ڕاستی دەڵێت، بەڵام هەندیٚ فاڵچی ئەمە بەکادەهێنن بۆ دۆزینەوەی شتی دزراو یان چارەسەری هەندیٚ نەخۆشی لەبەر ئەوە ئەمە پەنابردنە بەغەیری پەروەردگار بۆ چارەسەری کێشەکان و بەشرك دادەنریٚ.

دکتۆر محمد محمد حسین لە کتێبەکەیدا (الروحية الحديثة حقيقتها وأهدافها) دەڵیٚ: من یەکێك بووم لەوانەی بەم سحرو فاڵ و درۆیانە باوەڕم هەبوو، بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ، بەڵام پەروەردگار هیدایەتی دام و ڕاستیم بۆ دەرکەوت و زانیم ئەوانە هەمووی قسەی ناڕاستن.

هەروەها دەڵیٚ: ئەوانە کەخەریکی ئامادەکردنی ڕۆحەکانن چەند جۆرێکن هەندێکیان فنجانێك یان جامێك یان پەرداخێك بەکاردەهێنن و لەسەر مێزێك وێنەی پیتەکان نوسراوە ئەم جامە یان فنجانە دەهێن و ئەبەن لەنێوان پیتەکانداو لەخۆیانەوە ڕستەیان پیٚ دروست دەکەن و دەیکەن بەوەڵام بۆ خەڵك.

هەندێکیان سەبەتەیەکی بچووك و قەڵەمێکی لەلایەکی هەڵواسراوەو بەقسەی خۆیان ئەو قەڵەمە لەناو سەبەتەکەدا لەلایەن ڕۆحەکانەوە، وەڵامی پرسیارو کێشەی خەڵکی پیٚ دەنوسنەوە.

هەندێکیشیان ناوەند بەکاردەهێنن وەکو ناوەندی نوستنی موگناتیسی.

هەروەها دەڵیٚ ئەم فاڵچی و ساحیرانە کەسانێك بەکاردەهێنن بۆ بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە بۆیان و هەوڵیش دەدەن لەلایەن کەسانێکی ترەوە زانیاری لەخەڵك وەرگرن و دەربارەی ئێستاو ڕابردوویان شت بزانن لەبەر ئەوە ئەمە شتێکە پێچەوانەی ئاینی ئیسلامە تەنیا لەکاتی فیرعەونەکان و کاتی نەفامی (الجاهلية) دا هەبووە.

هەندێکیش لەم ڕێگەیەوە سەرەخۆشی خۆیان یان کەسانێکی تریان کردووە کە خۆشەویستیان لەدەست داوە.

هەروەکو (اولیفر لودج) کەلە جەنگی جیهانی یەکەمدا کوڕەکەی کوژرا یان گوم بوو.

یان دامەزرێنەری "دامەزراوەی رۆحی" لە میسر (أحمد فهمي ابو الخير) کەلەساڵی ۱۹۳۷ ئەو کوڕەی کەدوای چاوەڕوانیەکی زۆر بوو بووی مرد.

لەڕێی فنجان و پیتەکانەوە هەوڵی زۆریدا بۆ پەیوەندی ڕۆحی، بەلاّم سەرکەوتوو نەبوو، هەروەها لەڕێی بەکارهێنانی ناوەندەوە هەوڵیدا نەگەیشتە ئامانج.

کەوابوو ئەمانە چەند هەوڵێکی ڕوخێنەرن و سحرو فڕوفێڵ بەکاردەهێنن بۆ ڕووخاندنی ئاینەکان.

خوالێخۆشبوو نوسەری کتێبی (مجموع فتاوى) لەبەرگی سێهەم دەڵێ: ئەوانەی ئەو کارانە دەکەن پێغەمبەران بەناوەند ناو دەبەن، هەروەکو یەکێکی گەورەیان (أرثر فندلای) کە چەند کتێبێکی لەسەر ئەم بابەتە نوسیووە وەکو (على حافة العالم الاثيري) کە دەڵێ: پێغەمبەران ناوەندی رۆحی بوون هەروەکو ناوەندی ئامادەکردنی ڕۆحەکان لە هۆدەکانی ئامادەکردندا.

دکتۆر محمد محمد حسين دەڵێت: ئەگەر یەکێك لەم ناوەندانە سەرکەوتوو نەبوو لەئامادە کردنی رۆحدا ئەوە دەڵێن ناوەندەکە سەرکەوتوو نەبوو، یان دەڵێن ئامادەبوان ڕێك و پێك نەبوون،.... یان چەند بیانوویەکی تر، هەروەها بەردەوامەو دەڵێ: هەندێك کەم بەناو زانایانەی ڕۆح دەڵێن (جوبرەئیل) "سەلامی خوای لێبێت" ئامادەبوو لە دانیشتنەکانیاندا .

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە نوستنی موگناتیسی کارێکی نادروست و ناڕاستەو پێغەمبەرمان محمد (ﷺ) زۆرجار دژی ئەمانە فەرموودەی هەیەو بەفێڵبازو چاوبەسیان باس دەکات لەبەر ئەمە لەولاّتانی ئیسلامیدا پێویستە لەسەر دەسەلاّت و ڕاگەیاندنەکان سزای ئەوانە بدەن ئەم کارانە دەکەن و زانایانی ئاینی ڕۆڵی خۆیان ببینن لە ڕێنمایی کردنی موسوڵمانان لەم بوارەدا، سەڵەوات و سەلام لە پێغەمبەرمان).

ئەمە باسێکی گرنگ بوو وەك زانیاریەك و فتوایەك کەلەلایەن زانای ئەم سەردەمەمان (عەبدولعەزیز بن باز) کە لە کتێبی (مجموع فتاوى) بەرگی سێیەم لاپەڕەی (۳۰۹-۳۱٦) چاپی چوارەم ساڵی ۱٤۲۳ کۆچی کە لە ڕیاز چاپ بووە.

# (لەکوێ وە هاتین و بۆ کوێ دەچین)؟

**زۆرکەس ئەم پرسیارە ئەکات و ئەڵێ:**

**من بۆچی لەم جیهانەدام، ئەمە مانای چی‌یەو بۆچی هاتوومەتە ئێرە؟**

**ئایا بەرەو کوێ ئەڕۆم؟**

لە ڕاستی دا ئەقڵ بیر دروست ئەکات، هەرچی بیربکاتەوە پیرۆزە. ئەقڵیش لەئەزەلەوە هاتووەو ئەزەلیش سەرچاوەکەی لای پەروەردگارە... کەوابوو (بیر) تاکە ڕاستی‌یەو بەردەوامی یە..... بە بیرکردنەوە گەردوون ئەبینین.

ئەگەر بەبەردەوام بیربکەینەوە زۆرشتمان بۆ روون ئەبێتەوە و ئەقڵ و بیرمان بەردەوامە هەتا هەتایەو مردن لەناوی نابات، گەردوونیش بە ئەقڵ و بیر دامەزراوە و سەرچاوەکەی لای پەروەردگارە... کەوابوو بەبێ ئەقڵ و بیر گەردوون نی یە.

بوونمان مانای ئەوەناگەیەنێ ئەوماوە کەمەیە لەنێوان لەدایك بوونمان و مردنمان دایە، بەڵکوو ئێمە ئەقڵ و بیرمان هەیەو ئەمانە هەرگیز نافەوتێن و بەردەوامن لەبوون دا. بوون = الوجود.

هەروەها بیرمان بەردەوام ئەمێنێ و هەست بەوهەموو ڕووداوانە ئەکەین لەدەوروبەرمان دا ڕووئەدات بەڵام ئەوشتانەی لەوماوەکەمەی ژیان لەسەرزەوی هەستی پێئەکەین ئەگۆڕێن کاتێ لەشی فیزیاویمان جیائەبێتەوە لەلەشی ئەثیریمان ئەم گۆڕان کاری‌یەش کارئەکاتەسەر بیروهۆشمان.

بەبێ‌بیر گەردوون نی‌یە، هەروەها بەبێ ئەقڵ گەردوون نی‌یە هەروەها گەردونیش نابێت ئەگەر ئەوشتانەو ئەو ڕووداوانەی تێدانەبێت کەکارئەکەنەسەر بیرو ئەقڵمان.

کەوابوو دووشێوە یان دووحاڵەتی لەرینەوە هەیە یەکەمیان فیزیاوی‌یەو کارئەکاتەسەر بیروئەقڵمان پێی ئەڵێن مادە مادە لەگەردوون دا تەنها فیزیاوی و هەست پێکراو نی‌یە بەڵکو زۆر جۆرە مادە لەگەردوون دا هەیە چونکە مادە تەنها زەوی ناگرێتەوە بەڵکو ئەو جۆرە لەرینەوانە ئەگرێتەوە لەگەردوون دا هەیەو ((لەرینەوە = إهتزاز))

بەشـێوەیەکی جیـاواز ئـەو لەرینەوانـە ئەگرێتـەوەکار ئەکەنـە سـەرئەقڵ و – وای لێ ئەکەن ئەو وێنانە دروست بکات کەپێ ی ئەڵێن (بیروهۆش).

لەوانەیە ئەمە هەندێ شاراوەبێت و تێ گەیشتنی گران بێت لای زۆرکەس.

راستە لێ ی تێ ناگەین تاکوو بیرنەکەینەوە بە ڕێنومایی لەرینەوەکان.......چۆن؟

گـەردوون لـە لەرینـەوە پلـەجیاوازەکان پێکهـاتووە خێراتـرین مـاوەی لەرینـەوە لەگەردوون دا (ئەقڵە) ئەگـەر لەئەقڵـەوە بـەرەو خـوار بـڕۆین ئەگەینـە مادەی فیزیـاوی کەلەرینەوەکانی زۆر هێواش و لەسەرخۆیە، هەرچەندە زاناکان بەئامێری تایبەت بۆیان دەرکـەوتووە لەرینـەوەی هێـواش ترهەیـە لەلەرینـەوەکانی مـادەی فیزیـاوی ئـەویش شـەپۆلی گـەرمایی تاریـك و شـەپۆلی کارەبـایی درێـژە...هـەروەکوو وتمـان ئـەقڵ بـەرزترین و خێراتـرین لەرینەوەیـە. کەبـەرگێکی ئـەثیری هەیـەو ماوەیـەکیش بـەرگی فیزیاوی هەیـە (واتـە مـاوەی ژیـان لەسـەر زەوی) کـەوابوو ئـەقڵ کێلانێکـی فیزیـاوی هەیەو پاشان لەناو کێلانێکی ئەثیری دایەو دوورنی یە ئەقڵ لەناوچەند کێلانێکـی تـر دا نەبێت واتە چەند کێلانێکی تری نەبێت. (کـێلان = بـەرگی دەمـی خـەنجـەر بـۆ ئـەوەی بیپارێزێ و خراپ نەبێ)

لـەمردن دا کێلانـی فیزیـاوی فـڕێ ئـەدرێ و ئـەمێنێ کێلانـی ئـەثیری لەشـی ئـەثیری ڕێکی لەشی فیزیـاوی یـە و کـەم و زۆری تێـدانی یـە و جیـاوازی نـی یـە بـەهیچ جۆرێك ئەوەنـەبێت کەئـەمیان مـادەی فیزیـاوی یـە و ئـەویان مادەی ئـەثیری یـە. هـەردووکیان بەهەمان شێوە کارئەکەن.

کاتێ ئەمرین و لەناو لەشی فیزیاوی ئەچینە دەرەوە ئیتر هەست بەمادەی فیزیـاوی ناکەین هەروەکو چۆن ئێستا هەست بەمادەی ئەثیری ناکەین.

کـاتێ ڕۆیـشتینە جیهـانی ئـەثیری یـەوە هەسـت بەلەرینـەوەکانی ئـەثیر ئەکـەین و ئەوژیانە ئەثیری یە پێ ی ئەوترێ ژیانی سەروو یان (بەرزن) واتە ژیانی (بەرزەخ).

زاناکان ئەڵێن لە جیهانی ئەثیری دا گـۆڕانێکی تـریش هەیـە لـەو بـەرزترەو لەوانەیـە چەند گۆڕانێکی تـریش هـەبێت بەلەرینـەوەی جیـاواز واتـە لـە جیهـانی بەرزەخـەوە بـۆ

زیندووبونەوەی یەکجاری بە گوێرەی ئاینی ئیسلام لەوێشەوە بۆ حەشر و لەوێوە بۆ بەهەشت یان دۆزەخ .

﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَإِذَا هُمْ مِنَ الْأَجْدَاثِ إِلَى رَبِّهِمْ يَنْسِلُونَ﴾ (یّس:٥١)

زانایانی ڕۆحی و زانستی ئەڵێن : بوونمان لە جیهانی ئەثیری دا ئەگۆڕیٚ بۆ چەند جیهانێکی تر بەلاٚم نازانین وەکو ئاینی ئیسلام و قورئانی پیرۆز ڕوونی بکەینەوە :

هەروەها ئەڵێن : کاتێك دێت جیهانە ئەثیری یەکان بە دەوری زەوی دا هەر حەوتیان نامێنن و ئەچنە پلەیەکی نویٚ کە لەرینەوەکانی زۆر زۆر خێراترەو کۆتایی بە زەوی و جیهانە ئەثیری یەکان ئەهێنیٚ .

﴿وَالْمَلَكُ عَلَى أَرْجَائِهَا وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَانِيَةٌ﴾ (الحاقه:١٧)

واتە: عەرش لەسەر هەشت ئاسمانی ئەثیری وەستاوە لەو ڕۆژەدا واتە لە ڕۆژی دوایدا ئاسمانە ئەثیری یەکان ئەبن بە هەشت ئاسمانی ئەثیری بە زەوی یەوە .

لەشی فیزیاوی بریتی یە لە تۆڕێك بە ئەلەکتۆرن و پرۆتۆن چنراوە ئەوەی لە نێوانیاندایە بۆشایی یە ، ئەگەر ئەو بۆشایی یە نەمێنیٚ هەموو ئەلەکترۆنەکان و پرۆتۆنەکان لەلەشدا ئەنووسێن بە یەکتردا و تەنها خاڵێك ئەمێنێتەوە کە بە نووکی قەڵەم دیاری ئەکرێت لەو هەموو لەشە فیزیاوی یە گەورەیەمان ، کەوابوو لەشمان زۆربەی بۆشایی یە ...بەڵیٚ بۆشایی یە لە نێوان ئەلەکتۆرنەکان و پرۆتۆنەکاندا ...

گەردوونیش هەروایە زۆربەی زۆری لە بۆشایی پێك هاتووە ، لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە

ئایا ئەو بۆشایی یە زۆرەی لەلەشدایە و ئەو بۆشایی یە هەرە زۆرەی لە گەردووندایە بەچی پڕ بووەتەوە ؟

هیچ گومانی تێدا نی یە بێجگە لەتەنە فیزیاوی یەکان واتە لەرینەوە نزمەکان ، لەرینەوەی خێراتری تێدایە ، کەوابوو شەپۆلی خێراتری تێدایە وەکو شەپۆلە ڕووناکی یەکان، شەپۆلە موگناتیسی یەکان، شەپۆلە کارەبایی یەکان، شەپۆلە ڕادیۆوی یەکان، شەپۆلە ئەثیری یەکان، ئەو شەپۆلانەی هێشتا زانست هیچی لیٚ نازانێت ، هەموو خانەیەکی فیزیاوی بەرامبەری خانەیەکی ئەثیری هەیە کەوابوو هەموو لەشێکی

فیزیاوی لەگەڵ خۆی شێوە هەڵمێکی نەبینراو هەیە ئەویش لەشە ئەثیری یەکەیەتی لەهەموو جوڵانەوەیەك و لەهەموو شوێنێکدا لەگەڵی دایە هەموو زیندەوەرێك ئەو لەشە ئەثیری یەی هەیە بەلاّم بە پلەی لەرینەوەی جیاوازی خۆیان .

لەسەرەتاوە ئەقڵ لە کێلانە ئەثیری یەکەیدا لە ناو ڕەحمی دایك دا مادەی فیزیاوی لە دەوری خۆی کۆئەکاتەوە ئەیکات بە کێلانی دووەمی خۆی ، کەوابوو لەسەر داواکاری ئەقڵی ئەثیری لەشی فیزیاوی دروست بوو ، وەکو بەرگی دووەمی ئەقڵ کە بەرگی یەکەمی ئەثیری یە .

ئەوەی بۆ زانایانی ڕۆحی و زانستی نوێ دەرکەوتووە ئەو دوو بەرگەیە بۆ ئەقڵ هەروەکو باسمان کرد لەوانەیە بەرگی تری هەبێ لەم جیهانە فیزیاوی‌یەدا کە هیچی لێ نازانین ..

ئەوەی باسمان کرد ڕاستی یە دەربارەی جیهانی ئەثیری‌و ڕۆحەکان :

دکتۆر (ر.ا.واترز) Dr.R.A.Watters بەڕێوەبەری دامەزراوەی دکتۆر (ولیم برنارد جونستۆن) Dr.W.Bernard . Johnston بۆ لێکۆڵینەوەی سایکۆلۆجی لە وولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئەڵێ :

بەبەکارهێنانی ئامێری (ولسون بۆکشان) توانیومانە لەشی ئەثیری هەندێ گیان لەبەر وێنە بگرین چوونکە ئاژەڵەکان و باڵندەکان‌و مێروەکان واتە هەموو گیانلەبەرەکان کاتی مردن لەشی ئەثیری یان لەلەشە فیزیاوی‌یەکەیان جیائەبێتەوە ئەو ئامێرەی لەم کارەدا بەکارهێنراوە کاری ئەوەمان بۆ ئامادە ئەکات لەکاتی مردنی ئادەمیزادیشدا بەکاری بهێنین!!

ئەم کارە بە ڕووناك کردنەوەی لەشی ئەثیری ئەبێت لەکاتی بەجێهێشتنی لەشی فیزیاوی دا کە بەهۆی ڕووناکی یەکی زۆر بەهێزەوە ئەبێت ، لەم کاتەدا ئەتوانرێ وێنەی لەشە ئەثیری یەکان بگیرێ واتە لەکاتی چوونە دەرەوەیان لەلەشە فیزیاوی یەکاندا زاناکان ئەڵێن :

بێجگە لە ئادەمیزاد هەموو گیان لەبەرەکانی تریش لە کاتی مردن دا لەشی ئەثیری یان هەروەکو وێنەی لەشە فیزیاوی‌یەکەیان ئەچێتە دەرەوەو ئەتوانرێ وێنەی بگیرێ بە ئامێری ڕووناک کەرەوەی تایبەت .

پەیمانگەی جیهانی بۆ لێکۆڵینەوەی ڕۆحی لە لەندەن ئامێری (ولسن) ی بەکارهێناوە بۆ وێنەگرتنی لەشە ئەثیری یەکان و تاکو ئێستاش بەردەوام لێکۆڵینەوە ئەکەن هێشتا لەسەرەتادان لەم بوارەدا !!!

ئەوانەی توانای بینینی زۆریان هەیە ئەم ڕاستیەیان سەلماندووەو ئەڵێن ڕۆحەکان لەلەشی فیزیاوی دەرئەچن، ئەم جیهانەمان بەجێ ئەهێڵن یەکەم جار وەکو هەڵمێکی خەست وایە پاشان ئەو هەڵمە ووردە ووردە کاڵ ئەبێتەوەو تاکو وای لێ دێ ئێمەش نایبینین . ئەقڵ بەردەوام وێنەکانی دەوروبەرمان ئەگرێت ، بەو وێنە گرتنە ئێمە هۆشمان هەیە .

کاتی خەوتن ئەڵێین هۆشمان نی یە ، بەڵام ئەقڵ بەردەوامە لە وێنە گرتن ڕاستە لەکاتی خەودا هۆشمان نی یە ..بۆ نموونە :

کاتێ خەوێکی ناخۆش ئەبینین ، وێنەکانی ئەقڵ گرتوویەتی بەڵام لەڕاستی دا لەم جیهانە فیزیاوی یەدا وانی یە ..

واتە لەو کاتەدا هۆشمان نەبووە ، کەوابوو ئەقڵ نامرێ، بەردەوامە لە وێنە گرتنی دەوروبەرمان لەم جیهانەداو لەجیهانی ئەثیری دا ، ئەم زەوی یە بەشێکە لە جیهانی ڕاستی گەورە

ئەو جیهانە گەورەو ڕاستی یە پێك هاتووە لە جیهانی ئەثیری و فیزیاوی کە لەرینەوەیان جیاوازە لەبەرزی و نزمی دا ..زەوی تەنها ماوەیەکە لەو ماوەی لەرینەوانە ..هەندێ ماوەی لەرینەوە هەیە لە لەرینەوەی زەوی خێراترە و هەندێکیش هەن کەمترن .

زەوی شوێنی نیشتەجێ مانە لە کاتی ژیانمان لەسەری ، بەڵام جیهانی ئەثیری فراوانترە، لەرینەوەکانی جیاوازن هەندێکیان زۆر بەرزن، هەندێکیشیان لەرینەوەکانی لە لەرینەوەی زەوی نزم ترن .

لەرینـــەوەکانی لەشـــی ئـــادەمیزاد ئـــەگونجیّ لەگـــەڵ لەرینـــەوەکانی ڕووی زەوی کەلەسەری ئەژین .

هـەروەها لەرینـەوەکانی لەشـی ئـەثیری ئـەگونجیّ لەگـەڵ لەرینـەوەکانی جیهـانی ئەثیری دا .

زاناکان ئەڵێن :

ئەم گەردوونـە گـەورەو فراوانـە هـەمووی لەلەرینـەوەکان پێك هـاتووە کەلـە ژمـارە نایەن ، نازانین ئەم لەرینەوانە لە کویّ وە دێن و لەکویّ کۆتایی یان دێت

گومانی تێدا نی یە هەموو لەرینەوەکان لە دەسەڵات و توانای پەروەردگارەوە دێـن، کۆتایی و گەڕانەوەیان بۆ لای پەروەردگارە.

ئێمەی ئادەمیزاد کاتیّ ئەمرین ڕۆحمـان توانـای سـەرکەوتنی هەیە بـۆ سـەرەوە بـۆ جیهانی ڕۆحی کەوابوو ئێمـە لەشـی فیزیـاوی مـان ئـەمریّو ڕۆحمـان ئـەمێنیّ ، واتـە مردن کورت ترین پلەیە کە ئەیبڕین یان پیّ ی دا تیّ ئەپەڕین .

لەشی ئەثیری بەرە بـەرە لەگـەڵ جیهـانی ئـەثیری ئـەگونجیّو ڕادێـت بـەلاّم شـتێکی گرنگ هەیە ئەویش ئەوەیە ڕۆحە چاکەکان لەگـەڵ شـوێنە چاکەکان ئـەگونجێن، ڕۆحـە خراپەکان لە جێگەی خراپ دا نیشتەجیّ ئەبن واتە لە جیهانی بـەرزەخ دا کـەوابوو ئـەو لەشە ئەثیری یە مـان کـە بەدرێـژایی تەمـەنمان لەسـەر زەوی لەگـەڵ لەشـی فیزیاویمـان دا بـووە هەسـتمان پـیّ نـەکردووە بەرەبـەرە لەگـەڵ جیهـانی ئـەثیری ئـەگونجیّو لەگـەڵ لەرینەوەکانیدا لـە ڕوویـەکی بـەرزەوە ڕادێت و لەرینـەوەکانی زیـاتر ئـەبێت زاناکـان ئەڵێن:

لـە ڕووی یەکـەمی جیهـانی ئـەثیری دا چـڕی یەکـەی لـە زەوی کـەمترە بـەلاّم لەچـاو ڕووەکانی تردا چڕی زۆرە لەرینەوەکانی لە لەرینەوەکانی ڕووی زەوی کەمترە بەلاّم لـە لەرینەوەکانی سەرەوە نزم ترە .

کـــەوابوو لـــە جیهـــانی ڕۆحـــی یەکەمـــدا ماوەیـــەك ئەمێنینـــەوە بـــەلاّم لـــە پاشـــان لەرینەوەکانمان زیاتر ئەبێت و جارێکی تر پلەیەکی تری گواسـتنەوەمان بەسـەردا دێت ئەچینە جیهانی ئەثیری دووەم بەم جۆرە تاکوو سەرئەکەوینە سـەر ڕووی هـەر حـەوت

جیهانە ئەثیری یەکان واتە لەسەروی هەموویانەوە ئەبین لەوێشەوە بە گۆڕانکاریەك ئەڕۆین بۆ جیهانی گەورە ئەمەش لە کاتێکدا ئەبێت حەوت جیهانە ئەثیرییەکان و زەوی تێك ئەچن بە فەرمانی پەروەردگار، تاقە ڕۆحێك نە لە زەوی و نە لە جیهانە ئەثیرییەکان نامێنیٚ، ئاگای لە خۆی بێت تاکو ینفخ فی الصور لە جیهانی گەورەی پاش ئەثیری یەکان قیامەت و حەشر ئەبێت ..

کەوابوو ڕۆژی زیندووبونەوەی یەکجاری و لێپرسینەوەی ڕۆژی حەشر دەست پیٚ ئەکات .

زانا ڕۆحی یەکان ئەڵێن لەم حەوت جیهانە ئەثیری یە زیاتر نازانین دوای ئەوان لە بۆشایی گەردووندا چی هەیە، چی ئەبێت دەربارەی ڕۆحەکان .

کەوابوو مردن سەرەتای ئەو ڕێگەیەیە بەرەو جیهانی ناکۆتایمان ئەبات بەرەو بارەگای پەروەردگارمان ئەبات ، یان بۆ بەهەشتە بەرین و هەتا هەتایەکەی ، یان بۆ دۆزەخە فراوانەکەی .

ڕۆیشتن لە جیهانێکی ئەثیری یە وە بۆ جیهانێکی تری ئەثیری بە بیرکردنەوە ئەبێت و بیریش کاردەکاتە سەر لەرینەوەکانی لەشی ئەثیری و ئەیجوڵێنیٚ تاکو ئەڕواتە پلەیەکی نویٚی ئەثیری بەم جۆرە تاکو پلەی حەوتەم هەروەکو باسمان کرد .

کەوابوو جیهانە ئەثیرییەکان حەوت بوون و ڕۆحە ئەثیریەکان پلە پلە لەسەر ڕووی ئەو جیهانانەن تاکو پلەی حەوتەم .

بەڵیٚ جیهانی ئەثیری راستەو لەسەریان رۆحەکان هەن نەوەك لەناویانداو هەرپلەیەکی جیهانی ئەثیری بەرزتربووە بە ئاسمانێك بۆ پلەیەکی نزم تر هەر حەوتیشیان بوون بەحەوت ئاسمانی ئەثیری بۆ زەوی.

هەندیٚکەس ئەم جیهانانە بەجیاواز ئەزانیٚ. واتە هەریەکەیان جیاوازە لەوی تریان، بەڵام لەڕاستی دا هەرحەوتیان لەگەڵ زەوی دا چوونەتە ناو یەکەوە و جیهانی گەورەیان پێك هێناوە ، رۆح هەموویان ئەبینیٚ و پاشان کۆتایی یان دێت و رۆژی قیامەت و حەشر رووئەدات.

(ئەگەر تەماشای جیهانی گەورەبکەین بەم شێوەیە دیارە)

دیسانەوە بڕوانە وێنەی ژمارە(٢٥) جیهانی گەورە.

ئەم وێنەیە لەکتێبی (الكون المنشور) وەرگیراوە.

ئەگەر لەم وێنەیە ووردبینەوە، جیهانی گەورەئەبینین کەبریتی‌یە لەیەکگرتنی هەزاران لەرینەوەو بیر کەپێ یان ئەڵێن مادە، ئیتر ئەومادەیە فیزیاوی بێت یان ئەثیری یان هەرشتێکی تر بێت.

مادە کارئەکاتە سەر بیرو بیریش کارئەکاتەسەر مادە.

ئەمەش وەکو مێشك و ئەقڵ وایە، لەم کاتەدا مێشك مادەیە و جیهانی گەورەیە بۆ ئەقڵ بیرەکان وێنەی ئەقڵی ئێمە هەریەکەمان وەکوو خانوویەك واین لەم جیهانە گەورەیەدا کە لە ئەقڵ و مادە پێك هاتووە.

کەوابوو جیهانی گەورە لەقەبارەیەکی زیندوو پێك هاتووە بەردەوام ئەژی و مردنی یەکجاری نی‌یە لەم جیهانە گەورەیەدا بەڵکوو گواستنەوەو گۆڕانکاری هەیە بەفەرمانی پەروەردگار کەشێوەی مادە ئەگۆڕێ و جۆری ژیان ئەگۆڕێ.

بەڵام بەرزترین پلەی ژیان کە ئێمە بەشێکین لەوژیانە بەردەوامە، ئەمێنێ و بیروهۆش ئەمێنێ و نافەوتێ ژیانیش بەردەوام ئەڕوا لەپلەیەکەوە بۆ پلەیەکی تری بەرزترو پاشان زیاتر تاکوو کۆتایی دێت بەگەیشتنی بارەگای پەروەردگار، کردەوەکان و هەڵس و کەوتی جیهانی فیزیاوی لەو بەرزایی یە دا وەکو شریتی ڤیدیۆ لێ ئەدرێت و هەرکەس بەگوێرەی ئەوکردەوانەی ئەنجامی خۆی وەرئەگرێ. پەروەردگار خۆی فەرموویەتی:

﴿ هَذَا كِتَابُنَا يَنْطِقُ عَلَيْكُمْ بِالْحَقِّ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنْسِخُ مَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ (الجاثية:٢٩)

واتە:ئەوە کتێبی ئێمەیەو راستی ئەڵێ پێتان ، ئێمە کردەوەو کارەکانتان کە ئەنجامتان ئەدا لەبەرمان گرتووەتەوە

واتە: فۆتۆکۆپی کردەوەو کارەکانتان لەجیهان دا کە ئەتان کرد گرتوومانەتەوەو لامانە.

**دیسانەوە زانایانی رۆح ئەڵێن:**

ئێمە ناتوانین هەواڵی دوای جیهانی گەورەبزانین چونکە رۆحەکان تەنها لەو حەوت جیهانەدا پەیوەندیمان پێوەئەکەن ئەوانیش هەواڵی دەرەوەی جیهانەکانی خۆیان نازانن چونکە لەدەرەوەی ئەم جیهانانە کەس نیەیە هەواڵێکمان بۆ بنێریێو پەیوەندیمان نی یە و هیچی لیێنازانین تەنها قورئانی پیرۆز بەڕاستی ئەم باسەی کردووە بە بەرزەخ ناوی ئەبات.

﴿ومن ورائهم برزخ إلى يوم يبعثُونَ﴾ (المؤمنون:١٠٠)

واتە: لە پشتیانەوە جیهانی بەرزەخ هەیە تاکوو رۆژی هەستانەوە.

ئەمە ئەوەئەگەیەنیێ جیهانی بەرزەخ ئەکەوێتە پشتی جیهانی گەورەوە.

هەروەها تەنها لە قورئانی پیرۆزدا باسی ئەم جیهانەو حەوت جیهانە ئەثیری یەکەی کردووەو پاش ئەمانیش لە گەردوونی فراوان دا بەهەشتو دۆزەخی دروست کردووە بۆ رۆحەکانو هەر رۆحە بەکردەوەی خۆی جێگەی بۆ ئامادەکراوە.

**زانایانی فیزیاویو رۆحی ئەڵێن:**

ئەگەر رووی ئەوجیهانە ئەثیریانە و زەوی بەڕاستی بەگوێرەی لەرینەوەکانیان تەماشایان بکەین بەم شێوەیەی خوارەوە دەرئەکەون:

لەرینەوەی کەم لەزەوی یەوە دەست پیێ ئەکات بەپیتی أ.

لەرینەوەی زیاتر لەجیهانی ئەثیری یەکەمەوە دەست پیێ ئەکات بەپیتی ب.

لەرینەوەی زیاتر لەجیهانی ئەثیری دووەم دەست پیێ ئەکات بەپیتی ج.

لەرینەوەی زیاتر لەجیهانی ئەثیری سیێیەم دەست پیێ ئەکات بەپیتی و.

لەرینەوەی زیاتر لەجیهانی ئەثیری چوارەم دەست پیێ ئەکات بەپیتی هـ.

لەرینەوەی زیاتر لەجیهانی ئەثیری پێنجەم دەست پیێ ئەکات بەپیتی و.

لەرینەوەی زیاتر لەجیهانی ئەثیری شەشەم دەست پیێ ئەکات بەپیتی ز.

لەرینەوەی زیاتر لەجیهانی ئەثیری حەوتەم دەست پیێ ئەکات بەپیتی ج.

ئەگەر ئەوجیهانە فیزیاوی و جیهانە ئەثیرییەکان رەنگ بکەین هەریەکە بەڕەنگێك و پاڵەپەستۆیان سەربخەین بەجۆرێك تێکەڵ بن و یەك ڕوو دەرکەون، هەرچەندە تێکەڵ ئەبن و یەك روو ئەنوێنن.

بەڵام هەر رەنگێك لەڕەنگەکان وەکوو خۆی ئەمێنێتەوە.

واتە: هەر جیهانێك ژیانی خۆی وەکوو خۆیەتی، واتە لەرینەوەکان جیاوازن لەیەکتری و یەك ناکەون، پەروەردگار بەوجۆرەی دروست کردوون.

﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾ (القمر:٤٩)

ئەوشتانەی دەوروبەرمان بەو ئەقڵەی لەناو لەشی فیزیاوی مان دایە ئەیان بینین کاتین و هەمیشەیی نین.

زەوی جیهانمانە تاکوو رۆحمان و لەشی ئەثیری و ئەقڵی ئەثیریمان لەناو لەشی فیزیاوی مان دابن.

بەڵام بەجیابوونەوەی لەشی ئەثیری کەڕۆح و ئەقڵە لەو لەشە فیزیاوی یە کۆچ ئەکەین بۆ جیهانی ئەثیری یەکەم واتە پلەیەك بەرزئەبینەوە چونکە جووڵانەوەو لەرینەوە لە ئەثیردا خێراترە لەسەر زەوی.

کەوابوو ژیانی ئەثیری بەرزترە. لەقۆناغی یەکەمەوە تاکوو هەرحەوت جیهانە ئەثیرییەکە تەواوئەبن لەرینەوەکان خێرا ئەبن و ژیان بەرزترئەبێت و ناسك ترئەبێت.

کەوابوو ئێمە ئەبێ بەئەقڵ بیربکەینەوە تاکوو رۆژی دوایی و زیندووبوونەوەی یەکجاری و ژیانی هەتا هەتایی تێ بگەین و لەگەردوون شتێك بزانین.

کاتێ لەسەر زەوی کۆچی دوایی ئەکەین ئەوە دواپلەی ژیانمانە لەسەر زەوی و کۆتایی ژیانی فیزیاوی مانە و ئەگەینە یەکەم پلەی ژیانی ئەثیری (آخر منزلنا من منازل الدنيا وأوّل منزلنا من مَنازِلْ الأخرة) جیهانی ئەثیری یەکەم.

لەشی فیزیاویمان ئەگەڕێتەوە بۆ ناوزەوی، لەسەرەتاوە لەخاك بووین و ئەبینەوە بەخاك.

بەندێك لەبەندیخانەدا دێتە دەرەوە ئازاد ئەکرێ بەو جۆرە، رۆح لە لەشی فیزیاوی هاتە دەرەوە ئازادەو بەرەو جیهانی ئەثیری یەکەم ئەکەوێتە ڕێ.

له جیهانی ئەثیری بەکەم دا خزمو دۆستو کەسو کاری کۆچ کردوو بەرەو پیری دێنو بەگەرمی پێشوازی ئەکەن ئەگەر ئەورۆحە پاكو چاك بوو. بەڵام ئەگەر خراپ بووبێت لە جیهانی فیزیاوی دا ئەوەبە بەپێچەوانەوە.

ئێمە قسەی ئەو رۆحانە نابیسینو بەچاویش نایانبینین چونکە جیهانەکانمان جیاوازن. ئێمە فیزیاویو ئەوان ئەثیریو لەرینەوەکانمان جیاوازن.

یەکێك لەرۆحەکانی جیهانی ئەثیری لەکاتی قسەکردن دا لەهۆدەی ئامادەکردن بەهۆی ناوەندەکەوە ئەمەی خوارەوەی ووتووە:

((لەم کاتەدا قسە لەگەڵ ئێوەئەکەم رۆحێك هاتووە بۆلامان ماوەیەکی کەمە هێشتا هۆشی نەهاتووەتەوەو رانەهاتووە لەگەڵ جیهانەکەمان و پاش ماوەیەکی کەم لەگەڵمان ئەبێتو پێشوازی ئەکەینو زۆردەمێکە من چاوەڕوانم ئەم رۆحە بێتە لامان چونکە لەجیهانی فیزیاوی دا زۆریارمەتی داوم ، من هەژارو دەست کورت بووم ئەویارمەتی ئەدام ، ئێستا پێویستە پێشوازی بکەمو لەپەروەردگار بپاڕێمەوە جێگەی لەهەمووومان بەرزو خۆشتربێت ، ئابەوجۆرە

﴿هلْ جزاءُ الأحسان إلا الأحسانُ﴾ (الر ن:٦٠) لەوێش پەیڕەوئەکرێ.

هەندێ پرسیارو وەڵام دانەوەیان لەلایەن رۆحەکانی جیهانی ئەثیری یەوە

پێویستە مەبەستمان لەژیان ئەوەبێت ژمارەیەکی زۆر پرسیار کۆبکەینەوەو شیبکەینەوە ئەم پرسیارانەش بکەین لەزاناکان ی زانستی نوێو زانایانی ئاینیو فەیلەسوفەکان لەوانەیە ئەمانەش وەڵامیان پێ نەبێو بێ دەنگ بن، لێرەدا ناچارم پرسیارەکانم ئاڕاستەی رۆحە چاکەکانو مەلائکەو پەروەردگاربکەم. (فۆستەر)

لێرەدا هەندێ زانایانی رۆحی وەکوو: فندلای، پارش، دکتۆر کرۆفۆردو هەندێ تریش.

ئەم پرسیارانە و پرسیاری زۆرتریشیان کردووە لەرۆحەکانی جیهانی ئەثیریو وەڵامەکانیشیان وەرگرتووەتەوە ئێمەش بۆزانینی هەندێ پێویستی تایبەت بەخۆمانو بەپاشەڕۆژی گواستنەوەمان بۆ جیهانی ئەثیری هەندێ لەوپرسیارانە ئەنووسین لەگەڵ وەڵامەکانیان.

پ: ئێمەی دانیشتوانی جیهانی فیزیاوی لەسەرزەوی هەمووشتەکان بەهەست پێ کردن ئەزانین وەکوو مانگ و خۆرو ئەستێرەکان بەلاّم ئایا گەردوون ئەبێ چی بێت؟

و:گەردوون یەکەیەکی گەورەی یەکگرتووە، بەلاّم ئێوە هیچی لێ نازانن تەنها ئەوشتانەی ئەزانن هەستی پێ ئەکەن و ئەیبینن و ئەیبیسن.

باوەڕم پێ بکەن ئەوشتەی ئێوە پێ ی ئەڵێن مردن وانی یە بەڵکوو گواستنەوەیە لەجیهانەکەتانەوە بۆ جیهانی رۆحی و ئەثیری ئێمە.

ئەوجیهانە ئەثیریانە بەدەوری زەوی ئێوەدان و لەرینەوەیان خێراترە لە لەرینەوەی مادەی فیزیاوی و لەگەڵ زەوی دا ئەسووڕێنەوەو هەرحەوتیان جیهانی ئەثیری گەورە پێك دێنن و خۆری هەریەکەیان ئەثیری یە و جیاوازەو هەرحەوتیان خۆری گەورە پێك ئەهێنن.

ئێمەش لەم جیهانە ئەثیری یەمان دا شتێکی کەم لەگەردوون ئەزانین.

پ: ئایا هەموو دانیشتووانی جیهانی ئەثیری ئەتوانن جارجار پەیوەندی بکەن بەئێمەوە لەجیهانی فیزیاوی‌دا؟

و:بەڵێ ئەگەرئێوە ناوەندو ژوور ئامادەبکەن ئەتوانین پەیوەندیتان پێوەبکەین و ئێمە هەتاکوو بەرزبینەوە لەجیهانی ئەثیری یەکەمەوە بەرەوژوور ئارەزووی گەڕانەوەو پەیوەندی کردن مان بەئێوەوە کەم ئەبێتەوە بیرتان ناکەین.

پ:کەوابوو جیهانی ئێوە کە ئەثیری یە هەستی پێ ئەکەن؟

و:بەڵێ راستە و ئێمە هەموو شتێکمان بەبیرکردنەوەیە.

هەروەها چاکەکانمان لەگەڵ چاکەکان ئەگونجێن و خراپەکانمان لەگەڵ خراپەکان ئەگونجێن. واتە هەست بەبیرکردنەوە لەچاك و خراپ ئەکەین و هەست بەهەمووشتێك ئەکەین.

پ: ئایا هەروەکوو باست کرد خراپەکان لەگەڵ خراپەکان ئەگونجێن و چاکەکان لەگەڵ چاکەکان ئەگونجێن، باشە ئەی جێگەی چاك و خراپ جیاوازی هەیە؟

و: بەڵێ: چاکەکان جێگەیان زۆرخۆشەو ئەم جهانەیان زۆر پێ خۆشە و خراپەکانیش لەئازارو ناخۆشی دان و خۆزگە بەجیهانی فیزیاوی ئەخوازن.

**پەروەردگار فەرموویەتی:**

**﴿إِنَّا أَنْذَرْنَاكُمْ عَذَاباً قَرِيباً يَوْمَ يَنْظُرُ الْمَرْءُ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ وَيَقُولُ الْكَافِرُ يَا لَيْتَنِي كُنْتُ تُرَاباً﴾ (النبأ: ٤٠)**

**پ: ئایا خێزانێك هەندێ ئەندامی کۆچی کردووە لای ئێوەیەو هەندێکی یان ماون کە کۆچیان کرد هەموویان لەجیهانی ئەثیری بەیەکەوە ئەبن؟**

**و: مەرج نیە هەموو خۆشەویستان یان ئەندامانی خێزانو دۆستان لەجیهانی فیزیاوی هاتنە ئەثیری بەیەکەوەبن هەروەکوو ووتمان چاك لەگەڵ چاكو خراپ لەگەڵ خراپ. وەڕێکیش ئەکەوێ زۆربەی خێزانەکان هەموو ئەندامەکانیان چاكو پاك بووبن لێرەدا ئەبنەوە بەیەك خێزانو بەیەکەوە ئەبن.**

**ئەی نازانی گەورەمان یعقوب بۆچی گریا بۆ گەورەمان یوسف کوڕی گوم بووی؟ تاکوو نابینابوو؟ تەنها لەبەرئەوەبوو گەورەمان یعقوب ئەیزانی ئەگەر ئەو کوڕە خۆشەویستەی تووشی گوناه ببێت لەجیهانی رۆحی چاوی پێ ی ناکەوێتەوە....**

**پ: ئایا خواردنو خواردنەوەتان هەیەو ئەخۆنو ئەخۆنەوە؟**

**و: بەڵێ بەڵام نەك وەکوو ئێوە ئێمە بەبیرکردنەوەو بەئەقڵ هەموو خواردنو خواردنەوەمان ئەنجام ئەدەین بەڵام ئێوە بە لەش سوود لەخواردنو خواردنەوەتان وەرئەگرن.**

**پ: من تۆ نابینم ئایا شێوەت چۆنە؟**

**و: ئەوکاتەی لەسەر زەوی بووم چۆن بووم ئێستەش هەروایە شێوەم بەڵا م لەتەمەنێکی باش دام و لەشم رێکی لەشە فیزیاوی یەکەمە کەفڕێم دا کاتی مردن. بەڵا م ئەم لەشەی ئێستام سووكو خێراترە لەو بەرگە فیزیاوی یە قورسەی تیایدابووم لە جیهانی فیزیاوی دا.**

**پ: ئایا لەجیهانی ئەثیری دا مردن هەیە؟**

**و: لای ئێمە مردنێکی تر هەیە بەڵام وەکوو مردنی لای ئێوە نی یە ئێمە ئەڵێین بەرزبوونەوە یان گواستنەوە چونکە جیهانی ئەثیری ئێمە حەوت جیهانن، هەتاکوو**

بەرزبینەوە بەرەو جیهانی حەوتەم جێگەو شوێن و حاڵمان باش ئەبێت ئەگەر لەچاکەکان بین وەئەگەر لەخراپەکانیش بین ئەوە بە پێچەوانەوە.

ئەوانەمان مردنی دووەمیان دیوە یان بەرزبوونەوە لە جیهانی ئەثیری یەکەم بۆ دووەم ئەتوانن بگەڕێنەوە بۆلامان و سەردانمان بکەن بەڵام ئێمە بەسەردان ناتوانین بڕۆینە لای ئەوان بەگواستنەوەو بەرزبوونەوە نەبێت ئەویش کاتی هەیە دێتەپێشەوە.

لێرەدا پرسیارەکان ئەوەستێنین و ئەڵێین:

ئەم ئایەتە کە باسی بەهەشت دەکات و دەفەرموێ:

﴿لا يَذُوقُونَ فِيهَا الْمَوْتَ إِلَّا الْمَوْتَةَ الْأُولَى وَوَقَاهُمْ عَذَابَ الْجَحِيمِ﴾ (الدخان:٥٦)

کەوابوو: تامی مردن ناچێژن مردنی یەکەم نەبێت ئەویش لەم جیهانە دایە بەڵا م لەجیهانی بەرزەخ مردن نی یە بەڵکو بەرزبوونەوەو گواستنەوەیەو ئەتوانن بگەڕێنەوە سەردان بۆ جیهانەکەی پێشوویان و پەروەردگار پارێزگاریان ئەکات لەئاگری دۆزەخ بێ گومان رۆحە چاکەکان بەڵام رۆحە خراپەکانیش بەپێچەوانەوە.

ئەوجیهانە ئەثیریانە بەدەوری زەوی دان و ﴿**سبع سماوات طباقاً**﴾ پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا باسیان ئەکات

﴿**الذي خلق سبع سماوات طباقاً**﴾ **(الملك:٣)**

پ: ئایا ئەورۆحانە لەناو ئەو لەشە فیزیاوییانەی سەرزەوی جارێکی تر زیندوو ئەبنەوە؟

و: من رۆحێکم زۆر دەمێکە هاتوومەتە جیهانی ئەثیری و جیهانی ئێوەم بەجێ هێشتووەو لەشە فیزیاوی یەکەم لەوێ یە.

بەڵام زۆر زۆر پرسیارەکەت گرانە و ئێمە هیچ شتێك لەوبارەیەوە نازانین و کەی ئەبێت و چۆن ئەبێت تەنها پەروەردگار بڕیاری خۆی دەرئەکات و جێ بەجێ ی ئەکات.

حەشر ئەبێت لێپرسینەوەی یەکجاری ئەبێت.

هەروەها ((تنسۆن)) زانای گەردوونی بەناوبانگ لەزانکۆی (کمبردج) لەنووسینێکی دا بەناوی (زانست و جیهانی نەبینراو) ئەڵێ: (رۆحی ئادەمیزاد ئەبێ بگەڕێتەوە جیهانی نەبینراو)

واتە: جیهانی ئەثیری ، چونکە جێگەی خۆیەتی.

((مردن لەناوچوون نی یە لەبەرئەوە مەترسی نی یە تەنها مەترسی لەوەدایە کردەوەکانمان لەم جیهانە فیزیاوی یەدا باش نەبووبێت، لەبەرئەوە ئادەمیزادی چاك و پاك زۆر بەخۆشحاڵیەوە پێشوازی لەو کۆچ کردنەئەکات کەپێ ی ئەڵێن مردن)) ((نووسەر)).

کاتێ لاوەکان کۆچ ئەکەن واتە ((ئەمرن)) بەهەر هۆیەکەوەبێت بەتایبەت شەهیدبوون.

لەم جیهانەدا زۆر دڵتەنگ ئەبین بۆیان، گریانو شیوەن لەلایەن کەسو کاریانەوە، ماتەمین گێڕان لەلا یەن هاوڕێ یانو خزمانەوە.

بەڵام ئەم هەموو ناخۆشی یە، بۆ کۆچ کردووە کە خۆشی یە، لە بەندی قەفەزی لەشی فیزیاوی ئەو ڕۆحە ئازادبووەو چووەتە دەرەوە بەرەو جیهانی رۆحی بەڕێوەیە، بەڵێ ئەو مردنە کۆچ کردنە، ئێمەشو ئەوانەی دوای ئێمەش ئەم کۆچە ئەکەنو لەجیهانی رۆحی دا ((بەرزەخ)) بەخۆشەویستان شاد ئەبینەوە. لەبەرئەوە پێویست بەو شیوەن و پەژارەو دڵ تەنگی یە ناکات.

هەروەها کاتێ پیرێك یان نەخۆشێکی ((کەلەلا)) پەك کەوتوو یان کەم ئەندامێك کۆچ ئەکات، ئەوە ئەو رۆحەی رزگاری ئەبێتو لەوبەندیخانەیە کەلەشی فیزیاوی یە دێتەدەرەوە، رۆحیش پیر نی یە پەك کەوتە نی یە و کەم ئەندامیش نی یە لەگەڵ ئەقڵو لەشی ئەثیری یە و بەرەو جیهانی راستەقینە ئەکەوێتەڕێ. بەبێ کەمو کوڕی تەنها کردەوەی باش بووبێت لەم جیهانەدا لەجیهانی ئەثیریو پاش ئەثیری ((جیهانی گەورە)) رۆژی قیامەت دا سەربەرزو دڵشادە.

کەوابوو نابینا لەم جیهانەدا هەیە، یان کەڕولاڵ و دەسو قاچ بڕاو هەیەو کەم ئەندامی بەهەموو شێوەکانی یەوە هەیەو تەنانەت شێتی، بەڵام لەجیهانی ئەثیری دا ئەمانە هیچیان نینو پیربوون نی یە.

کەوابوو ئەومردنەی خەڵکی لێ ی ئەترسێو هەر ڕێگەیشی پێ ئەگرێو دەرچوونی کەس نی یە هەمووکەس ئەومردنە ئەچێژێ.

﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ﴾ (آل عمران:١٨٥)

پێویست بەترس‌و خەفەت ناكات ئەگەر كردەوەو رەفتارمان باش بێت لەم جیهانەداو پەروەردگارمان ناسی بێت.

لەئاینی پیرۆزی ئیسلام دا

شیوەن‌و تەعزیەو چوونە سەرقەبران و رازاندنەوەی قەبر حەرامە چونكە هیچیان پەسەندنین‌و ئەو لەشە فیزیاوی یە لەژێر ئەوگڵ‌و بەردانەدا وەكوو ئەوخاكە وایەو هیچی تر.

رۆح‌و ئەقڵ‌و لەشی ئەثیری لەژێر خاك دانین.

بەڵكو بەرەو جیهانی بەرزەخ، واتە ئەثیری، بەرەو بارەگای پەروەردگار بەرێوەن. هەروەكوو باسمان كرد ئەگەر كردەوەو كارو خواپەرستی راست بووبێت لەو جیهانە ئارام‌و خۆشەدا، لەو جیهانە بەرز و پیرۆزەدا و لە جیهانی گەورەدا لە جیهانی بێ چەوساندنەوەدا، لەجیهانی بێماندووبوون دا لەجیهانی یەكسانی دا لە جیهانی پڕلە خۆشی دا، لەجیهانی رۆحە پاكەكاندا ئەحەسێتەوە بۆ هەتا هەتایە.

لێرەدا ئەبێ ئەوەبزانین:

هەندێ لەپیاوچاكان، پەروەردگار بەفەرمانی خۆی توانای ئەوەی پێ بەخشیون كەلەرینەوەی خۆیان نزم بكەنەوە بەڕادەی لەرینەوەی جیهانی فیزیاوی‌و بەشێوەی جارانی خۆیان لەسەر زەوی خۆیان پیشانی خەڵك بدەن زانایانی رۆحی ئەمەیان سەلماندووە لە كاتێكدا قسەیان لەگەڵ هەندێ رۆح دا كردووە لەجیهانی رۆحەكان دا.

كەوابوو ئەگەر ئەركەكانی سەرشانمان لەم ژیانەدا و لەم جیهانە فیزیاوی یە كاتی یەدا بە جێ هێنا و بەڕاستی‌و بەپاكی فەرمانەكانی پەروەردگارمان بەجێ هێنا و دوور لەخراپەكاری‌و بێ ویژدانی بەهەموو جۆرەكانی یەوە، چونكە تاوان‌و خراپەكاری دژی ئاینەو ئاینیش ویژدان‌و خواپەرستی یە، چاكەكردن‌و راستی یە، ئەو ڕێگەی كۆچ كردنەمان بۆئاسان دەكات، لەم ژیانە كاتی یە و كەمەدا لەناو ئەم بەندیخانە فیزیاوی‌یەدا كەلەشمانەو لەناو ئەم بەندیخانە گەورە فیزیاوی‌یەدا كەجیهانە.

پێویستە ئەوتەمەنەی پەروەردگار دیاری کردووە بۆمان بەچاکەکاری تەواوی بکەین و بەسەری بەرین.

بۆئەوەی لەجیهانی ئەثیری دا سەربەرزو دڵشادبین لەم گۆڕانکاری یەدا رۆحە چاکەکان خۆشحاڵن، ئێش و ئازار نامێنیٚ و هەرگیز هیچ رۆحێك ئارەزووی گەڕانەوە ناکات بۆسەرزەوی.

لەم جیهانە رۆحی و ئەثیری یەدا ئەقڵ لەشی ئەثیری و رۆحی بەڕێوەئەبات و هەموو شتێك تەنها بەبیرکردنەوەیەکی کورت دێتەدی و ماندووبوون نی یە.

بەڵام لەسەر زەوی ئەقڵ دەوری گیراوە بەمادەی فیزیاوی وەکوو بەندی یەك وایە لەبەندیخانەدا، لەبەرئەوە هەست بەهەموو ئازارو ئەشکەنجەیەك ئەکات لەجیهانی فیزیاوی‌دا.

بەڵام لەجیهانی رۆحی دا بەفەرمانی پەروەردگار لەشی ئەثیری و رۆح و ئەقڵی ئەثیری بیٚ کێشەیە و دڵخۆشی یە بۆ چاکەکان.

هەروەها خۆشی یەکجاری لەجیهانی گەورەدایە رۆژی لیٚ پرسینەوەی یەکجاری، هەروەها زۆر دڵخۆشی یە بۆ ئەو خێزان و کۆڕو کۆمەڵانەی هەموو ئەندامەکانیان چاك و پاك بوون چوونکە لەوجیهانەدا یەك ئەگرنەوەو بە یەکتر شادئەبنەوە، بەڵام ئەگەر خراپەیان هەبوو بێت ئەوە لەشوێنی خراپەکاندان و توانای تێکەڵاوی چاکەکانیان نی یە.

ماوەی گەیشتنەوەمان بەو کەس و کارە کۆچ کردوانەمان و هاوڕیٚ و خزم و دراوسیٚ خۆشەویستەکانمان کەمە.

تەنها ئەوبەشە تەمەنە کورتەیە کەماوە لەم جیهانە فیزیاوی یەدا بەسەری ئەبەین و پاشان شادئەبینەوە بەبینینی خۆشەویستانمان لە جیهانی بەرزەخ و پاشان لەجیهانی گەورەدا (القیامة)دا.

**********************

***************

************

## ( ووریاکردنەوەیەك )

ئەی برای ئادەمیزاد زۆرچاك بزانە كە پەروەردگار راستی یەكی روون و ئاشكرایە.

پێویستە گوێ ڕایەڵی فرمانەكانی بین، چونكە دروستكاری هەمووبوون و بوونەوەرەكانەو دروست كاری هەموو ئەم گەردوونە فراوانەیە كەباسمان كرد، لە نەبوون هەمووی دروست كرد بەو هەموو وردەكاری و ڕێك وپێكی و یاسایانەوەو تۆی كرد بەسەرداری هەموو شتێك لەسەرزەوی و پیرۆزترین پلەی پێ بەخشیت و بووی بەهەڵگری سپاردەیەك (ئەمانەتێك) لەم جیهانەدا ئەركێكی خستە ئەستۆت كەئاسمانەكان و زەوی نەیان توانی ئەوئەركە بگرنە ئەستۆ لەبەر گرنگی و پیرۆزی ئەو ئەركە هەروەكوو لەقورئانی پیرۆزدا باسی كردووەو فەرموویەتی:

﴿إِنَّا عَرَضْنَا الْأَمَانَةَ عَلَى السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَنْ يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا الْأِنْسَانُ إِنَّهُ كَانَ ظَلُوماً جَهُولاً﴾ (الأحزاب:٧٢)

كەوابوو تۆ بەرپرسیاریت و لێ پرسینەوەت لەسەرە، ڕۆژی زیندووبونەوەی یەكجاری پاداشت بەكردەوەی خۆت وەرئەگریتەوە.

هەروەها چاك بزانەو هۆشت بێت و ئاگاداربە لەوەی پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿وَقِفُوهُمْ إِنَّهُمْ مَسْؤُولُونَ﴾ (الصافات:٢٤)

بیربكەرەوەو ئەوڕۆژە بهێنەرە بەرچاوت كەئادەمیزاد رائەكات و دوورئەكەوێتەوە لەبرای لەدایك و باوكی و لەهاوڕێ یانی و لەمناڵەكانی، تەنها بایەخ بەحاڵی خۆی ئەدات و خەمی خۆیەتی ئەو ڕۆژە لەبەر ترسی پەروەردگارو لەبەر گەورەیی مناڵ سەری سپی ئەبێت.

بیربكەرەوە لەو ڕۆژە كەلەبەردەستی پەروەردگارا وەستاویت كەڕۆژی هەستانەوەو زیندووبوونەوەیە پێغەمبەرمان محمد (د.خ) فەرموویەتی: ((مَامِنْكُمْ أَحد إلا سَيكلمه ربهِ يَومَ الْقيامة * ليس بينه وبينه ترجمان، فينظر أيمن مِنهُ فَلاَ يَرى إلاّ مَاتقَدّمَ مِنْ عَمَلهِ* وَيَنظُرْ أشأمَ مِنْهُ فَلاَ يَرى إلاّ مَاقدّمَ، ويَنظر بين يديه فَلاَ يَرى إلاّ الْنارْ تِلْقاءْ

وَجْهِهِ فأتقوُا الْنارَّ وَلَوْ بِشَقِّ تَمْرّهِ)) . البخاري ومسلم والترمذي گێڕاویانەتەوە لە عدی کوڕی حاتەمەوە.

واتە: کەسێك لەئێوە نی یە کە پەروەردگاری لە ڕۆژی قیامەتدا قسەی لەگەڵدا نەکات (ڕاستەوخۆ)و بەبێ ئەەی وەرگێڕێك لەنێوان ئەوو خوادا بێت، ئەو کەسە کەسەیری لای ڕاستی دەکات تەنیا کردەوەکانی دەبینێ و سەیری لای چەپی دەکات هەر ئەوانە دەبینێ کە پێش خۆی خستووە، کە سەیری بەردەمی دەکات ئاگر نەبێ هیچی تر نابینێ, دەی خۆتان لە ئاگر بپارێزن بەلەتە خورمایەکیش بووە.

هەروەکوو پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿إِنْ كُلُّ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِلَّا آتِي الرَّحْمَنِ عَبْداً لَقَدْ أَحْصَاهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدّاً وَكُلُّهُمْ آتِيهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَرْداً﴾ (مريم: ٩٥،٩٤،٩٣)

واتە: پەروەردگار هەموو دروست کراوێکی خۆی لەزەوی ئاسمانەکان دا ئەژمێریێ و هەموویان دێنە بەردەستی یەکەیەکە لەڕۆژی هەستانەوەدا.

لەوانەیە بڵێ ی ماوەیەکی زۆری ئەوێ ئەم پرسیارانە لەم هەموو ئادەمیزادە کەژمارەی مەگەر تەنها پەروەردگار بزانێ لەسەرەتای دەست پێ کردنی ژیانەوە لەسەرزەوی تاکوو کۆتایی و ڕۆژی دوایی؟ بەڵام هەموو پرسیارو لێکۆڵینەوەکان لەماوەی چاو تروکاندنێکدا ئەنجام ئەدرێت بەفەرمانی پەروەردگاری، پەروەردگار کەپرسیارئەکات هەموو ئادەمیزادەکان گوێ یان لێ یە هەروەکوو هەزاران ملیۆن گڵۆپ بەیەك سویچەوە بەندبن بەچرکەیەك هەمووی دائەگیرسێ.

واتە هەموو یەکێك لەئێوە ڕۆژی هەستانەوە ((القيامة)) پەروەردگار قسەی لەگەڵ ئەکات کە هیچ تەرجومانێك نی یە لەنێوان دا، بەهەر لایەك دا ئەڕوانێ هیچ نابینێت تەنها کردەوەکانی نەبێت تەماشای بەردەمی ئەکات ئاگرە بەڕووی دا دێت، کەوابوو خۆتان بپارێزن لەوئاگرە بە هەر نارەحەتیەك بووە.

بەچ زمانێك وەڵامی پەروەردگار ئەدەیتەوە کاتێ پرسیارت لێ ئەکا دەربارەی کردەوەی خراپت و پارێزگاری نەکردنی ئەمانەت.

لەو ڕۆژەدا چۆن رائەوەستیت لەبەردەستی پەروەردگارا؟

بـەچ دڵێـك ئـەتوانی قـسە وپرسـیارو لۆمـەكردنی وەرگـری دەربـارەی كـردەوە خراپەكانت بیهێنەرە بەرچاوت ئای چۆن شەرمەزاریيەكە!!.

چەند تاوان و خراپەكاريت كردووە لەم جیهانەدا لەوكاتەدا لـەبیرت نی یە و نازانی چـیت كـردووە ، بـیرت ئەخاتـەوە چـەند نهێنـی خراپـت هەیـە ، وات ئـەزانی ئـەتوانی بیـشاريتەوە بـەڵام پـەروەردگار ئاشـكرای ئـەكات و ئەیهێنێتـەوە بەرچـاوت هـەروەكو لەقورئانی پیرۆزدا فەرموويەتی:

﴿ يَعْلَمُ خَائِنَةَ الْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِي الصُّدُورُ﴾ (غافر:١٩)

خـۆت بێنـەرە پـێش چـاو چـەند بـچووكی و چـەند بـێ دەسـەڵاتی لەبـەردەم لێپرسـینەوەی پـەروەردگار، بزانـە ئەبێ چـۆن دڵـت لێ بـداو چـەند ئـارەقی شـەرمەزاری برێژیو چەند ترست لێ بنیشێت كە هیچیان سوودیان نـی یە لـەو ڕۆژەدا چونكە كـار لەكار ترازاوە.

ئەوكاتە پەشیمانی كەچۆن بێ ئەمری پـەروەردگارت كـردووە و ئـەو پەشـیمانی یـە هیچ سوودێكی نی یە.

ئەوپرسـیارانەی لێـت دەكـرێ دەربـارەی كـردەوە خراپـەكانت شـەرمەزارت ئـەكات بەجۆرێك لەم جیهانەدا شەرمەزاری لـەوجۆرە نـی یـە، چـونكە شـەرمەزاری پـەروەردگار لەوێنەی نـی یـە لـە هـیچ بوارێك دا. چـونكە پـەروەردگارت بـووە، ژیـانی پـێ بەخـشیت ڕۆحی كردە بەرت، هەموو شتێكی پێ بەخشیت، تەنها ئەو ئەمانەتەی خستە ئەسـتۆی تۆ كەبريتی بوو لەخواپەرستی و چاكەكردن و دووركەوتنەوە لەخراپەكاری.

پەروەردگار لەو ڕۆژەدا بەم جۆرە قسەت لەگەڵ ئەكات.

بۆچـی یـاخی بوویـت، بۆچـی شـەرمت نـەكرد لـەمن؟ ئایـا هـەموو شـتێكم پـێ نەبەخـشیت؟ ئایـا چـاكەم نـەكرد لەگـەڵتا؟ بۆچـی سـەرت لێ شـێوا بـەجۆرێك منـت لەبیرچـوو؟ تەمـەنی لاویـت بەچـی تـەواوكرد؟ هـەموو تەمـەنت بەچـی فەوتانـد؟ ئەوتەمەنەت لەكوێ هێنا؟ كێ پێ ی بەخشیت؟ لەچی دا سەرفت كرد؟ كـارت چـی بـوو چیت كرد؟ چی بەبیرتا دێت ئەی ئادەمیزاد لەوڕۆژەدا پـەروەردگار ئەوپرسـیارانەت لێ ئەكات كەبەفەرمانەكانی كارت نەكردووە؟

ئایا نوێژەکانت دەکرد یان گاڵتەت بەنوێژ دەهات، بڕوات بەپایەکانی دین هێنا یان سوکایەتیت پێ دەکردن، ماڵت لە حەڵاڵدا پەیدا دەکردو لە حەڵاڵدا خەرجت دەکرد یان گوێت بەحەڵاڵ و حەرام نەئەدا.

ئەگەر دڵ تەنگیت و پەشێوحاڵی و شەرمەزاری بیربکەرەوە چونکە لەوڕۆژەدا دووئەنجام هەیە:

١- تووڕەیی پەروەردگار.

٢- ڕەزامەندی پەروەردگار. (ئەگەر ڕەزامەندی پەروەردگار بوو لەوکاتەدا پەروەردگار ئەفەرموێ: ئەی بەندەی خۆم لەجیهان دا بۆم پۆشیت و ئەمڕۆ لێ بوردنم هەیە بۆت ).

ئا لەم کاتەدا لەجیاتی شەرمەزاری و دڵتەنگی و سەرلێ شێواوی ( دڵخۆش ئەبیت ) بیربکەرەوەو بیهێنەرەوە یادت ئەو ڕۆژە چ دڵخۆشی یەك هەیە لەوە باشتر کەڕەزامەندی پەروەردگارە لەوکاتەدا دڵخۆشیت بەڕزامەندی پەروەردگار هەروەکوو لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ مُسْفِرَةٌ ضَاحِكَةٌ مُسْتَبْشِرَةٌ ﴾ (عبس: ٣٨ ، ٣٩)

دیسانەوە بیهێنەرە بەرچاوت ئەگەر لەو تاقی کردنەوە گەورەیەدا سەرکەوتووبیت چەند دڵخۆشیت لەخۆشیدا خەریکە بفڕێ و گەش ئەبێتەوەو بەرەو بوونەوەرکانی تر ئەڕۆی بەدڵخۆشی یەوە ڕوومەتت ڕوون و گەش و پاك دیارە بڕوانامەی سەرکەوتنت لە تاقی کردنەوەی گەورەدا بەدەست هێناوە مەلائکە دەستت ئەگرن و لەناو هەموو بوونەوەرەکاندا ئەڵێن ئەمە فلانە کوڕی فلانە گەیشتە پلەی بەختیاری و ژیانی بێ کۆتایی بەسەرکەوتوویی لەلایەن پەروەردگارەوە پێ ی بەخشرا لەبەرکردەوەی چاکی خۆی لە جیهان دا هەروەکوو پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَاباً يَسِيراً وَيَنْقَلِبُ إِلَى أَهْلِهِ مَسْرُوراً﴾ (الانشقاق٩،٨)

واتە: ئەوەی بڕوانامەی سەرکەوتن بەدەستی ڕاستەوەبوو لێ پرسینەوەیەکی ئاسانی هەبوو ئەگەڕێتەوە بۆلای کەس و کاری بەدڵخۆشی.

هەروەها پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ فَيَقُولُ هَاؤُمُ اقْرَأُوا كِتَابِيَهْ إِنِّي ظَنَنْتُ أَنِّي مُلاقٍ حِسَابِيَهْ فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَاضِيَةٍ فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئاً بِمَا أَسْلَفْتُمْ فِي الْأَيَّامِ الْخَالِيَةِ﴾ (الحاقة: ١٩،٢٠، ٢١، ٢٢،٢٣، ٢٤).

واتە: ئەوەی بڕوانامەی سەرکەوتنی بەدەستی راستەوەبوو ئەڕواتە لای کەس و کاری و هاوڕێ یانی هەتاکو لای ئەوانەش کەنایان ناسێ ئەڵێ ئەوە بڕوانامەکەمە هابیخوێنەرەوە، من ئەمزانی رووبەڕووی لێپرسینەوەی پەروەردگار ئەبمەوە بەم جۆرە ئەوکەسە لەژیانێکی هەتاهەتایی خۆش دائەبێ لەبەهەشتی بەرین داو هەمووشتێکی باش و خۆشی بۆئامادەیە لەخواردن و خواردنەوە لە ئەنجامی کردەوەو کاری باشی خۆی دا و باوەڕبوونی بەپەروەردگار و بەجێ هێنانی فەرمانەکانیدا لەکاتی تەمەنی دا لەسەر زەوی.

بەڵام جۆری دووەم:

خواپەنامان بدات ئەوانەی خراپەکاربوون و باوەڕیان بەپەروەردگار نەبووەو کردەوەو کاری پەسەندو باشیان نەبووەو گوێ ڕایەڵی فەرمانەکانی پەروەردگار نەبوون لەژیانیان دا لەسەر زەوی.

پەروەردگار پێ یان ئەفەرموێ:

ئەی بەندەکانی من لەعنەتتان لێ بێت و من تووڕەم لێ تان لەوکاتەدا بە (الزبانیە)ناوئەبرێن لەلایەن پەروەردگارەوە فەرمان دەرئەچێت ، کۆت و زنجیر بکرێن و فڕێ بدرێنە دۆزەخەوە.

برای ئادەمیزاد بیربکەرەوە لەوڕۆژە ئەگەر لە جۆری دووەمیان بیت چیت بەسەردێت و چی فریات ئەکەوێ؟

بزانە چۆن وای بەدەست فەرمانبەرانی پەروەردگارەوە بەرەو دۆزەخت ئەبەن... روومەتت رەش بووەتەوە نامەی ریسوایت بەدەستی چەپەوە گرتووەو چەماویتەوە بۆ پشتت بوونەوەرە چاکەکان بێزت لێ ئەکەنەوەو نەفرەتت لێ ئەکەن ـــ شیوەن و پاڕانەوەت هیچ سوودێکی نی یە..

هەروەکو پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ وَرَاءَ ظَهْرِهِ فَسَوْفَ يَدْعُو ثُبُوراً وَيَصْلَى سَعِيراً﴾ (الانشقاق:١١، ١٠، ١٢).

واتە: ئەوەی نامەی کردەوەی خراپی بەدەستی چەپەوە لەپشتی یەوە گرتوویەتی. هاوارو ناڵەی لێ بەرزئەبێتەوەو بەرەو دۆزەخی ئەبەن.

دیسانەوە پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِشِمَالِهِ فَيَقُولُ يَا لَيْتَنِي لَمْ أُوتَ كِتَابِيَهْ وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيَهْ يَا لَيْتَهَا كَانَتِ الْقَاضِيَةَ مَا أَغْنَى عَنِّي مَالِيَهْ هَلَكَ عَنِّي سُلْطَانِيَهْ خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ثُمَّ الْجَحِيمَ صَلُّوهُ ثُمَّ فِي سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعاً فَاسْلُكُوهُ إِنَّهُ كَانَ لا يُؤْمِنُ بِاللَّهِ الْعَظِيمِ﴾ (الحاقة: ٣٣،٣٢،٣١،٣٠،٢٩،٢٨،٢٧،٢٦،٢٥)

ئەوەی نامەی شەرمەزاری گرتووە بەدەستی چەپی یەوە ئەڵێ:

خۆزگە ئەم نامەیەم نەئەهێناو نەم ئەزانی پلەم چۆنە نەسامان بەکەڵکم هات نەدەسەلاتم ئا لەوکاتەدا دیسانەوە ئەڵێن بیبەن کۆت و زنجیری بکەن حەفتا قۆڵ بێت و بەرەو دۆزەخ رەوانەی بکەن و فڕێ ی دەنە دۆزەخەوە چونکە باوەڕی بەخوای گەورە نەبووە.

مەلائکە دەستی ئەگرن و ئەڵێن ئەمە فلان کوڕی فلانە بێ باوەڕبووە بەپەروەردگار لەمەولا نازانێ خۆشی و بەختیاری چی یە.

ئیمامی "ترمزی" لەحارسی کوڕی عەبدولای هەمەدانییەوە دەگێڕێتەوەو دەڵێ: چوومە مزگەوت و سەیر دەکەم خەڵکی ڕۆچوون لە دەمەتەقێ کردنداو منیش چوومەلای عەلی (رضي الله عنه) و ئەم هەواڵەم پێ گەیاند: فەرمووی: باشە خەڵکی دەستیان داوتە شتی وا؟ وتم: بەڵێ! فەرمووی: بەلام من جارێکیان لە پێغەمبەری خوا (ص) بیست فەرمووی: ئاگادار بن، لەمەودوا فیتنە زۆر دەبێت، عەرزمکرد جا چارمان چی یە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: (چارتان) قورئانە.. (کتاب الله فیە نبأ ماقبلکم، وخبر مابعدکم، هو الفصل لیس بالهزل، من ترکە من جبار قصمە الله، ومن ابتغی الهدی في غیرە أضلە الله، وهو حبل الله المتین وهو الذکر الحکیم وهو الصراط

المستقيم، وهو الذي لا تزيغ به الاهواء ولا تلتبس به الالسنة ولايشبع منه العلماء، ولا يخلق على كثيرة الرد ولا تنقضي عجائبه، هو الذي لم تنتته الجن إذ سمعته حتى قالوا: (.. إنا سمعنا قرأنا عجباً* يهدي الى الرشد فامنا به..) (الجب:١-٢) من قال به صدق ومن عمل به اخر، ومن دعا اليه هدي الى صراط مستقيم")(١).

واته: دەنگوباسی پێش خۆتان و هەواڵی پاش خۆتانی تێدایە، دادوەری نێوانتان دەکات، ئەم قورئانە قسەی کار بڕ دەکات و شۆخی ناکات، هەرکەسێك لەترسی خەڵکی زۆردار وازی لێ بهێنێت خوا پشتی دەشکێنێ و هەرکەسیش عەوداڵی هیدایەت بێت و لەجگە لە قورئاندا بۆی بگەڕێ خوا ڕێگەی لێ ون دەکات، ئەم قورئانە (حبل)ی پتەوی خوای گەورەیە لە ئامانەوە شۆڕی کردۆتە خوارەوە بۆ بەندەکانی تا دەستی پێوەبگرن، ئەم قورئانە ئەو یادەوەرییە کەپڕە لە حیکمەت و دانایی، ئەوەیە ڕێگەی ڕاست و دروست.

ئەم قورئانە ئارەزووی خەڵکی ناتوانێ لای بدات و بەزمانی لوس کەس ناتوانێ گومان و دوودڵی تێدا دروست بکات، زانایان لەم قورئانە تێر نابن، زۆر وتنەوەی قورئان کۆنی ناکات و شتە سەرسوڕهێنەرەکانی کۆتاییان پێنایەت، ئەم قورئانە ئەو قورئانەیە کەکاتێك پەرییەکان گوێیان لێبوو خۆیان پێنەگیراو وتیان بەڕاستی گوێمان لە قورئان خوێندنێك بوو کە زۆر سەیر بوو، خەڵکی ڕادەکێشا بۆ ڕوشدو پێگەیشتن و ئێمەش بڕوامان پێهێنا، هەرکەس بەم قورئانە قسە بکات ڕاست دەڵێت و هەرکەسیش کاری پێ بکات پاداشت وەردەگرێت و هەرکەسیش خەڵك بۆ ئەم قورئانە بانگ بکات دەکەوێتە سەر ڕێگەیەکی ڕێك و ڕاست.."

**برای موسڵمان برای بەڕێزم:**

بڕوانە گوێ بیستی زانای بەناوبانگ (ئەنیشتاین) بەزانای ئەڵمانی شارەزای زانستی فیزیاو دانەری هەردووتیۆری ڕێژەیی و گشتی چی ئەڵێ

ئەم زانا مەزنە ئەڵێ:

---

(١) جامع الترمزي ١٧٢/٥ ورواه إبن الاثير في "جامع الاصول" من حديث عمر، هەروەها (الاستقامە/ إبن تيميە ٢٠/١).

((كات)) (راستی یەکی تاك نی یە بەڵکوو ڕەووشتێکی مادەیەو ئەم گەردوونە چواردەوری هەیەو وەکوو کتێبێك وایە هەموو ڕووداوەکانی پێشووی تێدا تۆمارکراوە لەگەڵ ڕووداوەکانی داهاتوودا)!!!.

هەروەها پەسەندی کردووە کەهەموو جووڵانەوەیەك هەموو دەنگێك و هەموو ڕەنگێك و هەموو کردەوەیەك و هەمووشێوەیەك لەناو مادەی (ئەثیر)داهەیەو ئەمێنیٚ و نافەوتیٚ لەبەرئەمەیە زانایانی زانستی نویٚ ئێستا زۆرهەوڵ ئەدەن ئامێری پێش کەوتوو دروست بکەن ئەودەنگ و ڕەنگانەی زەمانی دێرینی بدۆزنەوەو تۆماریان بکەنەوەو هەندیٚ ڕووداوی مێژوویی زۆر کۆنیش تۆمار بکەنەوە !!!ئەم زانایانە بەڵگەیان بۆ ئەم ڕاستی یە ئەوەیە : دەنگ کە دێتە دەرەوە بەهۆی جووڵانەوەی هەواوە تۆمار ئەکرێت ، بۆیە باوەڕی تەواویان هەیە ئەو دەنگ و ڕەنگانە لە ئەثیر دا ماون و ئەڵێن .

ئادەمیزاد لەیەکەم چرکەی ژیانی یەوە کە لە دایك ئەبێت تاکوو دوا هەناسەی کە ئەمرێت هەرچی کردووەو هەرچی ووتوە تۆمار کراوە لە ئەثیردا یە . کتێبی (القران والعلم الحدیث ص ٩٩)

**برای موسڵمان و خوشکی موسڵمان :**

ئەوەی ئەنیشتاین و زانایانی دوای خۆی و زانایانی ئەمڕۆ باسیانکردووەو باسی ئەکەن ــ پێش ئەوان و ١٤٢٥ساڵ لەمەوپێش پەروەردگار لەقورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿مَا يَلْفِظُ مِنْ قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾ (قّ:١٨)

واتە: ئادەمیزاد هەرچی قسەیەك لەدەمی دەرچێت چاودێری تایبەتی هەیەو تۆمارئەکریٚ و لەتۆمارگەی تایبەتی خۆی دا ڕۆژی دوایی خۆی ئەیبینیٚ و ئەیخوێنێتەوە:

دیسانەوە پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿وَكُلَّ إِنْسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَائِرَهُ فِي عُنُقِهِ وَنُخْرِجُ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كِتَاباً يَلْقَاهُ مَنْشُوراً، اقْرَأْ كِتَابَكَ كَفَى بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيباً﴾ (الاسراء: ١٣،١٤).

واته: هەموو ئادەمیزادێك كردەوەكانی بەتۆماركراوی بەملیەوە هەڵواسراوەو رۆژی دوایی بۆی دەرئەهێنن و بڵاوی ئەكەنەوەو پێ ی ئەڵێن خۆت بیخوێنەرەوە ئەمڕۆ ناتوانی حاشای لێ بكەی!!!.

هەروەها فەرموویەتی:

﴿وَوُضِعَ الْكِتَابُ فَتَرَى الْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَا وَيْلَتَنَا مَالِ هَذَا الْكِتَابِ لا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلا كَبِيرَةً إِلَّا أَحْصَاهَا وَوَجَدُوا مَا عَمِلُوا حَاضِراً وَلا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَداً﴾ (الكهف:٤٩)

مانای ئەوەیە كاتێ نامەی كردەوەكان دائەنرێ، تاوان باران بەسەر سامی یەوە ئەڵێن ئەم نووسراوە چی یە؟ هەرچی تاوانێكمان كردووە لە بچووك و لەگەورە ژماردوویەتی و نووسیویەتی بۆیان دەرئەكەوێ هەرچی یان كردووە نووسراوەو ئامادەیە پەروەردگاریش زوڵم لەهیچ كەسێك ناكات.

دیسانەوە پەروەردگار لەقورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿هَذَا كِتَابُنَا يَنْطِقُ عَلَيْكُمْ بِالْحَقِّ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنْسِخُ مَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ (الجاثية:٢٩)

واتە: هەرچی كردەوەیەكتان ئەكرد لەژیاناو لەدنیادا لەبەرمان ئەگرتەوە هەروەكوو باسمان كرد ووشەی (إستنساخ) مانای لەبەر گرتنەوەیە (Foto copy) ئایا كارەباو ئامێری لەبەرگرتنەوە چواردەسەدە لەمەوپێش هەبووە؟ بێ گومان نەخێر ــ بەڵام لەقورئانی پیرۆزدا هاتووەو ئەوەتا بەزانستی نوێ لەئامێری لەبەرگرتنەوە ئامێری پێش كەوتووتری هێنایەكایەوەو دروست كرا!!.

**برای ئادەمیزاد:** هۆشت بێ و ئەو رۆژە بێنەرە بەرچاوت خۆت لەمەترسی و شەرمەزاری ئەو رۆژە بپارێزە، خۆت بخەرە ریزی پیاوچاكان و باوەڕداران و دڵخۆشە سەركەوتووەكان ئەوانەی پەروەردگار لەم ئایەتە پیرۆزەدا باسیان ئەكات:

﴿إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنْتُمْ تُوعَدُونَ﴾ (فصلت:٣٠)

واته: ئەوانەی ئەیانگوت (ٱللّٰه)پەروەردگارمانەو ڕێك و پێك بوون مەلائکە دێنەلایان پێ یان ئەڵێن مەترسن و غەمبارمەبن مژدەیان ئەدەنێ بەو بەهەشتەی کەپەیمانیان پێ دابوون یان پەیمانیان پێ درابوو.

**کەوابوو:**

.....بۆچی هەموو ئادەمیزاد باوەڕیان نەهێنا بەپەروەردگار؟ پرسیارێکە زۆرجار دێتە بەرگوێمان و لەوانەیە خۆمان ئەم پرسیارە لەخۆمان بکەین.

هەموو ئادەمیزاد ڕێگەی خواپەرستی و بەختیاری هەتا هەتایی نەگرتووەتەبەر ئەمەش روون و ئاشکرایە لەهەموو کەسێك کەخاوەن ئەقڵ بێت.

رۆحی ئادەمیزاد زیندووە... هەموو زیندەوەرێکیش پێویستی بەخۆراك هەیە.

لەشی ئادەمیزاد لەتوخمەکانی زەوی پێك هاتووە بۆیە بەوخۆراکانە ئەژی کەلەزەوییەوە ئەڕوێن. واتە رووەك. هەر رووەکیشە ئەبێتەوە بەخۆراکی ئاژەڵ وشیرو بەرهەمەکانی و گۆشتی ئاژەڵەکان ئەبێتەوە بەخۆراکی ئادەمیزاد. کەوابوو ئادەمیزاد لەخاك دروست بووەو بەخاکیش ئەژی و ئەمرێ و ئەبێتەوە بەخاك.

ئەگەر ئادەمیزاد خۆراکی کەم بوو باش نەبوو توانای کەم ئەبێت و تەندروستی باش نابێت و بێ هێزئەبێت... بەپێچەوانەوە ئەگەر خۆراکی باش بوو توانای زۆرئەبێت و بەهێزئەبێت و تەندروستی باش ئەبێت ئەمە تەنها بۆلەشی فیزیاوی یان مادی ئادەمیزاد.

بەلاّم (رۆح) خۆراکی جیاوازەو خۆراکی رۆحی هەیە ئەو خۆراکەش (باوەڕە بەپەروەردگار).

هەتاکوو باوەڕی بەهێز بێت بە پەروەردگار ، ڕۆحی بەهێز ئەبێت، توانای بیرکردنەوەی زیاتر ئەبێت، ناخەڵەتێ، ئەو خۆراکە ڕۆحی یە کە (باوەڕە) ئەیخاتە سەر ڕێگەی ڕاست بەلاّم ئەگەر باوەڕی نەبوو بە پەروەردگار یان کەم بوو، ئەوە خۆراکی ڕۆحی کەمە، بگرە نامێنێ، یاخی ئەبێ لە پەروەردگار، توانای بیرکردنەوەی نامێنێ، باوەڕی بەپەروەردگار نابێت کەوابوو باوەڕ خۆراکی ڕۆحە لەو کاتەوە پەروەردگار دروستی کردووە، ئەقڵی پێبەخشیوە بۆ بیرکردنەوە بۆئەوەی باوەڕی هەبێت ، بەلاّم

هەرکەسێ ئەو ئەقڵە بەکار نەهێنێ، بیر نەکاتەوە ئەوە لە ڕێ ی ڕاستی خواپەرستی دوورئەکەوێتەوە ، بە پێچەوانەوە هەر کەسێك ئەو ئەقڵە بەکاربێنێ، بیر بکاتەوە ، ئەوە ڕۆحی تێر ئەبێت لە باوەڕ بە پەروەردگارو ئەیپەرستێ .

ئەم بیرکردنەوەو باوەڕ هێنانە بە پەروەردگار ..پلە پلەیە واتە :

تاکوو زیاتر بیر بکەینەوەو باوەڕ بە پەروەردگار بێنین زیاتر دوورئەکەوینەوە لە تاوان و خراپەکاری هەروەها بە گوێرەی پلەی بیرکردنەوەو باوەڕ بە پەروەردگاریش ڕۆژی دوایی پاداشتمان ئەداتەوە ولەبەهەشت بە پلەی ئەو خواپەرستی‌یە جێگەمان بۆ دابین ئەکرێت .

ئەگەر بیرمان لە هیچ نەکردەوە باوەڕ نامێنێ، ڕۆحیش لە دۆزەخ ئەبێت و ئەثیری‌یەو نابێ بە خۆڵەمێش وەکو لەشی فیزیاوی ڕزگاری بێت بەڵکو لە ئازاردایەو ئەسووتێ هەروەکو پەروەردگار فەرموویەتی :

﴿إِنَّهُ مَنْ يَأْتِ رَبَّهُ مُجْرِماً فَإِنَّ لَهُ جَهَنَّمَ لا يَمُوتُ فِيهَا وَلا يَحْيَى﴾ (طه:٧٤)

ئەوی بە تاوانباری بێتە لای پەروەردگار جێگەی دۆزەخە وە لە دۆزەخ دا ژیان و مردنی نی یە بێجگە لە ئازارو ئەشکەنجە .

برای ئادەمیزاد خۆت بیربکەرەوە لەدین و ئەرکە دینی یەکان و چاکەکردن چونکە بۆ بیرکردنەوە دروست کراوی بۆ فێر بوون و سەرنج دان نەك بۆ لاسایی کردنەوەی کەسانێك کەدروست کراوی پەروەردگارن .

**خوشکی بەڕێزو برای بەڕێزم :**

بیربکەرەوە لەو کۆئەندامەی کە پێ ی ئەڵێن (مێشك) کە پەروەردگار پێ ی بەخشیون بەکار بێنن بۆ خۆتان مەی دەنە هیچ کەسێك بەبێ بیرکردنەوە بەکاری بێنێ بۆ خۆی !!!

واتە خۆت هەڵ مەواسە بەکەسداو خۆت مەکە بە داردەستی کەس تاکو خراپ بەکارت بێنێ ، بۆخۆت بژی بۆ خۆت بیربکەرەوە زۆر چاك بزانە زۆری ژمارە هیچ نی یە مەڵێ زۆربەی خەڵك ئەوە ئەکەن بۆ منیش نەیکەم ، خۆت ڕاستیەکان بدۆزەرەوە چونکە زانا بەناوبانگەکانی جیهان کاتێ ڕاستی یەکیان ئەووت زۆربەی خەڵك

گاڵتەیان پێ ئەکردن، بە شێت و سەرلێ شێواویان ئەزانین ، بەلاَم لە ئەنجاما ڕاستی یەکان ڕوون بوونەوە خەڵك ڕێزیان بۆ دانان .

ئەگەر لەسەرەتاوە بە دەنگ دان بووایە زانای بەناوبانگ ئەنیشتاین یان اسحاق نیوتن کە خاوەنی تیۆری زانستی زۆر گرنگن لایەنگریان زۆر کەم بوو بەلاَم پاشان زانست سەلماندی کە ڕاست ئەکەن، لای هەمووان ڕێزیان بۆ دانرا .

پەروەردگار فەرموویەتی لە قورئانی پیرۆزدا :

﴿كَمْ مِنْ فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللَّهِ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾ (البقرة:٢٤٩)

کەوابوو هەموومان بیربکەینەوە بۆ دۆزینەوەی ڕاستی یەکان چاو لە کەس نەکەین و ڕاستی بدۆزینەوە، کەسایەتی خۆمان بەهێز بکەین، باوەڕمان بە خۆمان هەبێت بۆ دۆزینەوەی هەموو ڕاستی یەك ،چونکە شوێن کەوتن و لاسایی کردنەوە کەسایەتی بێ هێز ئەکات و بێ باوەڕی ئەکات بە تایبەتی باوەڕ بە پەروەردگار، ئەمەش ئەبێتە هۆی نەبوونی ئاین ، ئاینیش نەبوو ویژدان نامێنێ ڕۆح پیس ئەبێت، چارەسەر ناکرێ چوونکە وەکو نەخۆشی لەشی فیزیاوی نی یە ئەگەر گورچیلەیەك لەکارکەوت ئەیبڕن ئەوی تریان کار ئەکات ، ڕۆح نەشتەرگەری ناکرێت .

پەروەردگار فەرموویەتی :

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَيْكُمْ أَنْفُسَكُمْ لا يَضُرُّكُمْ مَنْ ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ إِلَى اللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعاً فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ﴾(المائدة:١٠٥)

# (ئامۆژگاریەك بۆ هەموو ئادەمیزاد)

**خوشكو برای ئادەمیزاد:**

ئەگەر تەماشایەكی گەورەیی و فراوانی گەردوون بكەین، ئەگەر بیرلەدروستكراوە سەرسوڕهێنەرەكانی بكەینەوە ئەگەر تەماشای جیاوازی دروست كراوەكان بكەین ئەبینین هەریەكەو كارێكی تایبەتی خۆی هەیەو هەریەكە و یاسایەكی تایبەتی خۆی هەیە بەبێ زۆربوون یان كەم بوونەوە یان تێك چوون، هەموو كارەكان بەڕێوە ئەڕۆن بەڕێكو پێكی، هەرچەندە لەسەرەتاوە هەموویان یەك بوون.

هەر لەگەردێكەوە كەبەچاو نابینرێ دروست بوونو جوولانەوەی وەكوو دروست بوونو جووولانەوەی كۆمەڵەی خۆرە.

ئەم دروست كراوانەو ئەویاسا ڕێكو پێكانە زانایانی ئەم سەردەمەی سەرسام كردووە، هەتاكوو بیربكەنەوە، هەتاكو زانستی زیاتر بزانن باوەڕیان بەپەروەردگار زیاترئەبێت چونكە یاساوڕێكو پێكی لەخۆیەوە دروست نابێت ... خانەیەكی لەش چەندە بچووكە ژمارەیەكی زۆر زۆرن ئەم لەشە گەورەیان پێك هێناوە هەریەكەو --- یان هەركۆمەڵەی كارێكی پێ سپێراوە بەردەوام تاكۆتایی ژیان ئەنجامی ئەدات ئەمە ڕێكخراوی پەروەردگارە (هەموو ڕێكخراوێك ڕێك خەرێكی هەیە)

لەگەڵ بینینی ئەم راستی یانەدا، زۆربەی ئادەمیزاد وا بیرئەكەنەوە كەلەم گەردوونەدا هەرخۆیەتی و زۆربەسەر لێ شێواوی ئەژیو خۆی بەسەربەست ئەزانێ و لەپڕێك دا، لە ناكاودا ژیانی كۆتایی دێت.

هەموو بەشەكانی زانست بۆیان دەركەوتووە كەگەردوون یاسایەكی تایبەتی ڕێكوپێك ئەیبا بەڕێوە زۆر سەرسوڕهێنەرە كەبەجۆرێكە ناگۆڕێ و تێك ناچێت واتە فەرماندەیەكی زۆربەدەسەڵاتی هەیە.

كەوابوو كێ ئەویاسایانەی داناو ئەركی دابەش كرد بەسەر هەموو گەردەكانی مادە لەگەردوون دا لەهەمووخانەكانی بوونەوەرەكاندا؟

كێ ئەم هەموو راستی یانەی ڕێك كردوو یەكی خستن و پەیوەندیان بەیەكەوە بەست؟

کیٚ نەخشەی کێشاو کیٚ دروستیکرد؟

ئەوهەموو کارویاساو راستی یانە لەگەردوون دا بەرچاومان ئەکەون یان زاناکان ئەیسەلمێنن هەموونیشانەی بوونی پەروەردگارن نیشانەن بۆخاوەن ئەقڵەکان بۆخاوەن هەستەکان کەپەروەردگار دروستی کردوون.

ئێمەی ئادەمیزاد زۆرباش ئەزانین کەتوانای پەروەردگارە ئەرکی داوە بەسەر هەموو بوونەوەرێك دا لەگیان دارو لە بیٚ گیان کەوابوو چۆن ئەرکێك نادات بەسەر ئادەمیزادا کەبەرهەمی گەردوونە ، لەبەرئەوە لەپێش هەموو بوونەوەرەکانەوە ئادەمیزاد ئەرکی لەسەرە.

چونکە پەروەردگار ئادەمیزادی زۆر پیرۆزدروست کردووەو رێزی بۆداناوە، جیای کردوەتەوە لەهەموو بوونەوەرەکانی تر بەئەقڵ.

هەروەها ئادەمیزادی بەجۆرێك پیرۆز دروست کردووە لەقورئانی پیرۆزدا باسی کردووە:

﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً﴾ (الاسراء: ٧٠)

واتە: رێزمان لە ئادەمیزاد ناو پیرۆزمان کرد.

**مەولانا فەرموویەتی:**

فەرمانڕەوای زۆردار، فەلسەفەی بە هەڵەداچوو، ئاینە دەسکاری کراوەکان...... بوونەتە هۆی کەم کردنەوەی نرخی مرۆڤو هێنانە خوارەوەی رێزو شەرەفی.

هەروەها فەرموویەتی: گەدەو مادە پەرستی بریتی یە لە پەردەیەکی ئەستوور لەنێوان تۆو پەروەردگارت، ئەگەر ئەو پەردەیەت لابرد...ئەوکاتە لەنێوان تۆو پەروەردگار هیچ جۆرە بەربەستێك نامێنێت...کەوابوو سنووری گەدەو مادە ببڕەو بڕۆ بەرەودڵ.

دیسانەوە ئەفەرمووێ:

مرۆڤ پوختەی ئەم گەردوونەیە و کۆی وەسفەکانی جیهانە، لەم لەشە بچووکەدا نموونەی هەرچی شت هەیە لەم جیهانەدا کۆبۆتەوە، لەخێرو گەنجینەو شتی جوان و سەرسوڕهێنەر، ئەم مرۆڤە ئەتۆمێکی بەنرخەو خۆری تێدا پێچەوانەبوەتەوە!!

ئەگەر هەڵهات هیچ جۆرە ئەستێرەیەك دەرناکەوێت!!.

ئەوتەنها یەك دڵۆپە ئاوی بچووکە، کەچی دەریای زانستی تیادا ڕژاوە.

مرۆڤ ئامانجی ئەم دروستکراوانەیە لەپێناوی ئەودا جیهان دروست کراوە درێژی یەکەی بەتێکڕایی (٣ گەزە) کەچی جیهانی تێدا پێچراوەتەوە!!

مرۆڤ ئامانجی ئەم دروست کراوانەیەو هەموو بوونەوەر حەسودی پێ دەبەن تەنانەت مەلائکەش بۆیە پەروەردگار گوێڕایەڵی لەسەر فەرزکردووە.

ئەگەر نرخی ئەم مرۆڤە بدرکێنم

خۆم دەسووتێم و گوێ گریش دەسووتێنم نووسەر

﴿وإذْ قَالَ ربك للْملائكَة إني جاعلٌ في الْأرض خليفَةً قَالُوا أتجعلُ فيها مـن يفْـسِد فيهـا ويسفك الدماءَ ونحن نسبح بِحمدك ونقَدس لَك قَالَ إني أعلَم ما لا تعلَمونَ﴾ (البقرة: ٣٠)

واتە: پەروەردگار فەرمووی بەمەلائکەکان من لەسەر زەوی خەلیفەیەکم دروست کردووە کەئادەمیزادە.

هەروەها زۆر روون و ئاشکرایە هەرچی لەگەردوون دا هەیە هەمووی خراوەتە ژێر دەسەڵاتی ئادەمیزادەوەو بۆی هەیە بەکاری بێنێ لەوشتانەی ئاشکرایە یان تاکوو ئێستا نهێنی یە لای ئادەمیزاد و دیسانەوە لەقورئانی پیرۆزدا پەروەردگار فەرموویەتی

﴿أَلَم تروا أَن الله سخر لَكُم ما في السماوات وما في الْأَرض وأَسبغَ علَيكُم نِعمـه ظَـاهرةً وباطنةً ومن الناسِ من يجادلُ في الله بِغيرِ علْمٍ ولا هدى ولا كتابٍ منِ ﴾ (لقمان: ٢٠)

واتە: زۆر کەسانێك هەن گفت و گۆی ناڕەوائەکەن دەربارەی پەروەردگار بەبێ زانست و تێ گەیشتن و بەبێ نووسراوێکی راست و ئاشکرا.

کەوابوو ئادەمیزاد پێش هەموو بوونەوەرێك ئەبێ فەرمانی پەروەردگار بەجێ بێنێ و ئەرکی سەرشانی یەتی هەموو فەرمانەکانی بەجێ بێنێ.

ئایا ئادەمیزاد توانای هەیە بۆ هەتا هەتایی ئارەزووەکانی خۆی بژی و گوێ نەداتە فەرمانەکانی پەروەردگار؟.

بێ گومان نەخێر چونکە کاتێك دێت ژیانی کاتی کۆتایی دێت و ئەڕوا بۆ ژیانی هەتاهەتایی.

کەوابوو پەروەردگارناسین و گوێ ڕایەڵی فەرمانەکانی تاکە ڕێگەی رزگار بوونمانە لەهەموو ناخۆشی و گیروگرفتێك.

﴿قد جاءَكُم من الله نور وكتاب مبين يهدي به الله من اتبع رضوانه سبلَ السلامِ ويخرجهم من الظلُمات إلى النور بإذْنِه ويهديهم إلى صراط مستقيمٍ﴾ (المائدة:١٥،١٦)

کەوابوو بەرنامەی ئادەمیزاد قورئانی پیرۆزە کەڕێگەی راستی نیشان ئەدات، ڕێگەی راستی و ڕێگەی مرۆڤایەتی و برایەتی و هاوکاری و یەکێتی...... هتد...

ئەوقورئانەی بەهۆی مەلائکە (جبرئیل)ەوەنێرراوە بۆ خۆشەویستی پەروەردگار محمد (د.خ)ی نەخوێندەوار ئەوپێغەمبەرەی کە نە خۆی و نەئادەمیزادەکانی دەوروبەری لەموسڵمانان و لەخوانەناسان لەوکاتەدا مانای (جیولوجیا ـ بیولوجیا ـ کیمیا ـ فیزیا ـو هەموو جۆرە زانستەکانی تریان نەزانیوە).

ئەوقورئانەی بەوەحی لەپەروەردگارەوە بۆی هات هیچ شتێك نەماوە لەگەورەو بچووك باسی نەکات.

بەشێوەیەك هاتووە کەلەهەموو کاتێك دا نوێ بێت هەروەکوو لەکاتی خۆی دا هەندێ لە ئایەتە پیرۆزەکانی مانایان زانراوەو پەیڕەوی کراوە پاشان هەندێکی تریش بۆکاتەکانی دوای خۆیان هەروەها هەندێ ئایەتی تریش کەزانست لەم دوایی یەدا بەهۆیانەوە هەنگاوی زۆرگرنگی ناوەو پێش کەوتووە هەروەها بۆ لەمەولاو دواتریش هەندێکی تری ئەبێت بەڕوون کەرەوە بۆپێش کەوتنی زانست چونکە زۆر زۆری ماوە بۆکاتەکانی داهاتوو هەروەها ئەم قورئانە بۆ هەموو کاتی تەمەنی گەردوون هاتووەو باسی سەرەتای بوون ئەکات تا کۆتایی هەموو گەردوون و بوون.

هەروەكوو پەروەردگار لەم قورئانەدا فەرموويەتی:

﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾ (فصلت:٥٣)

فێربوونی ئەوبەرنامەیە کەپەروەردگار ناردوویەتی بەخەڵات بۆ هەموو ئادەمیزاد وەکوو فێربوونی زانستەکانی تر نی یە ـ بەڵکو زانستەکانی تر جیاوازن و هەریەکەیان باسی لایەنێکی جیاوازی شتە سەرسوڕهێنەرەکانی گەردوون ئەکەن.

بەڵام قورئانی پیرۆز باسی هەموو گەردوون و بوون و بوونەوەر ئەکات باسی مێژووی رابووردووی پێش مێژووی کۆن ئەکات.

باسی کۆمەڵایەتی و تەندروستی و یەکسانی و دادوەری و چاك و خراپ و چیرۆکی هەمەجۆری نەوە کۆنەکان ئەکات لەهەر نەتەوەو تیرەو رەگەزێك بووبن بەبێ جیاوازی.

هەروەکوو پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْأِسْلامَ دِيناً﴾ (المائدة:٣)

قورئانی پیرۆز ژیانی سەرزەوی کاتی و ژیانی هەتا هەتایی رۆژی دوایی باس ئەکات و فەرمان ئەدات سوودەکانی سەرزەوی بۆ بەرژەوەندی خۆمان و مرۆڤایەتی بەکاربێنین و فەرمان ئەدات نهێنی‌یەکانی ئاسمانەکان بدۆزینەوە ــ هەروەکوو فەرموویەتی:

﴿يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالْأِنْسِ إِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَنْ تَنْفُذُوا مِنْ أَقْطَارِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ فَانْفُذُوا لا تَنْفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَانٍ﴾ (الرحمن:٣٣)

واتە: ئەی جەماوەری ئادەمیزادو جنۆکە ئەگەر توانیتان بڕۆن بۆ جیهانەکانی ئاسمان بڕۆن بەڵام ناڕۆن بەبێ هۆیەك و دەسەڵاتێك.

## قورئانی پیرۆز بۆ هەموو کات و شوێنێکە.

بەرنامەو یاسایەکە هیچ نەگونجاوێکی تێدانی یە لەگەڵ ئەقڵ و بیرکردنەوە لەگەڵ هەموو کاتێك دا ئەگونجێ لەگەڵ هەموو بیرێکی پاك و راست و بێ گەرد دا ئەگونجێ لەگەڵ هەموو زانستێکی پێش کەوتوودا ئەگونجێ و لەگەڵ هەموو رەوشتێکی پاك و

تێگەیشتوودا ئەگونجێ‌و داوای یەکسانی و ئازادی‌و برایەتی و یارمەتی و یەکێتی ئەکات‌و هۆی پێش کەوتن‌و بەختیاری سەرجەم ئادەمیزادە لەم جیهانەدا ـ هەروەکو پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿مَا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِنْ شَيْءٍ ثُمَّ إِلَى رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ﴾ (الأنعام: ٣٨)

ئەم قورئانە پیرۆزە پارێزراوەو ئەمێنێ هەتا کۆتایی ژیان‌و گەردوون، ناگۆڕێ‌و دەستکاری ناکرێ‌و کەم‌و زۆرناکرێ هەروەکوو کتێبەکانی تر چونکە ئەمە پەیامی پەروەردگارە، پەروەردگار ئەیپارێزێ هەروەکوو فەرموویەتی:

﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾ (الحجر:٩)

ئەم قورئانە بەرنامەیەکی راست‌و دروستی یاساکانی جیهانی و رۆژی دوایی یە پەیڕەوی راستی و دروستی یەو لاری‌و پێچاوپێچی تێدانی یە بەڕاست‌و چەپ دا بۆدووبەرەکی و ناڕێکی هەروەکوو فەرموویەتی:

﴿وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيماً فَاتَّبِعُوهُ وَلا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ (الأنعام:١٥٣)

نیشانەی گومان پەسەندناکات‌و ماوەنادات بەفەلسەفەی نادروست‌و گومان لێ کراو، باوەڕ ناخاتەسەر قسەو سەلماندن ئەگەر دڵنیایی لەگەڵ نەبێت هەروەکو پێغەمبەرمان لەفەرموودەیەکی دا فەرموویەتی:

((وَإِنْ إفْتَاكَ الْنّاسْ أفتُوكَ)) ئیمام ئەحمەد گێڕاوی یەتەوە.

کەوابوو گومان نی یە لەوەحی دا، کەی تاریکی زاڵە بەسەر رووناکی دا؟

پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿وَمَا يَتَّبِعُ أَكْثَرُهُمْ إِلَّا ظَنّاً إِنَّ الظَّنَّ لا يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئاً إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِمَا يَفْعَلُونَ﴾ (یونس:٣٦)

قورئانی پیرۆز بیرمان دەخاتەوەو داوامان لێ ئەکات تەماشای بوونەوەرەکان بکەین‌و تەماشای رووداوەکانی سروشت بکەین چونکە بوونی پەروەردگار ئەسەلمێنن:

﴿صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ إِنَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَفْعَلُونَ﴾ (النمل: ٨٨)

هەروەها فەرموویەتی:

﴿قُلِ انْظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا تُغْنِي الْآيَاتُ وَالنُّذُرُ عَنْ قَوْمٍ لا يُؤْمِنُونَ﴾ (يونس:١٠١)

سەیر بکەن وردببنەوە بزانن چی لەزەوی و ئاسمانەکاندا هەیە هەرچەندە بەڵگەی زۆریش سود بەوانە ناگەیەنیٚ کە بڕیاریانداوە بێباوەڕ بن !

مەبەستی دروست کردنی گەردوون ئادەمیزادە و بەرهەمی زیاتر لە (٢٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) بیست هەزار ملیۆن ساڵی دەست پیٚ کردنی گەردوونە. واتە بیست ملیارساڵ ئادەمیزاد لەپێشەوەی هەموو بونەوەرەکانە بۆ بەجیٚ هێنانی ئەوئەرکەی پەروەردگار بۆی دیاری کردووە.

کەوابوو بۆچی هەندیٚ ئادەمیزاد لەشی فیزیاوی خۆی خەریك ئەکات بەڕابواردنی کاتی و بیٚ ماناو بیٚ سوودەوە و ژیانێکی ئاژەڵی ئەویٚ لەم جیهانەدا؟

بەڵام وازئەهێنی لەڕۆحەکەی هەروەها لەئەقڵەکەی و لەشە ئەثیریەکەی لەدڵە ڕاوکیٚ دابێت و ڕاستی ئەم ژیانە ئەزانیٚ کاتی یە و ژیانی دوایی و هەتا هەتایی دێتە پێشەوە دوای ئەم تەمەنەکەمەی سەرزەوی؟

هەندیٚ لەئادەمیزاد خۆی گێل و بیٚ ئاگا ئەکات هەروەکوو (نەعامە) ئەبینین سەرئەکات بەخۆڵ دا بۆئەوەی دیارنەبێت بەڵام لەشی گەورەیەو بەدەرەوەیە ئەبینریٚ، خۆی کەس نابینێت وا ئەزانیٚ کەسیش ئەونابینیٚ!!.

خوشك و برای ئادەمیزاد: پەروەردگار ئێوەی لەڕیزی پێشەوەی هەموو دروستکراوەکانیەوە داناون، بەو ئەقڵ و بیرو هێزەی پیٚ ی بەخشیون بوون بەسەرداری هەموو بوونەوەر....

کەوابوو بۆچی پارێزگاری خۆمان نەکەین و ئەوئەرکانەی پێمان سپێرراوە لەلایەن پەروەردگارەوە بەڕاستی بەجیٚ یان نەهێنین و پارێزگاریان نەکەین؟

بۆچی سوپاسی پەروەردگارنەکەین ئەو هێزودەسەڵاتەی پیٚ بەخشیوین کە بەهیچ بونەوەرێکی نەبەخشیوە؟

ئـەو ئەركـەی پـێ ی سـپاردووین گـوێ ڕایـەڵی كـردن و بـەجێ هێنـانی لـەقورئانی پیرۆزدا دیاری كردووه بۆمان.

تەماشای فەرموودەی رابەری ئیسلام محمد (د.خ)بكەن كه ئەفەرمووێ:

((ألاَ إنّها تَكونْ فتنة، فَقُلْتَ مَاالْمُخرَجْ منْها يارسول الله؟ قال: كتاب الله، فيه نَبَأ مَاكانَ قبْلَكُمْ وَخَبَر مَابَعدكُمْ وَحُكم مَابينَكُمْ هُوَ الْفَصلْ لَيْسَ بِالْهَزلْ، مَنْ تَرَكَهُ مَنْ جبارٌ قصمه الله، وَمَنْ أتَبَعَ الْهُدى في غَيره أَضلْهُ الله وَهُوَ الْحَبلْ الله الْمَتينْ، وَهُوَ الْذكرّ الْحَكيّمْ، وَهُوَ الْصِرّاطْ الْمُسْتَقيّمْ، هُوَ الَّذي لاَتزيغْ به الأَهواءْ، ولاَتَلْتَبِسْ به الألْسنة، ولاَيَشْبَعْ منْهُ الْعُلَماءْ ولاَيَخْلَقْ على كَثرةَ الرَّدْ، ولاَتَنقضي عَجائبهُ، هُوَ الَّذي لَمْ تَنتَه الْجِنْ إذ سَمِعْتهُ حَتى قَالُوا: إنّا سَمِعْنا قرآناً عجباً يَهدي إلَى الْرُّشدْ، مَنْ قَالَ به صدقَ، وَمَنْ عَمِلَ به أجرَ، وَمَنْ حكَمَ به عَدلْ، وَمَنْ دَعا إليه هُدى إلى صراطْ مُسْتَقيّمْ)) صدق رسول الله. (الترمذي گێڕاویەتەوە لەعەلی كوڕی أبی طالبەوە خوایان لێ رازی بێت.)

كتێب و ووتاری پەروەردگار قورئانی پیرۆزە هەموو راستی و یاساكانەو رێگای راستەقینەیە بۆجێ بەجێ بوونی ئاواتەكان.

هەموو زانستەكان و تیۆرەكان پەسەندناكات تاكوو بەتاقی كردنەوە راستی یان روون نەبووبێتەوەو بەرهەمیان دەرنەكەوتبێ و ئەقڵ پەسەندی كردبێ هەروەكوو پێت بڵێ ئەی ئادەمیزاد بەتاقی كردنەوەو بەفێربوون و بەتێ گەیشتن ئەگەیتە ڕاستی.

(كەوابوو ئەبێ ووریابین له ((گومڕایی زانستی)) ((الضلالة العلمية)))

لێرەدا ئەم رستەیە شی كردنەوەی یەك كتێبی چاكی پێویستە بنووسرێتەوە لەبەرئەوە تەنها رستەكەمان نووسی لەبەركەمی ماوەی ئەم كتێبەمان لەتەواوبوون دایە.

قورئانی پیرۆز پێمان رائەگەیەنێ:

فێربن و تێ بگەن و تاقی كردنەوەبكەن تاكوو ئەگەنە راستی، وەهیچ شتێك پەسەند ناكات بەبێ پشكنین.

سروشت بەسەر پۆشێك داپۆشراوە دەرناكەوێ بە بەردەوامی تێكۆشان بەووریایی یەوەو بەتێبینی و تاقی كردنەوەی بەهێزنەبێت.

چونكه راستی لەدایك بووی زانین و ئەقڵەو ئامادەبوون بۆ تێ گەیشتن سەرەتای باوەڕە، برای ئادەمیزاد:

ئەمە ڕێگەمانە لەژیانا لەسەر ڕۆشنایی ئەم ڕێگەیە باوەڕمان پتەو بكەین بەم ئایەتە پیرۆزە:

﴿قُلْ هَذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللَّهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَا وَمَنِ اتَّبَعَنِي وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ (يوسف:١٠٨)

ئەمە راستی یەكە پێویست بە گفتوگۆ ناكات تەنها ئەوانە نەبن گومڕابوون و نوقمی دڵە راوكێ و تاریكی بوون و باوەڕیان بەفەلسەفەی مادی هەیە تاوێك و جارێكی تریش بە كوفرو گومڕایی و خوانەناسی.

چەندەجوانە ووتاری نووسەری جیهانی (الدوس هكسلی)

لەكتێبی (من ألحان الأيمان ١) نووسەری بەناوبانگ طه عبدالباقي سرور)دا هاتووە لاپەڕە (٨) كەفەرموویەتی:

(ئەو ئادەمیزادەی تەنها بەعەقڵی خۆی هەمووشتێك پەسەندئەكات دوور لەڕۆحی و زانستی رۆحی ئەوە ئادەمیزادێكە لەگەڵ ئاژەڵ دا یەك ئەگرێتەوە هەرچەندە خۆی جوان كات بەشارستانی و زانستی و عەقڵ هەروەها ئەڵێ: ئادەمیزاد فەوتاوە ئەگەر پاشەڕۆژی خۆی لەسەر زانستی مادی بنیات بنێ بەتەنها، بەڵكو ڕێگەی راستی و بەختیاری ئەوەیە ئادەمیزاد بەرەو باوەڕهێنان بەهێزی سەرەوە بڕوات. هەروەها ئاشتی یەك بژی لەسەرخۆشەویستی جیهانی رۆحی بنیات نرابێ، هەروەها ئامانجی ئادەمیزاد ئەوەبێت باوەڕی بەجیهانی رۆح و پەروەردگار بێت و خۆی پەیوەند كات بەم ڕێگەیەوە بەڕاستی هەمیشەیی......))

پەروەردگار راستی یە، هەرچی شتێك ئادەمیزاد نزیكی پەروەردگارنەكاتەوە بێ مانایەو پووچەڵە، چونكە ئامانج سەركەوتنە بەدەسكەوتی ڕەزامەندی پەروەردگار.

لەبەرئەوە پێویستە هەوڵ بدا بۆ ئەم ڕەزامەندی یە هەرچەندە لەشی فیزیاوی بەرەنگاری ئەوەستێ و ململانێ ی رۆح و لەش دەست پێ ئەكات ـ ئەوكاتە لەقەراغی كانیاو گوڵ و ڕێحانەی جوان سەوزئەبێت كەهەموو رابواردنێكی نابەجێ و نادروست

بخەینە لاوەو رەوشت بەرزیو پەروەردگار پەرستی ئامانجو دروشمی لەشو رۆح بێت.

ئەوکاتە رۆح روونـاك ئەبێتـەوەو هەست بەگەورەییو دەسەڵاتی پەروەردگارو ووردەکاریو هێزی ئەکەینو باوەڕی تەواومان پێی ئەبێت.

پێغەمبەرمان محمد (د.خ) لەفەرموودەیەکی قودسی دا ئاگادارمان ئەکات کە لە پەروەردگارەوە ئەیگێڕێتەوە بۆمان((.....وَمَايَزالُ عَبدي يَتَقرّبْ إلي بِالْنَوافلْ حَتَى أحَبّه فَإذا أحبتهُ كُنتَ سَمعه الّذي يَسْمع بِه، وَبَصَرهِ الَّذي يَبْصربه، وَيَدهِ الَّتي يَبْطِشْ بِها، وَرّجلِه الَّتي يَمشي بِها، وَإِنْ سَأَلني لأعطَيته وَلَئِنْ إستِعاذني لأعيذته)) بوخاری لە صحیحەکەیدا گێڕاویەتەوە.

لەم کاتەدا خۆشیو رەزامەندی ئەبارێ بەسەریا، مانای رێكوپێکی و نهێنی ژیانو تەواوبوون ئەزانێ.

هەروەکوو پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿يُؤْتِي الْحِكْمَةَ مَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْراً كَثِيراً وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ﴾ (البقرة:٢٦٩)

پەروەردگار فێری کرد کەهیچ کەسێك ناتوانێ فێری کات.

هەروەکوو فەرموویەتی:

﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ اللَّهُ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ (البقرة:٢٨٢)

گەیشتن بۆئەم ئامانجە بۆئەوکەسەیە تێ ئەکۆشێو بەردەوامەو چێژ ئەکا و هەست ئەکا بەتامو چێژی رۆحی کەئەقڵی ئێمە نایزانێ.

کەس هەستی پێ ناکات خاوەنەکەی نەبێت هەروەکوو خاوەنەکەی ئەڵێ: ئێمە لەخۆشیەك داین ئەگەر پاشاکانی سەرزەوی بزانن بەهەموو چەکێك شەڕمان لەگەڵ ئەکەن.

پێغەمبەرمان محمد (د.خ)فەرموویەتی:

((ذَاقَ طَعمُ الإيمانْ مَنْ رَّضي بِاللهِ رَّباً، وبِالأسلاَمِ ديناً، وبِمُحَمّدٍ رَّسولاَ)). مسلم والترمذی گێڕاویانەتەوە لە عەباسی کوڕی عبدالمطلب.

واتـــە: تـــام و چـــێژی بـــاوەڕ لای کەســـێکە کەپـــەروەردگار ئەپەرســـتیٚ و بـــاوەڕی بەئیسلامەو بەمحمد (د.خ) کەنێرراوی پەروەردگارە.

**برای ئادەمیزاد:**

ئەگـەر بـاوەڕت بـەهێز بـوو بەپـەروەردگار لـەم جیهانـەدا چـاوت پۆشـی لەهەنـدیٚ خۆشـی بـۆ رۆژی دوایـی هیـچت لەدەست نەچووە تـەنها چـەند خۆشـیی یـەکی لەشـی فیزیـاوی نـەبیت. بـەلاٚم خۆشـی رۆح و نـەمانی تـرس و دڵـە راوکـیٚ و روونـاکی بـیرو زۆرشتی ترت دەست ئەکەویٚ. لەبەرئەوە ئادەمیزادی ئاقلٚ رێگـەی بـاوەڕ ئەگرێتـە بـەر لەبەر دووهۆ:

١- خۆشی بۆ لەشی فیزیاوی ئەتکات بەهاوڕیٚ ی ئاژەڵەکان کە هیچ نازانن.

٢- ئەم خۆشی یە کاتی یەو کۆتایی دیٚت.

جیهان کێڵگەی رۆژی دوایی یە، لەبەرئەوە چاك بچێنە چاکە ئەدووریتـەوە. چاکە بکەو باوەڕت بەهێزبکەو پەروەردگار پەرست بە بۆ ئەورۆژەی کەهـەموو کردەوەکانـت ئەخرێنە بەردەستی پەروەردگارو هیچی ناشارێتەوە بۆت.

ئـەوەی ئـەم گـەردوون و بـوون و بوونـەوەرەی دروسـت کـرد لەنەبوونـەوە ئـەتوانیٚ رۆحـی تـۆ رۆژی هەسـتانەوە ئامادەبکاتـەوە بەلەشـەوە بـەجۆرێکی ئـەثیری جیـاواز لەلەشی فیزیاوی بۆپرسیارو وەلاٚم و لیٚ پرسینەوە، ئەم گەردوونە سەرسووڕهێنەرە بیٚ خاوەن نی یە.

﴿وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئاً وَإِنْ كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَى بِنَا حَاسِبِينَ﴾ (الانبياء:٤٧)

لەبەرئەوە ئاگات لەخۆت بیٚ و وریابە هەولٚ و کۆششت تەنها ئـەوەبێت بەڕوویـەکی گەشەوە بەرامبەر پەروەردگارت بوەستی لەڕۆژی دوایی دا..خۆشی کاتی و نادروسـتی ئەم جیهانەت واز لیٚ بێنە

بۆ ئەو ڕۆژەی ژیانی هەتا هەتایی و خۆشی هەتا هەتایی دەست پیٚ ئەکات.

تەمـەنت بەفیڕۆمـەدە ئاگـاداری پێـنج کاربـە لـەپێش پێـنج کـاری تـردا هـەروەکو پێغەمبەرمان محمد (د.خ) فەرموویەتی:

((إغتَنَمْ خَمساً قَبلَ خَمسْ: حياتُكْ قَبلَ مَوتِكَ، وَصِحَتُكْ قَبْلَ سقمك، وَفرّاغُكَ قَبْلَ شُغلِكْ، وَشَبابُكَ قَبْلَ هَرَّمِكْ، وَغَناكَ قَبْلَ فقْرِّكْ)) الحاكم والبيهقي بەڕاستی لە ابن عباس ەوە گێڕاویانەتەوە.

**واتە : سوود وەرگرە لە پێنج شت پێش پێنج شت**

**١-ژیانت پێش مردنت.**

**٢-تەندروستیت پێش بیماریت واتە نەخۆشیت.**

**٣-کاتی بیٚ کاریت پێش ئیش کردنت.**

**٤-تەمەنی لاویت پێش پیریت.**

**٥-دەوڵەمەندیت پێش هەژاریت. صدق رسول الله** (ﷺ).

برای ئادەمیزاد: ئەم کتێبە ((کۆزارا))یە بانگەوازی راستی یە لەپێشەوە بۆخۆم ئینجا بۆتۆ، رێگەی تاریك روونـاك ئەكاتەوە لەبەرئەوە ئەم هەموو باسانەی لەگەردوون و ئاسمانەکان و ئەستێرەکان و خۆرەکان و سەدیمەکان و هەورە نەوەوی یەکان و ئەشکەوتە سپی و رەشەکان و کۆزاراکان نووسراوەتەوە لەم کتێبەدا گەورەیی شارەزایی و دەسەڵاتی پەروەردگارت بۆ روون ئەکاتەوە چونکە متمانەمان کردووەتە سەر قورئانی پیرۆزو تەفسیرەکان و فەرموودەکان و دەیان سەرچاوەی ئاین و زانست ئێستا ئەتوانم دەستەکانت بگوشم و بڵێم چاکت کرد ئەگەر تێگەیشتبیت لەپەروەردگارو گەورەیی و دەسەڵاتی. لەوانە ئەبی کەقسە ئەبیسن و قسە چاکەکان وەرئەگرن.

برای بەڕێزم: لەشەوو رۆژێك دا تەنها کاتژمێرێك تەرخان بکە بۆ گەڕانەوەت بۆلای پەروەردگار بیربکەرەوە لەسەرەتای دروست بوونت و کۆتایی و چارەنووست، بیرکەرەوەو پیاچوونەوەیەك بکە بەڕۆژانی تەمەنی رابووردووتاو ئەگەر چاك بوو سوپاسی پەروەردگار بکەو ئەگەر خراپیش بوو تۆبە بکەو تێکۆشەودان بەخۆتا بگرە چونکە پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ﴾ (العنكبوت:٦٩)

**برای ئادەمیزاد:** هەرگیز خۆت مەکە بەبەندەی ئارەزووەکانت چونکە لەدایك بووی بەندە نەبووی ئازادبووی، هەروەها دڵت مەدەرە دەست ئارەزووەکانت چونکە تووشی کوفرو ئیلحاد ئەبیت. خۆت خەریك مەکە بەخۆشەویستی جیهانەوە چونکە ڕێگە گوم ئەکەیت و کوێرئەبی لەئاستی بینینی ڕاستی یەکاندا، هەرکەسیش گومڕاو کوێربوو لە بینینی ڕاستی و باوەڕ بەپەروەردگار لەم جیهانەدا بێ گومان لەژیانی هەتاهەتایی ڕۆژی دوایش دا کوێرئەبێ .

پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿وَمَنْ كَانَ فِي هَذِهِ أَعْمَى فَهُوَ فِي الْآخِرَةِ أَعْمَى وَأَضَلُّ سَبِيلاً﴾ (الاسراء:٧٢)

هەروەها ئەوەش بزانە تۆشوانی ئەوانەی کەلێپرسراوی لە بەخێوکردنیان لەژن و کوڕو کچ هەروەکوو پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنْفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَاراً وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلائِكَةٌ غِلاظٌ شِدَادٌ لا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾ (التحريم:٦)

**برای بەڕێزم:**

ماڵەوە یەکەم قوتابخانەی ژیانەو بایەخ بدە بەپەروەردەکردنی مناڵەکانت هەروەها ئەوانەی بەخێویان ئەکەی.

بایەخ بدە بەپەروەردەکردنیان بەپاك کردنەوەی بیروهۆشیان لە کوفرو نیفاق فێری زانستی ئاینی و باوەڕ بەپەروەردگاریان بکە.

هەرگیز ماوەیان نەدەی لاسایی شتی پڕوپووچ بکەنەوە کەدوژمنان بڵاوی ئەکەنەوە لەووڵاتەکەماندا فێری زانست و پێش کەوتنیان بکە چونکە ئەم دوانە لەزۆر ئایەتی قورئانی دا باس کراون لەلایەن پەروەردگارەوە هەرچی ڕەوشتی بەرزو چاك هەیەو خۆشەویستی نیشتمان و ئاین فێریان بکە. هۆکانی پێش کەوتن باس بکە بۆیان لە شارستانیەتی ڕۆژئاوایی و ڕۆژهەڵاتی هەرچی باشە فێریان بکە بەڵام دووریان بخەرەوە لەخراپەکەی.

هەمیشە باوەڕت بەزانست هەبێتو نەزان نەبیت هەرگیز یاخی نەبیت لەپەروەردگارو یادی بکەو لەبیرت نەچێ لەهەموو کاتێکدا بیری بکەو لەو کەسانەبە کەپەروەردگار لەقورئانی پیرۆزدا باسیان ئەکات.

﴿رِجَالٌ لا تُلْهِيهِمْ تِجَارَةٌ وَلا بَيْعٌ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَإِقَامِ الصَّلاةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ يَخَافُونَ يَوْماً تَتَقَلَّبُ فِيهِ الْقُلُوبُ وَالْأَبْصَارُ﴾ (النور: ٣٧)

راستگۆبە لەقسەو کردەوەو کارت، ئاگاداری فێڵو درۆبە چونکە فێڵبازی لەکاردا کردەوەی مونافیقەکانە پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿إِنَّ اللَّهَ لا يُصْلِحُ عَمَلَ الْمُفْسِدِينَ﴾ (يونس: ٨١)

هەروەها درۆ نیشانەی رۆح پیسی و دڵ پیسی یە ئەوانە درۆ ئەکەن کە زۆردارو ناپاکن هەروەکو پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِباً أُولَئِكَ يُعْرَضُونَ عَلَى رَبِّهِمْ وَيَقُولُ الْأَشْهَادُ هَؤُلاءِ الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَى رَبِّهِمْ أَلا لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ﴾ (هود: ١٨)

هەروەها گوێبیستی فەرموودەی پێغەمبەرمان محمد (د.خ) بە ، کە أبی العباس کوڕی عبدالله کوڕی عباس گێڕاویەتەوە:

((كُنْتَ خَلْفَ الْنَّبي (ﷺ) أي رّاكِباً خَلْقَهُ)) فقال:..ياغُلامْ إني أعْلَمُكَ كلماتْ:

((إحفظ الله يَحْفظكْ، أحفظ الله تَجِده تجاهَكْ، وَإذا سَألتْ فأسأل الله، وَإذا إستعنتك فاستَعِنْ بِالله، وَأعْلَمْ إنَّ الأُمة لَوْ إجْتَمَعتْ عَلَى أنْ يَنفعُوكَ بِشيءٍ لَمْ يَنفعوكَ إلاّ بِشيءٍ قَدْ كَتَبه اللهُ لَكَ وإن إجتمعوُا على أنْ يَضُرّوكَ بِشَيءٍ لَمْ يَضُرّوكَ إلاّ بِشيءٍ قدّ كَتَبه الله عَلَيكَ، رَّفَعتُ الأقلامَ وَجَفتْ الصُحَفُ)) الترمذي گێڕایەوەو فەرموویەتی فەرموودەیەکی ڕاستو چاکە.

هەروەها هەمیشە ئاگاداربەو خۆت بپارێزە ئەگەر خەیاڵی خراپەت کرد بەرامبەریو دژی بوەستە، زاڵ بە بەسەریا، بەپێچەوانەی خراپەکەوە چاکەبکە.

پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿إِنَّ الَّذِينَ اتَّقَوْا إِذَا مَسَّهُمْ طَائِفٌ مِنَ الشَّيْطَانِ تَذَكَّرُوا فَإِذَا هُمْ مُبْصِرُونَ﴾ (الأعراف:٢٠١)

نیازت بەهێزبێت و ئازابەو ویستت پتەوبێت بۆ چاك كردنی رەوشتت، كێشەو زەحمەت كۆڵت پێ نەدات، بەرامبەر ئێش و ئازارو ئەشكەنجەو هەژاری و هەندێ كێشەی تریش بوەستە، هەوڵیش بدە بۆ گەیشتن بەئامانجە پیرۆزو چاكەكانت.

خۆڕاگربە لەكاتی تەنگانە و تەنگوچەڵەمەدا، هەركەس خۆڕاگربێت سەركەوتووئەبێ، هەركەسیش بێ ووڕەبێت كۆڵ ئەدات و ئەكەوێت. پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿وَالْعَصْرِ إِنَّ الْأِنْسَانَ لَفِي خُسْرٍ إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ﴾ (العصر:١،٢،٣).

هەمیشە لەپەروەردگار بترسەو شەرمی لێ بكە بەڕاستی دەسەڵاتت هەبێ بەسەرهەست و ئارەزووەكانتاو چاك بزانە پەروەردگار بەشاراوەكانی ناوسنگت ئەزانێ هەروەكوو لەقورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی:

﴿يَعْلَمُ خَائِنَةَ الْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِي الصُّدُورُ﴾ (غافر:١٩)

دەروون پاكبە، بەرامبەر بەو بەهرانەی پەروەردگار پێ ی بەخشیوی لەبیستن و بینین و دڵ و زمان و هەستەكانی تریش. ئەمانە بپارێزە لەتاوان پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿وَلا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولَئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْؤُولاً﴾ (الاسراء:٣٦)

ئەوەی دەست پاك و راستگۆنەبێ، بێ باوەڕە، ئەوەی پەیمانی نەبێ ئاینی نی یە، باوەڕت بەپەروەردگارت هەبێ هەمیشە راست بە لە ئاین داو زانست خوازبە، ئەگەر لەچین بێت، جیاوازی حەڵاڵ و حەرام بكەو فێڵی نادروست بەكارمەهێنە لەهیچ بوارێكدا.

نەفس بەرزو دڵپاك و دەست پاكو زمان پاك بە، بەرامبەر ئەوانەی دەورت لەدایكو باوكو خوشكو براو كەس و كارو خزمو دراوسیٚ و هاووڵاتیانت.

یارمەتی هەموو خەڵك بدە لەكاتی پێویستدا لەهەموو تیرەو تایفەیەكو مەزهەبێك بەماڵ و زانستو جۆرەكانی تری یارمەتی وەكوو قسەی باش و زانست، چوونكە باشترین خەڵك ئەوانەن چاكەئەكەن بەرامبەر بەخەڵك.

چونكە خەڵك دروست كراوی پەروەردگارەو هەمووی ئادەم زادن. پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلا تَعَاوَنُوا عَلَى الْأِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾ (المائدة:٢)

برای بەڕێزم: بەختیاری بەكردەوەی چاكە نەوەكوو بەدارایی زۆر یان دەسەڵات و كەس و كاری زۆر یان پلەی بەڕێوەبردن و لێپرسراوی.

پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿مَنْ عَمِلَ صَالِحاً مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُمْ بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ (النحل: ٩٧)

ژیان خۆشی و بەختیاریو دڵنیایی یە، ئارامی یە و پاك بوونەوەیە لە دڵە ڕاوكیٚ و بیر تێك چوون.

**برای بەڕێزم:**

پێغەمبەرمان محمد (د.خ) لەهیچ کاتێکی ژیانیا دەوڵەمەندنەبووە لەدارایی دا.

بەڵام دەوڵەمەند بووە لە پەروەردگار پەرستی دا.

چونکە دڵی پاك و بێ گەردبووە زمانی راست و چاك بێژبووە سنگی پڕبووە لەباوەڕ.

ویژدانی هێمن و ئاسایش و لەپشوودابووە. تەندروستی لەشی زۆرباش بووە.

ئەقڵی تەواوبووە. لەهەموو شتێك دا راست و دروست بووە لەبەرئەوە بەختیاربووەو دەوڵەمەندی راستی بووە.

چونکە پەروەردگار لێ ی رازی بووە، دەوڵەمەندی سامان کامەیە ئەگەر کارێك نەکەی پەروەردگار لێت رازی بێت.

کەوابوو بێ دەرامەتان و بێ سامانەکان ئەتوانن بەختیاربن بەدەوڵەمەندبوون لەپەروەردگار پەرستی دا.

هەروەها خاوەن سامان و دارایی یەکان ئەتوانن سەرکەوتووی هەردووجیهان بن ئەم جیهانە و جیهانی هەتا هەتایی دوایی. بەپەروەردگار پەرستی و چاکە کردن.

خوشك و برای ئادەمیزاد: زانستی نوێ دەری خستووەو بۆی دەرکەوتووە بەختیاری چارەسەری هەموو نەخۆشی یەکە ئەمە پزیشکی جیهانی و شارەزای نەشتەرگەری بەریتانی (السیر هینیخ أوجیلفی) رای گەیاندووە کەدووبارەی کردوەتەوە بەختیاری و دڵ ئارامی زۆر نەخۆش چاك ئەکاتەوە بەبێ چارەسەرکردن یان نەشتەرگەری.

مێشکی هێمن و پاك و ساغ ئەتوانێ سەرکەوێ بەسەر هۆکانی نەخۆشی یەکانی سنگ دا.

ئەم پزیشکە (٤٤)چل وچوار ساڵ زیاترە هەوڵی چارەسەری نەخۆشی شێرپەنجە ئەدات((السرطان))

گەیشتووەتە ئەوەی بڵێ: ((مرۆڤی بەختیار هەرگیز تووشی شێرپەنجە نابێت)).

هەروەها ئەڵێ:

ناوەندێك لەمێشك دا هەیە گەشەكردنی هەموو شانەكانی لەش ئەپارێزێ زۆر بەڕێك و پێكی بەڕشتنی جۆرێ لە هۆرمۆن لەناوخوێن دا.

ئەم ناوەندەیە هەواڵەكان ئەنێرێ بۆ هەموو شانەكانی لەش.

دیسانەوە بەزانستی نوێ دەركەوتووە ئەم ناوەندە بەئەقڵ و بەڕێكی ئەم هەواڵانە ئەنێرێ بۆخانەكانی لەش ئەگەر بیرت هێمن و پاك بوو. بەڵام ئەگەر مێشك و بیرت شێواوبوو ئەوە بەڕاستی هەواڵەكان ناگەنە خانەكان بەڕێك و پێكی و گەشەكردنیان تێك ئەچێت و شێرپەنجە دروست ئەبێت.

ئەمە لەكتێبی ((القرآن والعلم الحديث))دا هاتووە لاپەڕە (٥٠) خۆڕاگربە و سنگت فراوان بێت بەرامبەر نەزانێك كەنەزانیت لەگەڵ ئەكا. پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِنَ اللَّهِ لِنْتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنْتَ فَظّاً غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانْفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ﴾ (آل عمران:١٥٩)

برای بەڕێزم: هێمنی و نەرمی و ئارامی لەمامەڵەكردن لەگەڵ كەسانی دەوروبەردا هێزێكە خۆشەویستت ئەكات سنگ فراوانی خراپەكار چاك ئەكات كە هیچ دەسەڵات و هێزێك ئەوەندە كارناكات.

برای بەڕێزم: ئەگەر ئامۆژگاری كەسێكت كرد بەكردەوەی خۆت ئەو ئامۆژگاری یەی بكە.

واتە: كار بەئامۆژگاریەكەت بكە ئینجا بەخەڵكی رابگەیەنە. پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لا تَفْعَلُونَ كَبُرَ مَقْتاً عِنْدَ اللَّهِ أَنْ تَقُولُوا مَا لا تَفْعَلُونَ﴾ (الصف:٢،٣)

هاوڕێ یەتی كەسێك بكە وەكوو خۆت بێت و تێكەڵی كەسانێك بكە لەگەڵت بگونجێ. ووریابە هاوڕێ یەتی ناپاك و تاوانباران مەكە چونكە تاریكی شەو وەكوو رووناكی رۆژنی یە.

ئـادەمیزادی چـاك و پـاك رۆشـنەو ئەدرەوشـێتەوە لەبەرئـەوە زۆر ووریابـە ئـەم رەونەقەت لەكیس نەچێت.

چـونكە ئـەم شـێوەیە لەشـێوەی مـانگ ئەچـێت رووناكی لـەخۆرەوە وەرئـەگرێ و رۆشن ئەبێتەوە بەڵام ئەگەر زەوی كەوتە بەینەوە مانگ تاریك ئەبێتەوە.

هەروەها دڵیش وایە. هەروەكوو پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿أَوَمَنْ كَانَ مَيْتاً فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُوراً يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَنْ مَثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِنْهَا كَذَلِكَ زُيِّنَ لِلْكَافِرِينَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ (الأنعام:١٢٢)

باوەڕداران سەركەوتوون و لەبەهەشتی بەرین دان. چونكە بەسەرو بەماڵ لـەپێناوی رێگـەی پـەروەردگارو بەرزكردنـەوەی ووشـەی لاَإِلَـه إلاالله محمـدٌ رّسُـولْ الله خۆیـان و سامانیان بەخت كرد لەشیان زەوی رووناك ئەكاتەوە، رۆحیان ئاسمان.

لەبارەی ئەمانەوە پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُولَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ﴾ (الحجرات:١٥)

بێ باوەڕان و تاوان باران لەدۆزەخ دان، لەبەرئەوەی لەژیانی كاتی ئەم جیهانەدا تـەنها هـەوڵی خۆپەرستی و تێركردنـی وورگیـان بوون و شەیتانیان بەڕابەریان زانـی و رابـواردن و سـامان لەخـشتەی بـردن و تـاریكی كوفریـان هەڵبـژارد لـەجیاتی رووناكی باوەڕ. پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعاً﴾ (الكهف:١٠٤)

هەروەها فەرموویەتی:

﴿أُولَئِكَ الَّذِينَ اشْتَرَوُا الضَّلَالَةَ بِالْهُدَى فَمَا رَبِحَتْ تِجَارَتُهُمْ وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ﴾ (البقرة:١٦)

دیسانەوە فەرموویەتی:

﴿مَثَلُ الْفَرِيقَيْنِ كَالْأَعْمَى وَالْأَصَمِّ وَالْبَصِيرِ وَالسَّمِيعِ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلاً أَفَلا تَذَكَّرُونَ﴾ (هود:٢٤)

بـرای بـەڕێزم زۆربـاش بزانـە رۆح خـۆراكی پێویـستە هـەروەكوو لـەش خـۆراكی پێویستە بۆئەوەی بەهێزبێت.

لەبەرئەوە دڵت پـاك بكەرەوەو روونـاكی بكـەرەوە بە بـەجێ هێنـانی فەرمانـەكانی پـەروەردگار كــە هــەموویان بــریتین لەچـاكەكاری و دووركەوتنــەوە لەخراپــەكاری هەروەكوو پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿فَوَجَـدَا عَبْـداً مِـنْ عِبَادِنَـا آتَيْنَـاهُ رَحْمَـةً مِـنْ عِنْـدِنَا وَعَلَّمْنَـاهُ مِـنْ لَـدُنَّا عِلْمـاً﴾ (الكهف:٦٥)

هەمیشە لەگـەڵ پەروەردگاربـە چـونكە ئـەم ژیانـە كاتی‌یـە كۆتـایی دێـت و بۆكـەس نامێنێ تەنها لەكۆتایی‌دا پەروەردگار ئەمێنێ و ژیانی هەتاهەتایی مان بۆ دابین ئـەكات دیسانەوە لەم بارەیەوە فەرموویەتی:

﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلالِ وَالْأِكْرَامِ﴾ (الرحمن: ٢٦،٢٧).

لێرەدا ئـەم ئامۆژگاریانـەم نووسـیوە لەپێـشەوە بۆخـۆم و ئینجا بۆتـۆی بـەڕێز بـۆ رۆیـشتنمان بـەرەو پـەروەردگارو بـەجێ هێنـانی فەرمانــەكانی لەبەرئـەوە ڕێگــەی رزگاربوون بگرە كەڕێگەی رازی بوونی پەروەردگارە.

لـەبیرت نەچـێت لـەكاتی راسـتی رۆیـشتنت دا یـادم بكـەو داوا لەپـەروەردگار بكـە یارمـەتی منـیش بـدات بـۆ ڕێگـەی راسـتی پـەروەردگاری. چـونكە داوای بـاوەڕداران بۆبرای ئایینیان لەپەناوە لای پەروەردگار وەرئەگیرێ و پەسەندە.

ئەگـەر واز لەخـەڵك پەرسـتی بێنـی و دڵت بـەتاڵ بكەیتـەوە لەخۆشەویـستی مـادەو رابواردنی كاتی جیهانی....

ئەگەر وازبێنی لەهەموو كردەوەی ناپەسەند بەئاشكراو بەپەنهانی...

ئەگـەر دڵــت روون كـردەوە بـەباوەڕی پـەروەردگاری ســەركەوتووئەبیت و پلــەی بەرزت دەست ئەكەوێ و زۆرشتی پیرۆزت پێ ئەبەخشرێ لەلایەن پەروەردگارەوە....

ئـیتر وەكـوو چـرائەبیت روونـاكیـت ئـەبێ بۆكەسـانی دەوروبـەرت، وەكـوو پزیـشك ئەبیت چارەسەری نەخۆشەكان ئەكەی. هەروەكوو پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَتْكُمْ مَوْعِظَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَشِفَاءٌ لِمَا فِي الصُّدُورِ وَهُدىً وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ (يونس:٥٧)

برای بەڕێزم: قۆڵی لێ هەڵکە بۆ چاکەکاریو دوورکەوتنەوە لەخراپەکاری بەهەموو جۆرەکانی یەوە.

چی لەوە باشتر هەیە خۆت چاکەخوازبیتو خەڵکانی تریش فێری ئەم رەوشتە بەرزو پیرۆزەبکەی؟ هەروەکوو پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿إِنْ أُرِيدُ إِلَّا الْأِصْلاحَ مَا اسْتَطَعْتُ وَمَا تَوْفِيقِي إِلَّا بِاللَّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ﴾ (هود:٨٨)

دروشمت ئەوەبێت بەپشتیوانی پەروەردگار چاکە بڵاوئەکەمەوە و بەرەنگاری خراپەکردن ئەبمەوە، زۆرباش تێبینی کردەوەکانت بکە پەروەردگار فەرامۆش نەکەی وریابە کەم تەرخەمی نەکەی وریابە وریابە.

پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿قَدْ جَاءَكُمْ بَصَائِرُ مِنْ رَبِّكُمْ فَمَنْ أَبْصَرَ فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ عَمِيَ فَعَلَيْهَا وَمَا أَنَا عَلَيْكُمْ بِحَفِيظٍ﴾ (الأنعام:١٠٤)

**برای بەڕێزم:** دوای مردن دوو ڕێگە هەیە یان بۆبەهەشت یان بۆ دۆزەخ ئایا تێ گەیشتیت ، پەروەردگار ئاگاداربە.

# (ووتەی کۆتایی)

زانست پێش کەوتنەو ئاینی پیرۆزی ئیسلام لەهەموو ئاینێك زیاتر بایەخی پیٚ داوە.

**دووجۆر زانست هەیە : -**

١- زانستی نەبینراو یان هەست پیٚ نەکراو (العلم المجرد) وەکو بیرکاری و تیۆر. ئەم زانستە کاریگەریەکی راستەوخۆی نی یە بۆسەر ژیانمان وەکو لێکۆڵینەوەی زانستی لەسەر سروشتو دروست بوونی یاسای سروشتیو گەردوونی یەکانو زانستی کێشو پێوانەی تەنە گەردوونی یە نزیكو هەرە دوورەکان.

٢- زانستی جیٚ بەجیٚ کراو یان هەست پیٚ کراو ئەم زانستە کاریگەریەکی راستەوخۆی هەیە بۆسەرژیانمان وەکوو دروست کردنی ئەو ئامێرانەی باری ژیانیان ئاسان کردووە.

گواستنەوەمان لەشوێنی خۆمانەوە بۆ دوورترین شوێن بەهۆی ئەو ئامێرانەوەیە کە بەم زانستە دروست کراون.

ئەوپێنووسەی پیٚ ی ئەنووسین بەم زانستە دروست کراوە، هەموو هۆیەك کە بووەتە هۆی پێش کەوتنی ژیان بەم زانستە دروست کراوە لەبەرئەوە لە ڕابوردوودا زۆر بایەخ بەم لایەنە زانستی یەدراوە (العلم التطبيقي) بەلاٚم لایەنی دووەمی زانست ((العلم المجرد)) زۆربایەخی پیٚ نەدراوە لەم ساڵانەی دوایی دا نەبێت و ئێستاش ئەم بایەخ پیٚ دانە بەردەوامە.

ئەگەر لەزۆر دەمێکەوەو لەڕابوردوودا بایەخ بەم زانستەبدرایە واتە ((العلم المجرد)) ئێستە زانیاری دەربارەی گەردوونو بوونو بوونەوەر زۆرپێش کەوتووترئەبوو.

لەڕاستی دا چۆن رووبارێك دوولق بێتو لەسەرەتادا یەك سەرچاوەی هەبێت، زانست مجرد بێت یان تطبيق ناتوانین واز لە هیچیان بێنین چونکە تەواوکەری یەکترن.

پـاش تێپـەڕبوونی سەدسـاڵ بەسـەر کۆچـی دوایـی پێغەمبـەرمان محمـد (د.خ) دەوڵەتی ئیسلامی گەورە لە باشووری فەرەنساو ئیسپانیاو باکووری ئەفریقیا وەدرێژ ئەبوویەوە بۆ دوورگەی عەرەب و ئێران و ئاسیای ناوەڕاست و سنووری ((منغولیا))و بەشێك لەووڵاتی هیندستان کەپێ ی ئەڵێن ((السند)) ئەم دەوڵەتە گەورەیە خەلیفە بەڕێوەی ئەبرد.

**هۆی رووخان و پارچە پارچەبوونی ئەم دەوڵەتە گەورەیە چی بوو؟.**

هەندێ کەس ئەڵێن (دین و سیاسەت) بەیەکەوە ناگونجێن!!! دەوڵەت ئەبێ لەدین جیابێت، وائەزانن رووخان و پارچە پارچەبوونی ئەم دەوڵەتە لەبەرئەوەیە کە ئیسلام ناتوانێت حکومەت بێت!!!. بەپێچەوانەوە.... ئیسلام دەوڵەتە ، ئاینە ، زانستە ، سیاسەتە، ئابووری یە و هتد.....

بەڵام دەسەڵاتی حزبێکی وەکوو بەعسی رووخاو لەگەڵ دیکتاتۆرەکەی هەروەها شێوەکانی ئەوانیش لەهەندێ ووڵاتان دا ئەنجامی حکومەتەکەیان (قبول خاص)واتە: وەرگرتنی تایبەت لەزانکۆکان دا هەروەها (تعین خاص) واتە: دامەزراندنی تایبەت و دەسەڵات بە لێپرسراوانی حیزبی فەرمانڕەواو چەوسانەوەی هەموو چینەکانی کۆمەڵ بۆبەرژەوەندی چینی حیزب و دەسەڵات و لێخوڕینی بەرەو سەرمایەداری!!!.

تەنانەت هەندێ لەوەزارەتەکان داخرابوون بۆ حزبی دەسەڵات وەکوو (بەرگری ، ناوخۆ ، دەرەوە ، پەروەردە ... هتد)

ئەگەر دەسەڵات ئیسلامی راستەقینەبوایە ئابووری ئیسلامی چارەسەری هەموو کێشەکانی ئەکردو گەلانی عێراق بەیەکسانی و تەبایی و بێ جیاوازی نەتەوایەتی و ئایینی بەیەکەوە ئەژیان و دەوڵەتێکی زۆر بەهێز دائەمەزرا هەروەکو دەوڵەتی یەککگرتووی ئیسلامی رابووردوو بەڕێوەئەچوو باشتریش چونکە دەوڵەتی ئیسلامی رابوردوو ئەم سامانە کانزایی یانەی ئێستای (وەکوو نەوت و کانزاکانی تریش) لەبەردەستانەبوون، هەروەها ئەو هەموو کارگەو باج و پارەی ئاووکارەباو....هتد

لەبەردەستا نەبوو حکومەتێکی گەورەش بوو ئازاو یەککگرتووبوو!!! بەڵام چی رووخانی ؟

خەلیفەو لێپرسراوان لەپێش هەموو هۆیەکەوە بوون، چونکە لایان دا لە بەرنامەی ئیسلام و ڕەوشتی پێغەمبەرمان (د.خ) و یارانی....

زانستی ئیسلامی بوو گەیشتە ئەوروپا و هەموو جیهان و سوودیان لێ وەرگرت شەریعەتی ئیسلام بوو یاسایان لێ وەرگرت.

هەتاکو خەلیفەی ئیسلام و کاربەدەستانی ڕاست بوون و پەیڕەوی یاساکانی ئیسلامیان ئەکرد دەوڵەتی ئیسلامی زۆر بەهێزبوو، بەڵام پاشان خەلیفەکان و کاربەدەستەکانیان دەستیان کرد بە کۆشك و تەلار دروست کردن و رابواردن و کۆکردنەوەی سامان و بەکارهێنانی دەسەڵات بۆ بەرژەوەندی خۆیان و خاوبوونەوەیان لەخزمەت کردنی موسڵمانان دووبەرەکی و جیاوازی دروست بوو لەناو ئیسلام داو پارچە پارچەبوون و لاوازبوون روویدا.

بەم جۆرە ئیسلام و حکومەتەکەی پارچە پارچەبوون و لاوازبوون ڕووی دا.

لەکاتی ژیانی پێغەمبەرمان محمد (د.خ) هەروەها خەلیفەکانی راشدین لەدوای خۆی( ابوبکر، عمر،عثمان، علی) خوالێ یان ڕازیبێت.

ئیسلام و دەوڵەتی ئیسلامی رۆژبەڕۆژ بەهێز ئەبوو گەشەی ئەکردو پەرەی ئەسەند چونکە خەلیفەو کاربەدەستان هەروەکوو برا موسڵمانەکانیان ئەژیان. بەڵام گۆڕانی ژیان ی خەلیفە و کاربەدەستان وەکو ژیانی کیسری و قەیسەری لێ هات جەنگاوەرە موسڵمانەکان بەڕاستی و بەدڵسۆزی نەئەجەنگان هەروەها وولاتانیش گەلەکانیان رازی نەئەبوون بەگۆڕانی سەرۆکە خراپەکانیان بەخەلیفە خراپەکانی ئیسلام.

چونکە گەلانی ئەو وولاتانە بۆیە رازی بوون بە حوکمی ئیسلامی رزگاریان بێت لە فەرمانڕەوا خراپەکانیان.

بەڵام زانیان وانی یە و ئیسلام وەکوو جاران نەماوە پشتیان تێکردن.

ئەگەر بمانەوێ بەردەوام بین لەنووسینی دەربارەی گەردوون و جیهانی رۆحی ناگەینە کۆتایی چونکە کاغەزو قەڵەم هەیەو فراوانی گەردوون و جیهانە رۆحی و ئەثیری یەکان باس کردنیان کۆتایی نایەت و تەنها پەروەردگار خۆی ئەزانێ سەرەتای کامەیەو کۆتایی لەکوێ یە.

ئەوەی ئەمڕۆ ئەینووسین سبەینێ کۆنە و نووسینی نوێ و زانستی نوێ جێگەی ئەگرێتەوە چونکە رووباری ژیان بەردەوامەو جاروباریش زۆر خێرایەو کەس نازانێ بەرەوکوێ ئەڕوا..... بەردەوام داهاتوو دێتە سەر رابردوو.

ئەمڕۆ نووسینمان لەم بارەیەوە کۆتایی هاتو سبەینێ نازانین چی ئەنووسین و چی تری نوێمان بۆدەرئەکەوێ دەربارەی گەردوون و جیهانە رۆحی و ئەثیری یەکان.

ئەمڕۆ لە وولاتی خۆمانەوە بۆ دوورترین وولاتی سەر زەوی ئەتوانین زۆر بەئاسانی قسە لەگەڵ یەکتربکەین و بەڵکو لەهەندێ ئەستێرەی دوورەوە لەگەڵ زەوی ئەتوانرێ قسەبکرێت و هەواڵی زۆرشت بزانرێ بەهۆی ئامێرە دروست کراوە نوێ یەکانەوە (ئینترنێت، فاکس، مۆبایل...هتد) ئەمە لەجیهانی مادی دا. واتە فیزیاوی دا.

بەڵام لەبەرئەوەی زانستمان زۆرکەمە لەجیهانی رۆحی و ئەثیری ئەمڕۆ ناتوانین بەئاسانی لەگەڵ ئەوان قسە بکەین و هەواڵی یەکتر بزانین دوورنی یە و پێش کەوتنی زانست بەردەوامە سبەینێ بەهۆی دروست کردنی ئامێرێکی نوێ وە قسە لەگەڵ ئەوانیش بکەین.

ئەوەی ئەمڕۆ نووسیم سبەینێ ئەبێت باشتر بینووسم هەرچۆنێك بێت ئەوەی ئێستا نووسیومە ناتوانم بیدڕێنم و سەرلەنوێ دەست بکەمەوە بەنووسین.

تا ئەو ڕۆژەی زانست ئەگاتە پلەی تێگەیشتن لەجیهانی ئەثیری و رۆحی بەخوای گەورەتان ئەسپێرم.

## (سوپاس و پێزانین)

ڕێزو سوپاسی بێ پایانم بۆ ئەم بەڕێزانە کەیارمەتیان دام لە نووسینو چاپ کردنی ئەم کتێبەدا.

١- بەڕێز مامۆستا سید رشاد سید محمد فتح المبین ووردبینی ئایەتە پیرۆزەکانی قورئانی پیرۆزی بۆکردم لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا.

٢- د. نەورۆز حمە رشید نادر، ووردبینی زمانی هەردوو بەشی ئەم کتێبەی بۆ کردم.

٣- دکتۆر کوزارا حمە رەشیدی کوڕم کە بەکتێبەکەدا چۆتەوە.

٤- دەزگای لێکۆڵینەوە و پەخشی پرۆژەی تیشك، کەنەك هەر ئەرکی لە چاپدانیان گرتە ئەستۆ بەڵکو کتێبەکەشیان بە بیرۆکەو وردەکاری زانستیو شەرعیش زۆر دەوڵەمەند کرد.

پەروەردگار پاداشتی چاکەیان بداتەوە.

نووسەر/ ڕەشید هەورامی

سلێمانی/٢٠٠٩ز

| سەرچاوە | نووسەر |
|---|---|
| قورئانی پیرۆز | |
| فەرموودەکانی پێغەمبەرمان محمد (د.خ) | |
| في ظلال القران | سيد قطب |
| زهرة النور | بديع الزمان ـ سعيد النورسي |
| سكرات الموت | د. السيد الجميلي |
| القرآن إعجازيتعاظم | شاكر عبدالجبار |
| كيف نرى الله | شاكر عبدالجبار |
| ملامح كونية في القرآن | شاكر عبدالجبار |
| الكون والقرأن | محمد على حسن الحلي |
| مسائل عقائدية | د. السيد علاءالدين السيد أمير محمد القزويني |
| الكون الأحدب | د.عبدالرحيم بدر |
| مع الله في السماء | د.احمد زكي |
| الله يتجلى في عصر العلم | ترجمة د. الدمرداش عبدالمجيد سرحان |
| الدين في مواجهة العلم | وحيدالدين خان/ ترجمة ظفر الأسلام خان |
| نظرتنا المعاصرة إلى الكون | د.طالب ناهي الخفاجي |
| المجرات والكوزارات | وليم ج ـ كاوفمان<br>ترجمة المهندس/ عبدالكريم على السامرائي |
| على حافة العالم الأثيرى | ج ـ آرثر فندلاي |
| التمدن الإسلامي | جمعية التمدن الإسلامي |
| شهادة الكون | عبدالودود رشيد محمد |
| الذرة والكون | پيار روسو * ترجمة عصام مَيّاس |
| هەڵبژاردەیەك لەعەقیدەی مرضیە ی مەولەوی | بابە علی شێخ عمر قەرەداخی |
| مێژووی ژیان | محی الدين عبدالقادر قەرەداخی |

| مەولاناى ڕۆمى | ئازاد رەئوف |
|---|---|
| من ألحان الأيمان | طه عبدالباقي سرور |
| الغزالي | شبل النعماني |
| الأنسان روح لاجَسَد | د. رؤوف عبيد |
| مجموع فتاوي | عبدالعزيز بن باز –الطبعة الرابعة - ١٤٢٣ه الرياض. |

## (نووسەر لەچەند دێڕێکدا)

۞ناوی حەمەرەشید نادر حمە لطیف نادر دەوڵەتیارە

۞لەشارۆچکەی تەوێڵە لەدایك بووە لەساڵی ١٩٤٦ ز.

۞خوێندنی سەرەتایی لە تەوێڵە تەواو کردووە.

۞خوێندنی ناوەندی لە هەڵەبجەی شەهید تەواو کردووە.

۞خانەی مامۆستایانی لە سلێمانی تەواو کردووە ، لەساڵی ١٩٦٧-١٩٦٨ بووە بە مامۆستا.

۞بەڕێوەبەری قوتابخانەی کانی ماران بووە.

۞ بەڕێوەبەری قوتابخانەی نارنجەڵە بووە.

۞ بەڕێوەبەری قوتابخانەی ئاوێسەر بووە.

۞بەڕێوەبەری قوتابخانەی ئەحمەد موختار بووە.

۞تاکو ئێستا ٢٤ بیست وچوار سوپاسنامەی بۆ هاتۆتەوە لە بەڕێوەبەرێتی پەروەردەی سلێمانی و لەهەندێ فەرمانگەکانەوە .

۞لە خولەکانی فێرکردندا /عربی- ئیدارە- هۆی فێرکردن- تەندروستی قوتابخانەیی- زانستی- ئیشی دەست-عربی وئایین بۆ دووەم جار .. لەهەموویاندا بە پلەی نایاب و زۆر باشە دەرچووە .

۞لەساڵی ١٩٨٣ بە فەرمانی کارگێڕی بەڕیوەبەرێتی پەروەردەی سلێمانی ژمارە (٤٩٧) بەرواری ١٩٨٣/٦/٧ پاڵێوراوە بۆ سەرپەرشتیاری پەروەردەیی بەفەرمانی کارگێڕی وەزارەتی پەروەردە ژمارە (٢٦٦٦) بەرواری ١٩٨٣/٦/٣٠ کراوە بە سەرپەرشتیاری پەروەردەیی بەڵام لەبەر هەندێ هۆی تایبەت ئەمەی ڕەت کردۆتەوە بە مامۆستایی ماوەتەوە تاکوو ئێستا ٣٨ سی وهەشت ساڵە مامۆستایە .

۞ئێستا مامۆستای خوێندنگای ناوەندی مەستورەیە لە سلێمانی .

## بڵاوکراوەکانی پرۆژەی ( تیشك )

| ژ | ناوی کتێب | نووسەر |
|---|---|---|
| ١ | بەئیسلامکردنی کورد، ماستەرنامە یان هەڵەنامە؟ | ن: فازل قەرەداغی |
| ٢ | نـەزانیی و بێـشەرمیی، بەشـێك لـە چەواشـەکارییەکانی مەریوان هەڵەبجەیی لە کتێبی (سێکس و شەرع و ژن)دا | ن: عومەر کەمال دەروێش |
| ٣ | ئاشتینامە، وەڵامێك بۆ (خوێننامە)ی زەردەشتی | ن: ئامینە صدیق |
| ٤ | فەتواکەی مەلای خەتێ، ئەفسانەی مێژوونووسێك | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ٥ | صـەلاحەددینی ئـەییوبی، گـەورەتر لـە رەخنـەگرانی، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیـسۆر دکتـۆر موحـسین موحەممەد حسێن | ئا: ئارام عەلی سەعید |
| ٦ | بەرەو بەختیاری ئافرەت (بەرگی یەکەم) | جەمال حەبیبوڵڵا (بێدار) |
| ٧ | ئازادیی رادەربڕین لە رۆژئاوا، لە سەلمان روشدییەوە بۆ رۆجیە گارودی | ن: د. شەریف عەبدولعەزیم<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٨ | بەجیهانیکردن، دیدێکی ئیسلامیی | ن: د. موحسین عەبدولحەمید<br>و: حەمەکەریم عەبدوڵڵا |
| ٩ | کوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ١٠ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت (بەرگی دووەم) | ن: جەمال حەبیبوڵڵا (بێدار) |
| ١١ | مێژووی دێرینی کوردستان (کتێبی سێیەم) | ن: فازل قەرەداغی |
| ١٢ | سـەدەیەك تەمـەنی نـوورین، مامۆسـتا عەبدولکـەریمی مودەڕیس بە پێنووسی خۆی بناسە | ئا: عەبدولدائیم مەعروف هەورامانی |
| ١٣ | دەوڵـەتی خیلافـەت، بوژاندنـەوەی کۆمەڵگـەو گەشەسەندنی شارستانییەت | ن: ئیکرام کەریم |
| ١٤ | لـە سەرگوزشـتەکانی ژیـان، ئـەدەبی گاڵتەوگـەپ، روداوی مێژوویی، بیرەوەریی | ن: شێخ موحەممەد خاڵ |
| ١٥ | پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان<br>رامانو سەرنجو پێشنیار | ئا: پرۆژەی تیشك |

| ١٦ | بیستو سیٰ ساڵ سەروەریی | ن: ئەحمەد حاجی ڕەشید<br>دکتۆر صەباح بەرزنجی پێشەکی بۆ نووسیوە |
|---|---|---|
| ١٧ | قورئـان وەحـی ئاسمانە، نـەك ڕەنگدانـەوەی سـەردەمی خۆی | ن: بەکر حەمەصدیق |
| ١٨ | ئیـسلامو سیاسـەت، لێکۆڵینەوەیـەك لەمـەڕ پەیوەنـدی نێوان ئیسلامو سیاسەت | ن: ئارام قادر |
| ١٩ | سوپای ئەییوبیان لە سەرودەمی سەلاحەددیندا پێکهـاتنی، ڕێکخـستنی، چـەکەکانی، هێـزی دەریـاییو شەڕو جەنگە گرنگەکانی | ن: پرۆفیـسۆر دکتـۆر موحـسین موحەممەد حسێن<br>و: عوسمان عەلی قادر |
| ٢٠ | پوختەیەك دەربارەی ڕۆژوو | ن: عەبدوڕڕەحمان نەجمەدین |
| ٢١ | ڕۆڵی پرشنگداری زانا موسوڵمانەکان لە پێشکەوتنە زانستییەکاندا | ن: د. کاوە فەرەج سەعدون |
| ٢٢ | یەکـەمین دەسـتووری نووسـراو لـە جیهانـدا، بەڵـگەنامەیەکی گـرنگی سەردەمـی پێغەمبـەر (صـلی الله علیه وسلم) | ن: موحەممەد حەمیدوڵلا<br>و: شوان هەورامی |
| ٢٣ | ئیسلامناسیی یـان ئیسلامنەناسیی، وەڵامێـك بـۆ کتێبـی (ئیسلامناسی) عەلی میرفطروس | ن: ئیکرام کەریم |
| ٢٤ | بەرەو بەختیاریی ئافرەت (بەرگی سێیەم) | ن: جەمال حەبیبوڵلا (بێدار) |
| ٢٥ | ئیشکردن نەك تەمەڵی | عەبدولعەزیز پارەزانی |
| ٢٦ | دوورگـەی بیناسـازان، چـیرۆکێکی پەروەردەییـە بـۆ گەورەو بچووکی ئەم نەوە نوێیە | نووسینی: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سلێمان<br>وەرگێڕانـی: ئامینـە صـدیق عەبدولعەزیز |
| ٢٧ | زمانی گەردەلوول، خەونی شنەبا<br>کۆمەڵـە دیدارێکـە لەسـەر شـیعر، فەرهـەنگ، زمـان، تەسـەووف، ڕۆژهەڵاتناسـی، ژن، ڕەخنـەی ئـەدەبی، ڕووناکبیر و دەسەڵات | فەرهاد شاکەلی |

| ٢٨ | هەڵەبجە ١٨٨٩ ـ ١٩٣٠، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە | ن: عادل صدیق |
|---|---|---|
| ٢٩ | بەرگری لە قورئان دژی ڕەخنەگرانی | ن: عەبدوڕڕەحمان بەدەوی<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٣٠ | فەرموودە هاوبەشەکانی بوخاری و موسلیم | ئامادەکردن و وەرگێڕانی: حەمەکەریم عەبدوڵڵا |
| ٣١ | مەلا ئیدریسی بەدلیسی، ڕۆڵی لە یەکخستنی میرنشینە کوردییەکاندا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ٣٢ | شێخ مەحمودی حەفید (١٩٢٢ — ١٩٢٥) | ن: ئومێد حەمەئەمین |
| ٣٣ | ئیسلام لەبەردەم دوڕیاندا | ن: لیوبو لدڤایس<br>و: عەبدول حسێن |
| ٣٤ | ڕامیاری لە ئیسلامدا | ن: ئەحمەد کاکە مەحمود |
| ٣٥ | وەڵامی پرسیارەکان، ڕەواندنەوەی کۆمەڵێك گومان سەبارەت بە ڕاستییەکانی ئیسلام | ن: دکتۆر کەریم ئەحمەد |
| ٣٦ | مرۆڤ و پەیامداری | ن: قانع خورشید |
| ٣٧ | سەید قوتب، لە هاتنەدنیاوە تا شەهیدبوون | ن: د. سەلاح عەبدولفەتاح ئەلخالیدی<br>و: تارق نەجیب ڕەشید |
| ٣٨ | عوسمانی کوڕی عەففان، کەسایەتی و سەردەمەکەی | ن عەلی موحەممەد سەللابی<br>و: حەمید موحەممەد عەبدوڵڵا |
| ٣٩ | خـوانی ڕووح، توێژینەوەیەکە دەربارەی گەورەیی و پیرۆزیی نوێژ | ن: مەلا ئەحمەدی شەریعە |
| ٤٠ | ئەلفبێی لاتینی.. زمانی ستاندارد | ئامادەکردنی: ڕەوشت محەمەد |
| ٤١ | بنەماکانی فیقهی ئیسلامیی(بەرگی یەکەم) | نووسینی: د. صباح بەرزنجی |
| ٤٢ | پوختەیەك دەربارەی ڕاگەیاندن و ڕاگەیاندنی ئیسلامیی | ن: ئەحمەد ئیبراهیم وەرتی |
| ٤٣ | دەروازەیەك بۆ زانستەکانی قورئان | ن: ئیکرام کەریم |
| ٤٤ | بیرەوەرییەکان دەبنە گرنگ، دیمانەی مامۆستای دێرین ئەحمەد سەعید | ئا: ئەحمەد حسین ئەحمەد |

| ٤٥ | گەنجینەکانی دوورگەی بیناسازان | ن: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبوسلێمان<br>و: بوشرا صديق عەبدولعەزیز |
| --- | --- | --- |
| ٤٦ | فڕی فڕی قەل فڕی | نووسینی: مەلا موحەممەدی جەلی کۆیی (مەلای گەورە)<br>قانع خورشید پێشەکی بۆ نووسیوەو ڕێکیخستووەتەوەو پەراوێزی بۆ داناوە |
| ٤٧ | کـۆچ<br>کۆمەڵە چیرۆکێکی واقیعیی کۆمەڵایەتییە | نووسینی:یوسف حاج ئەحمەد<br>وەرگێڕانی: کاوە محەمەد شارباژێڕی |
| ٤٨ | پەروەردەی منداڵان لە ئیسلام دا | نووسینی:<br>د. عەبدوڵڵا ناصح عەلوان<br>وەرگێڕانی:ناصح ئیبراهیم سازانی |
| ٤٩ | ئیمام حەسەن بەننا<br>١٩٠٦ – ١٩٤٩ | نووسینی: مصطفى محمد الطحان<br>وەرگێڕانی:محمد عبدول رحیم |
| ٥٠ | مێژووی کوردەکانی جەزیرە ٤٤٧–٦٥٦ ك | نووسینی: ئومێد بەهرامی نیا<br>وەرگێڕانی: عبدالرحيم معرفتي |
| ٥١ | ئایا خوا کچی هەیە ؟<br>وەڵامێك بۆ کتێبی (کچانی خوا) | نووسینی: ڕوقیە صدیق عبدالعزیز |
| ٥٢ | گەشتی قیامەت | نووسینی: ناصح ئیبراهیم سازانی |
| ٥٣ | بیری ئوسوولیی ئیسلامی (لەنێوان خوێندنەوەو نەخوێندەواریدا | فاضل قەرەداغی |
| ٥٤ | دەروازەیەك لەمەڕ کێشەی ڕۆچوون<br>هۆکار.. کاریگەرێتی .. چارەسەر | ئامادەکردنی : یاسین ئەحمەد زەنگەنە |

| ٥٥ | ئاین لە فیکری مەسعود محەمەد دا | نووسینی: عومەر عەلی غفور |
|---|---|---|
| ٥٦ | ئیسلام لە نێوان نەزانی عالمەکانی و بێ توانایی نەوەکانی | نووسینی: جەمال حەبیبوڵا |
| ٥٧ | تاك و حكومەت لە شەریعەتی ئیسلامدا | نووسینی:<br>دکتور عبدالكريم زيدان<br>وەرگێڕانی لە فارسییەوە:<br>هێمن رێنوار |
| ٥٨ | جوگرافیای ئاو و هەوا | نووسینی: د.عەلی ئەحمەد غانم<br>وەرگێڕانی : گۆران ڕەشید ئیمامی |
| ٥٩ | کۆزارا | نووسینی:<br>حمە ڕەشید نادر هەورامی |